٧٥
ئایاری/ ١٩٨٩ سالی حەوتەم

# کاروان

گۆڤارێکی رۆشنبیری مانگانەیە نەمینداریتی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان بە زمانی کوردی و عەرەبی دەری دەدا



خوالێ خۆشبوو «عدنان خیرالله» پاڵەوانێکی کەم وێنەو شەهیدێکی هەمیشە زیندوو



# کاروان

گۆڤارێکی رۆشنبیریی مانگانەیە ئەمینداریتیی گشتیی رۆشنبیریو لاوان بە زمانی کوردیو عەرەبی دەری دەکا

لەم ژمارەیەدا




سەرنووسەر

محمد أمین محمد احمد

جێگری سەرنووسەر

حسین رشوانی

٧٥

ئایاری / ١٩٨٩

ساڵی حەوتەم

ئەدرەس

هەولێر: ئەمینداریتی گشتیی رۆشنبیریو لاوان

چاپخانەی رۆشنبیری

گۆڤاری کاروان

ت: ٢٢٦٥٨

لە نامەخانەی کتێب و بەڵگەنامەکان لە بەغدا ژمارە ٤٨٣ ی ساڵی ١٩٨٢ ی دراوەتێ

لە چاپخانەی دار الحریة لە بەغدا چاپکراوە

نرخی « ٥٠٠ » فلسه

خزمەتکوزارانی
کورد

# شاعیری میللی

# حەبیب عەلی مەنمی میرانی



● اسماعیل تەنیا ●

ئەم شاعیرە یەکێکە لە شاعیرە میللی‌یەکانمان کە کەم و زۆر ئاوڕی لێ نەدراوەتەوە، نەوەی ئەمڕۆ ئاشنایەتیان لە گەڵ دا نی‌یە بۆیە بە پێویستمان زانی یادێکی ئەم کەڵە مێردە بکەینەوەو زێتر بە خوێنەران و شیعر دۆستانی بناسێنین.

## کورتەی ژیانی

ناوی «حەبیب عەلی محەمەد ئەمینی حەمەی میران»ە لە عەشیرەتی «مەنمی»یە لە ساڵی «١٩٠٠»ی زاینی لە کوردستانی ئەودیو، لە دێی «سیاسەرا» کە هەوارگەو شوێنی باپیرانی بووە چاوی ژیانی هەڵهێناوە. خۆی لە شیعرێك باسی لە دایك بوونی خۆی دەکات و دەڵێ:

**لە دایك بوونم دێی «سیاسەرا»نە**
**هەوارگای کۆنی هۆزی «میران»ە**
**لە مێژووی ساڵی هەزارو نۆسەد**
**هاتمە دنیا لە گەڵ بەختی بەد**
**هەزارو سێ سەد نۆزدە لە هیجرەت**
**داخل دنیا بووم بۆ سەزاو مەینەت.**

(کۆمەڵە شیعری هونەرو ژیان، ل ٥)

باوکی شاعیر «مەلا» بووە بۆیە لە لای باوکی دەست دەکاتە خوێندن و قورئان و کتێبە ئاینی‌یەکان دەخوێنێ‌و هەر بەم نیازەش زۆربەی ناوچەکانی کوردستان دەگەڕێ. شارەزاییەکی کەمیشی لە زمانی فارسی بووە. لە پاش هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی و تەشەنە کردنی بێ کاری‌و قات و قڕی‌و گرانی‌و پڕیشکی شەڕ بەرەو کوردستانی عیراق دەکەوێتە ڕێ‌و لەم دیوە دەگیرسێتەوە. لە تەمەنی بیست «٢٠» ساڵی‌یەوە واتە پاش ئاوارە بوونی خولیای شیعر نووسینی دەکەوێتە سەر. کە دێتە ئەم دیوە بۆ بژێوی خێزانەکەی دەبێتە پۆلیس، پاشان خانەنشین دەکرێ و لە هەولێر دوکانێك دادەنێت. لە ناو خەڵکی بە خاڵە حەبیب ناسراوە. لە گڕو گڵپەو تاو سەندنی شۆڕشەکەی شێخ مەحمودی نەمر وەك هەموو ڕووناکبیرێکی ئەو سەردەم ئەویش دەچێتە دیداری شێخ و (شێخ ئەڵێ : بۆچی لای من نامێنیتەوە بتکەمە کوێخای ئەم گوندە، خاڵە حەبیب ئەڵێ : یا شێخ من فێری گەڕۆکی بووم و فێری نانی خووساو نەبوومە ئیتر ماوەیەك بە خۆشی‌وشادی ئەمێنێتەوە پاشان بەجێی دێڵێ.)[1] پاش کۆتایی هاتنی شەڕی جیهانی‌و دامەزراندنی کۆماری مەهاباد خاڵە حەبیب دەچێتە سەردانی ئەم کۆمارە ساوایەو بە شیعرە بەسۆزو بێ گرێیەکانی پشتگیری‌و پیرۆزبایی لێ ئەکات (بە دیداری قازی نەمر شاد ئەبێ‌و کۆماری کوردستان ئەبینێ)[2].

لە ماوەی ژیانیدا سەرەڕای دەست کورتی‌و نەداری

توانیوویەتی هەشت (٨) کتێبی هەمە جۆر چاپ بکات کە زۆربەیان دیوانە شیعرن. نووسەری فۆلکلۆر پەروەری نەمر «محەمەد تۆفیق وردی» ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە ئامادە کردن و چاپکردنی دیوانە شیعرەکانی خاڵە حەبیب، هەر بۆیەش لە زۆربەی بەرهەمەکانی سوپاسی کردووە. شێوەی دارشتنی شیعرەکانی زۆر سادەو ڕەوانەو بە زمانی خەڵکی ئاسایی نووسراوە، کە ئەمەش خاسیەتێکی گرنگی شیعری میللیە. هەموو خوێندەوارو کۆمەڵانی خەڵك بە بێ مێشك گوشین تێی دەگات. لە بارەی شاعیریەتی خاڵە حەبیب ووردی دەڵێ: (هەستێکی بەرزو خەیاڵێکی پوخت و باڵای هەیە. گەرچی پلەی خوێندەواری زۆر نیە بەلام لە باری زانست و هونەرو هەڵبەستەوە گەلێ لەو بوێژانە پێش کەوتوو ترە کە لاف بوێژی لێ ئەدەن..)[٢]. زۆربەی شیعرەکانی نیشتمانیو پەند ئامێزەو خەڵکی فێرە عیبرەت دەکات، شیعری دڵداریو عەشقیشی نووسیوە ووردی گوتەنی: (خاڵە حەبیب تەنیا دەستی لە هەڵبەستی نیشتمانیو خۆرسك و پەند نیە بەڵکە دەستێکی بەرزی لە هەڵبەستی دڵداریش هەیە چونکە ئەو دەوری چێشتووە.)[٤]گرنگترین خاسیەتەکانی شیعری ئەم شاعیرە میللیە ئەوەیە کە:

١- شێوەی دارشتنی سادەو ڕەوانە، هەموو خەڵکی بە تایبەتی چینە ڕەش و ڕووتەکە بە ئاسانی تێی دەگات.

٢- زۆربەی شیعرەکانی پەند ئامێزەو دەتوانرێت لە کاروباری ڕۆژانەدا بکرێتە سەر مەشقی ژیان.

٣- زۆر بەسەر هاتی مێژوویی بایەخداری بە شیعر هۆنیووەتەوە.

٤- گرنگی بە زانست و زانیاریو ڕوو کردنە خوێندن داوە، ئەمەش لە زۆربەی کۆمەڵە شیعرەکانی ڕەنگی داوەتەوە.

٥- هیچ کاتێك بێ هیوا نەبووە، بەڵکو هەردەم بە هیوا ژیاوەو ژیانی هەژاری پەسەند کردووە.

خاڵە حەبیب یەکەم کۆمەڵە شیعری بە ناوی (بانگی جومهوری) لە ساڵی (١٩٥٨) چاپکردووە. بایەخیشی بە شانۆ داوە، ڕووداوێکی ڕاستەقینەی کۆمەڵایەتی کردووە بە شیعرو لەسەر شێوەی ئۆپەرێت نوسیویەتی کە بۆ ئەو سەردەم و رادەی خوێندەواری ئەو شتێکی گرنگ و بە بەها بووە. ئەم ئۆپەریتە «پرشنگی دڵداری» باسی کچێك و کوڕێك دەکات کە یەکتریان خۆش دەوێت و لە ئاکامدا «بەکرۆکە»یەکی مەرگەوەریان بۆ پەیدا دەبێت و کوڕەی «دڵدار» دەکوژێت و کچەی «دلبەر»یش پاش دیتنی ئەم ڕووداوە جەرگ برە لە پێناو ئەمەك و وەفاداری ئەویش لە سەر گۆڕی «دڵدار» هەڵدەکێشێتە خەنجەرو سینەی خۆی دەسمێو گیانی شیرینی لە دەست دەدات. پاش ئەم تراژیدیە خەمناکە «دلبەر»یش لە تەنیشت «دڵدار» دەنێژن و بە خاکی دەسپێرن. خاڵە حەبیب لە شیعرەکانیدا بایەخی بە ڕەوشت بەرزی و ئامۆژگاری کردنی خەڵك و زانست و خوێندن و کارکردن داوە لە هەمان کاتدا ڕەخنەی لە چەند داب و نەریتێکی مۆن و ئەرژەنگی واقیعی کۆمەڵایەتی وەك (بوختان، درۆ، دزی، پوول پەرستی، نەزانی، عەرەق، خواردن، فەساد، نەخوێندەواری، ...... تاد) گرتووەو ڕێگا چارەی بۆ دۆزیووەتەوە. هەوڵی داوە مێژووی ڕووناکبیرو ناودارانی کورد بنووسێتەوە، کتێبێکی لە سەر ئەم بابەتە چاپکردووە کە بریتیە لە مێژووی ژیانی (١١٩) شاعیرو مێژوو نووس و تێکۆشەری کورد، هەر چەندە ئەم کتێبە بە تێرو تەسەلی نەنووسراوەو کەم و کوڕی زۆرە بەلام دەتوانرێت ببێتە فەرهەنگێکی باشی ئەدیب و ناودارانی کورد. سەرەرای ئەوەی کە بۆ زۆربەی ئەم هەڵکەوتووانە شیعری نووسیووەو یادی کردوونەتەوە. هەر لەم کتێبەو لە یادی چوار ئەفسەری سەرکردە کە لە «١٩»ی حوزەیرانی «١٩٤٧» و لە سەردەمی «ساڵح جەبر» لە سێدارە دران و چوونەوە باوەشی دڵە پڕ میهرەکەی دایکی نیشتمان.

**من چوار سەرکردەم لە قەنارە دی**
**سەرداری سوپام لە سێدارە دی**
**موستەفا خۆشناو خیراللە و عیزەت**
**بوون بە قوربانی وەتەن و میللەت**

تا دەڵێ:

**موحەمەد قودسی نیشتمان پەروەر**
**ڕۆڵەی نەبەزی پڕ هێزو هونەر**
**بوون بە قوربانی خاکی نیشتمان**

لەرێی خەبات بوون بە دڵ و بەگیان.
(یادی شەهیدان و ئەدیبان، ل ٢٢ ـ ٢٣)

رووداوێکی مێژوویی بە شیعر نووسیووەو سەرچاوەیەکی باشە بۆ مێژوو نووسانی کورد. ئەم کتێبەی ناوناوە«گۆمی خوێن»، باسی خەباتی عەشیرەتی «مەنمی» دەکات دژی دام و دەزگای کۆنەپەرستی حکومەتی شاهەنشاهی ئێرانیو ئەو شەرو پێکدادانە خوێناویانە دەخاتە رووکە لە ساڵی «١٩١٦» لەنێوان چەکدارانی ئەم هۆزەو حکومەتی ئێران روویداوە. هەروەك لەمەو پێش ووتمان خاڵە حەبیب دەرکی بە گرنگی زانست کردووە بۆیە زۆر بە جورئەتانە باسی چوونە سەر مانگ و داهێنانە نوێیەکانی زانست دەکات و کور گەل و کیژۆڵە قشتیلەکانی کوردستان هان دەدات کە روو لە خوێندەواری بکەن و خۆیان لە ریزەکانی پۆلی قوتابخانەکان بدۆزنەوە، چونکە دەزانێت ئەگەر میللەت نەخوێندەوار بێت لەوانەیە رێگای هەڵە بگرێتە بەرو لە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی میللەت بچێتە دەر.

**عیلم و زانینە لەم ئاسمانە**
**وا خەڵك ئەگەرێ وەکو پەروانە**
**زانستی تەنیا بۆ رێی پێش کەوتن**
**رزگارت ئەکا لە شەری دوژمن**
**ئەگەر نەخوێنی تۆ دەرس لە مەکتەب**
**فێر نەبی رێگەی رەوشت و ئەدەب**
**پەشیمان دەبی بە دڵ خەمباری**
**دەبێ رازی بی بە خزمەت کاری.**
(هونەرو ژیان، ل ١٠).

خاڵە حەبیب زۆر لێزانانە چینەکانی کۆمەڵگا دابەش دەکات و باسی رۆڵی پر سەروەری چینی کرێکارو جووتیار دەکات، چونکە کۆڵەگەی ئابووری هەر وولاتێك بەندە لە سەر هەوڵ و تەکان دانی ئەم چینە زەحمەتکێشەو هەر ژیان و نەهامەتیەك روو بکاتە وولات پێش هەموو کەسێك ئەمانە دەگرێتەوە. هەروەها باسی دامەزراوە ئابوورییەکان دەکات و کاریگەری مێژوویی کرێکارو جووتیار دەست نیشان دەکات.

**ژیانی هەموو مەخلوقی جیهان**
**وا لە سەر شانی جووتیارو سەپان**
**بە رەنجی شانی سەپان و جووتیار**
**هاتۆتە بەرهەم کاغەزو دینار**
**جووتیار نەکێشێ جەفای رۆژگار**
**چۆن پەمو دانە دەبێتە دینار؟**
**سەپان نەکێشێ جەفاو دەردی سەر**
**نە دەغڵ شینە، نە دار دێتە بەر**
**سەپان نەچێنە ناو قورو چڵپاو**
**چۆن برنج دەبێ بیکەی بە پلاو.**

لە بارەی ئافرەتەوە بە بیرێکی پێش کەوتن خوازانەوە دێتە کۆری ژیان و هەست بە گرنگی بوونی ئەوان دەکات لە بوارەکانی کار کردن و بەرهەم هێنان و رامیاریو... تاد. چونکە دەزانێت ئەگەر بێت و بەس تەنها «پیاو» کار بکات ئەوا تەنها باڵێکەو بە یەك باڵیش ناگاتە چ هەوارێك. بۆیە پێویستی بە کۆمەکی ئافرەتی دایك و خوشك و هاوسەر هەیە بۆ رەها بوونی کارەکانیو بنیات نانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی.

ژن هەیە لایەق تاج و ئەفسەرە
بۆ رێگەی راستی رێی نیشاندەرە.
(هونەرو ژیان، ل ٢٠)

یان لە وەسفی (کچی کوردستان)موە دەڵێ:

**مانگی رووەمەتی کچی کوردستان**
**رووناکی ئەدا بە دەشت و کێوان**
**سەربەست و ئازاد چوست و چالاکن**
**بۆ رۆژی خەبات شێری بێ باکن.**
(پرشنگی دڵداری، ل٢٢).

خاڵە حەبیب لە بارەی مەدحی یارەوە بە شێوەیەکی جوان باسی شۆخ و شەنگی دلبەرەکەی دەکات و هەروەك شاعیرانی پێش خۆی چۆن زیرەکانە ئەندامەکانی لەشی یاریان بە گوڵ و رەیحان و چنارو... تاد چواندووە ئەویش لە سەر هەمان رێباز دەرواو دەڵێ:ـ

ئەی گوڵ سێو سووری نەبوو ئەوەڵ جار
تا یاری منی نەدی لە گوڵزار
کرنووشی بۆ برد گەڵێ تکای کرد
تۆزێ سووری سەر گۆنای یاری برد.
(پرشنگی دڵداری، ل١٧).

تا دەڵێ:

چاوی یاری من بێ ـورمە رەشە
گوڵی روومەتی هەموو ـات گەشە
گەلاوێژ لە بەر چاوی ئەو ـمەڵات
لە بزەی لێوی شەوقی رۆژ دە ـلات.
(پرشنگی دڵداری، ل١٧).

لە بارەی چاکـەو رەوشت بەرزیەوە کە مرۆ بە هۆی پەیرەو کردنی ئەم رەوشتە بەرزانەوە جێ پێی خۆی لە ناو کۆمەڵگاو جەماوەردا قایم دەکات و دەبێتە خۆشەویستی خەڵکی، خاڵە حەبیب باسی پارەو سامان کورسیو دەسەڵات داریەتیمان بۆ دەکات کە ئەوانە بەبێ سەرمایەی رەوشت و نەفەس بەرزیەوە هیچ نرخێکی نیە. هەر چاکەیە مرۆ دەگەیەنێتە لووتکەی بەرز بوونەوەی کەسایەتی.

سامان و کورسی بۆ کەس نامێنێ
چاکەو ئینسانی بەجێ ئەمێنێ
ئەگەر راست ئەکەی مەردی دڵپاکی
بیکە بە عادەت رەوشتی چاکی.
(هونەرو ژیان، ل١٧).

شاعیر لە حەفتاکاندا ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد بووە. خاڵە حەبیب مەرگ مەودای نادا زێتر خزمەتی گەل و نەتەوەکەی بکـات، تا لە رۆژی (٢٥ـ٥ـ١٩٨٤) بۆ دواجار دڵە پڕ میهرو عەشقە گەلەکەی لە لێدان دەکەوێت و لە گۆرستانی سەر رێگای هەولێرو مەخمور بە خاکی دەسپێرن. خاڵە حەبیب هیچ منداڵی نەبـووە، بەڵام لە سایـەی ئەم سامـانە ئەدەبیەو ئەو رەوشتە بەرزەی وەجاغی روونەو هەموو میللەت وەجاغی ئەون و ئەویش هەر لەم خاکە بووەو هەر بۆ باوەشی ئەویش گەڕایەوە.

زۆر دەستنوس و بەرهەمی چاپ نەکراوی هەیە هیوا خوازین شارەزایان هەوڵی پاراستن و چاپکردنیان بدەن.

بەڵام بەرهـەمـە چاپکـراوەکانی کە هەمووی بە سەر یەکەوە نزیکەی (٤٦٧) لاپەرەیە، بریتیە لە هەشت (٨) چاپکراوی[٥] هەمە جۆر کە ئەمانەن:

١ـ بانگی جومهوری، شیعر، ١٩٥٨.
٢ـ پرشنگی دڵداری، شیعر، ١٩٧٢.
٣ـ داخی دەروون، شیعر، ١٩٧٨.
٤ـ قارەمانی کورد، شیعر، ١٩٧١.
٥ـ گوڵی ژاکاوی کوردستان، شیعر، ١٩٦٩.
٦ـ گیمی خوێن، بەسەر هاتی هۆزی (مەنمی)یە بە شیعر، ١٩٧٤.
٧ـ نەورۆزوبەهار، شیعر، ١٩٧٠.
٨ـ یادی شەهیـدان و ئەدیبـان، بەسەرهات ومێژووی ژیانی چەند ناودارێکی کوردە، ١٩٧٤.

لە پاش مردنیـەوە تاکو ئێستا بێجگە لە ووتارێکی بچکۆلەـ ئەوەی من ئاگـادار بم ـ بەداخـەوە کەسێك نەهاتووە بە تێرو تەسەلی لە سەر ئەم شاعیرە میللیە بنووسێو لایەن و سووچە تاریکەکانی ژیانی بخاتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. هیوادارین ئەمە بەرکوڵێك بێت و نووسەرانی شارەزا زێتر بە بەریدا بچن.

**پەراوێزەکان**

١ـ رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە (٩٨٠)، ل[٧]، یادی شاعیری خوا لێخۆشبوو حەبیب عەلی مەنمی میرانی، لەتیف محەمەد عەلی.
٢ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٣ـ هونەرو ژیان، بەغدا، ١٩٦٨، ل[٨].
٤ـ پرشنگی دڵداری، بەغدا، ١٩٧٢، ل[٩].
٥ـ فەرهـەنگی ئەدیب و نووسەرانی کورد، مستەفا نەریمان، بەغدا، ١٩٨٦، ل[٤٠ـ٤١].

★ ★ ★

# کاموران عالی بەدرخان و رۆژناما رۆژا نوو[1]



بەرهەڤکرنا (عبد السلام علي میرزا)

چەند گۆتن لسەر رۆژا نوو ..

رۆژا نوو رۆژنامەك حەفتەیی بوو ، کو دنابەینا سالێن ١٩٤٣
١٩٤٦ – ئان دە ل بێرووتێ هاتیە وەشاندن خۆدی‌و بەرپرسیارێ رۆژنامێ
رۆژنامەگێر ، نڤیسکارو زمان زانێ ب‌ناڤ‌و دەنگ ئێ کورد د. کامووران
عالی بەدرخان بوو . جێی چاپا رۆژنامێ ، وەك کو ل سەر هەر هەژمارێ
هاتیە نڤیساندن (بێرووت برج : وەقف ثابت) بوو . رۆژنامە ب تەڤایی ٧٣
هەژمار دەرچوونەو چاپا هەژمارا یەکەم ٣ ێ گولانا ١٩٤٣ ، یاداوی
٢٧ ێ گولانا ١٩٤٦ ئایە ، ئەبعادە ئۆرژنالا وێ ٣٠ × ٤٦ سمیە .
هەموو هەژمارێن وێ ٤ (هەژمارا - ٦٨ ، ٢ر٠) رووپەلن .
وەك مە ل ژۆرژی گۆت ، رۆژا نوو رۆژنامەك حەفتەیی بوویێ ئەڤ یەك
هەتا هەژمارا داویێ لە سەر هەڤ نەمەشیایە .ژ هەژمارا ١ ێ هەتا
هەژمارا ١٢ ئال پەی هەڤ ، هەر دوشەمیێ دەرکەتی‌یە . هەژمارا
١٢و١٣ ب هەڤ‌رە چاپ بوونە . هەژمارا ١٤ ئپانزدەرۆژ پشتی وان
دەرچوویە ژ هەژمارا ١٤ هەتا ٢٣ دیسا هەر حەفتی لپەی هەڤ رۆژێن
دوشەمبایێ هەژمار ٢٤ پانزدە رۆژا پشتی هەژمارا بەرێ دەرکەتیە . دیەی‌رە
هەژمارێن ٣٠ ، ٣١ ، ٣٥ ، ٣٨ ، ٤٠ ، ٤٥ ، ٤٦ پانزدە رۆژ پشتی
هەژمارێن بەرێ دەکەتنە .ژ هەژمارا ٤٩ ئپێڤە د پانزدە رۆژاندە دو
هەژمار دەرکەتنە لێ هەژمارەك ب کوردی‌و یەك ب فرانسزی . جرن
هەژمارێن فرانسزی‌و کوردی لپەی هەڤ . لێ جرن ژی هەردوو ب
هەڤ‌رە دیەك رۆژدە چاپ بوونە دڤی ئەم بلا خوەندەڤانن بکشینن
سەرقێ یەکێ ژی کو د ئڤەیت هەژمار ٤٨ ئو هەژمار ٤٩ ئدە

راستەراست سالەکو دومەهزەمان دەرباس بوویە . هەژمارا ٤٨ – ئا
د١٥ –ێ گولانا ١٩٤٤ – ئاندەو یا ٤٩ – ئان د ١٦ –ێ تیرمەها ١٩٤٥
ئان دەژ چاپێ دەرکەتیە .

رۆژا نوو ب کوردیو فرانسزیدەرکەت . هەتا هەژمارا ٤٩ –ئاند هەر
هەژمارێ دە ٣ رووپەل ب کوردیو رووپەلەك ب فرانسزی یە . لێ هەژمار
٤٩و پیڤە هەژمارەك ب فرانسزیو یەك ب کوردی دەرکەتیە . هەژمارە
داوی (٧٢ –٧٣) ب هەڤرە ٤ رووپەل دەرکەتیە ، دو رووپەلێن وی
بەکوردی ودو رووپەل ژی ب فرانسزینە . لسەر بەشی کوردی هاتیە
نڤیساندن (هەژمار ٧٢)ول سەرێ فرانسزی (هەژمار ٧٣) .

رۆژا نوو . رۆژنامەك حەفتەیییا سیاسی بوو . لێ گاڤا ئەم ل ناڤەرۆکا وی
دنێرن . ئەم دبین جیی کو دایە وارێ ئەدەبیو فۆلکلۆری ژی پێ نووچەو
گۆتارێن سیاسی نەکێمترە . لۆما ژ د ئەسلێ خوەدە رۆژنامەك سیاسی
وچاندەیی . وەك کۆڤارێن هاوارو رۆناهیێ . رۆژا نوو ژبەر کو ددەما
گەرماهیا شەرێ جیهانێ یێ دودویادە هاتیە وەشاندن ، گرانیا نووچەو
گۆتارێن وێ لسەر شەرێ ئاڤبەرا جەبها دەموکراسیێ دەگرتیەو ل دژی
فاشزمێ راوەستایە ، دوازێ نووچەو گۆتارێن سیاسی یێن رۆژانەدە ،
باوەریا مە ئەوە ، کو رۆژا نوو ژهاوارو رۆناهیێ ب روومەترە . درووپەلێن
خوەدە گەلەك چاران جیە دایە نووچەیێن ژیانو تەڤگەرا سیاسییا کوردێن
کوردستانا ئیراقێو ئیرانێ . لسەر وان هن دۆکومەنتێن هێژا چاپ کریە .
هەر وەکی مرۆڤ بەیانەك کۆمەلا خۆرتێن کوردستانا (ئیران) ب تەمامی
لسەر رووپەلێن رۆژا نوو دبینە . رۆژا نوو چەیێن لسەر کوردێن کوردستان
ئیرانێ کو د رۆژنامە یێن ئیرانیان دەدەرکەتنە . ب کورتە بەری ژی
درووپەلێن خوەدە وەشاندیە .

جاردن نووچەو گۆتارێن لسەر کوردا کوویێ دەمێ د چاپەمەنیا جیهانێ
(ب تایبەتی د رۆژنامێن ب زمانێ فرانسزی ، ئنگلیزی ، ئالمانی ، عەرەبیو
فارسی)دە دەرکەتنە ، رۆژانوو وان جڤاندیە ، یا ب تەڤایی یان ژی ب
کورتەبەری درووپەلێن خوەدە پێشبەری کوردا کریە . جارنا هن نووچەیێن
لسەر کوردێن لوبنانێو کوردستانا سوریێ ژی درۆژا نوودە جیە دگرن . هن
گۆتارێن سیاسی ، ب کوردی د رۆژنامیدە هاتنە چاپکرن ، کو دوازێ
رزگاربوونا نەتەوا کورد . ب دەسخستنا مافێن خوەیێن مللیو یەك بوونا
وەلاتێ کوردادە ، جاردن دوازێ ژیانا سیاسیو جڤاکییا کورداندە هەر
وەکی دەمەسەلا دەموکراسیێ ، ئاڤاکرنو گەراندنا دەولەتێدە بیرو
باوەرێن خوەدیو بەرپرسیارێ رۆژنامێ ب ئەشکەرەیی پێشبەری مرۆڤ
دکە . دبەشێ کوردیدە ، ژبلی نڤیسارێن کامووران عالی بەدرخان ، ئەم
راستی گۆتار ، هەلبەستو نڤیسارێن جەلادەت عالی بەدرخان ، ئۆسمان
سەبری ، جەگەرخوین ، حەسەن هشیار ، قەدری جان ، م ئەحمەدێ
نامیو هەڤکێن دیتر تێن ، گۆتارو نڤیسارێن دیرۆکی ل سەر دیرۆکا کوردو
کوردستانێ ئێن هن نڤیسارێن ئەورووپیو عەرەب ژی ب وەرگەرا کوردی
درۆژا نوودە جیە گرتنە .

رۆژا نووژ ئالی چاندەییو فۆلکلۆری دە ژی گەلەك دەولەمەندەو
خەزینەك هێژا ژ چاندو زمانێ کوردی رە هشتی یە . تەفسیرا قورئانێ .
پشتی هاوار درۆژا نوو دەهاتیە چاپکرن . قەدری جان رۆمانا (وەلاتێ
زەمبەڤێن گەور) ئافینی ، وەرگەراندیە کوردیو رۆژانوودە چاپ بوویە .

دبەشا فرانسزیدە ، تێ خویاکرن ، کو ئارمانج ناسکرنا رەوش ،
دیرۆکو داخوازێن کوردان ب بیانیانرا بوویە ، پرانیا رووپەلێن فرانسزی
لسەر نوچە ، گۆتارو نڤیسارێن دیرۆکی ، ل سەر داخوازێن کوردانە .
دبەشێ فرانسزی دە رۆژنامە ب ئەشکەرەیا ددە خویاکرن ، کو کوردستان
ب پەرچەبوونا خوە ، ب تێکلێن جڤاکی ، ئابۆریو سیاسی ڤە وەك
وەلاتەکی کۆلۆنییەو دڤێ ژڤێ رەوشێ دەرکەڤە . ئەو ژی وەك جیرانێن
خوە وەك وەلاتێن دن دژیانا هەڤچەرخ دە جیێ خوە بگرە .

دبەشا فرانسزی دە لسەر ئەدەبیاتو نڤیسکارێن ئەورووپی ، ژیانا
چاندەیی یا وان وەلاتان هن گۆتارێن کورت ژی هەنە . د . کامووران
بەدرخان سترانێن فۆلکلۆری یێن کوردی وەرگەراندیبەزمانێ فرانسزیو
درۆژا نوو دە چاپکریە .

ب کورتی ، رۆژناما رۆژا نوو هەم ب نووچەو گۆتارێن خوەیێن رۆژانە
یێن سیاسیو هەم ژی ب نڤیسارێن خوە یێن چاندەییو فۆلکلۆری
خەزینەك گەلەك هێژا ژ نەتەوا کورد رەهشتیە .

### ژیانا کامووران عالی بەدرخان

کامووران عالی بەدرخان د ٢١ – ێ تەباخا ١٨٩٥ – ئادە ل ئستەنبۆل
ژ دایکا خوە بوو . ژ مالباتا بەدرخانیانە ، کورێ ئەمین عالی بەدرخانە .
وەك تێ زانین ، باپیرێ کامووران عالی بەدرخان . بەدرخان بەگێ
میرێ جزیرا بۆتان ، ژ بۆ کوردستانەك سەربخوە ، د نابەرا سالێن
١٨٤٣ – ١٨٤٦ ئادە ل دژی ئمپاراتۆریا ئوسمانی سەریهلدا ، ئەڤ
سەری هلدان هات شکاندنو بەدرخان بەگ تەڤی مالباتا خوە ، د

١٨٤٧ – ئاده سرگوونی (نەفی) دۆرگەیا گریتێ (ل دەریا سپێ یاناڤەراست) بوو قاسی چاردە سال ل گریتێ ما ، داوێ وی شاندن سووریێ ول سالا ١٨٧٠ – ئاده ل شامێ چوو دلۆڤانیا خودێ مەزن وملکێ میرانیا وی ژێ ستاندن تەڤی ئەردێن ئمپاراتۆریا ئۆسمانی کرن پشتی کو سولتان عەبدولحەمیدێ دویێ ل سالا ١٨٧٦ ئان هات سەر حوکمی ، سرگوونا مالا بەردخان بەگ رابوو ، لێ عەبدولحەمید نەهشت ئەو ڤەگەرن وەلاتێ خوە ئانی وان ل ئستەنبۆل ، دبن لەپێ خوەدە ب جیە کر گاڤا کامووران عالی بەدرخان هات دنێ ، مالبات ل ئستەنبۆل جیوار کری بوو .

کامووران عالی بەدرخان ، خوەندنا خوەیا ئەول ل ئستەنبۆل خەلاس کر د ١٩١٢ – ئان دە گاڤا شەرێ بالقان دەرکەت ، د ١٧ سالیا خوەدە ب دل خوازیا خوە ، خوە نڤیساند لەشکەریێ وژبۆ (دۆزا ئیسلامێ) چوو شەرێ بالقان . لی سیاسەتا نەتەوایی‌یا شۆڤەنی یا ئیتحادو تەرەقی وەك هەموو ئەندامێن نەتەوێن بندەست تەئسیرەك مەزن ل وی ژی کر . ئەوی ژی باش تێ‌گەهیشت کو (دۆزا ئیسلامێ) ، ویەکیتیا مللەتێن موسلمانو براتیا وان دبن نێری ئمپاراتۆریێ پەیڤەك ڤالایە . مالباتا کو ژێ هاتی خەباتا وان ژبۆ ب دەستخستنا مافێن مللەتێ کورد هێ ژ بچووکاتی دە تەئسیر ل کامووران بەدرخان کربوو کو ب هەست هشیاری ورامانێن نەتەوایەتی بگهێ . سیاسەتا نەتەوە پەرستیا ترك ئا ئتحادو تەرەقی‌و دەرکەتنا شەرێ جیهانێ یێ‌یەکەم د سالا ١٩١٤ ، بوویەرێن شەر ب تەمامی رێ ل بەر ڤەکر کو ب هەر ئاوایی خوەبدە دۆزا خەلاسی‌و ب دەستخستنا مافێن نەتەوایەتی یێن مللەتێ کورد .

پشتێ شەر ، ئمپاراتۆریا ئۆسمانی تەسلیم بوو ، موتارەکا کو بسەرکەتنا هەڤالبەندان (ئنگلیز ، فرانسز ، ئیتالی ئامریکا) ئعلان دکر ، هات ئمزا کرن . هەڤالبەندان گەلەك عەردێن بن‌دەستێ ئمپاراتۆریا ئۆسمانی داگیر کربوون ، باشووری کوردستانێ سەرانسەر ، هنەك بەشێن نیڤ گراڤا ئانادۆلێ ، بەشەك ژ تراکیا ژی کەتبوو بن دەستێ وان . پشتی موتارەکێ هەڤالبەندان دەست دانی سەر پایتەختا ئمپاراتۆریێ ئستەنبۆل ژی .

بەرێ خەلاسیا شەر ، سەرۆك جمهووریێ ئامریکا ولسۆن ل سەر شەرتێن داوی لێ‌ئانینا شەر هنەك پرەنسیب پێشکێش کربوون ، دخەلاسیا شەر دەچ وەلاتێن بسەرکەتی وچ ژی یێن تێکچوویی ، هەمیان ژی ئاشکەرا دکرن کوب جیهاتنا ڤان پرەنسیبا قەبوول دکن . ژ خوە شەر ، د ئەساسێ خوەدە ، سەر قەبوولکرنا ب جیە ئانینا ڤان پرەنسیبان ژ بال هەموو وەلاتێن شەرپێش داوی لێ هاتبوو .

یەك ژ پرەنسیبێن و لسۆن ژی ئەو بوو ، کو پشتی شەر مللەتێن بن‌دەست ئێن ئمپاراتۆریا ئۆسمانی قەدەرا خوە ب دەستێن خوە تەعیین بکن‌و وبگهێن هەموو مافێن خوە یێن نەتەوایی . ئەڤ پرەنسیب ژ بال مللەتێن بن‌دەستێ ئمپاراتۆریا ئۆسمانی ، کوردان ، ئەرمەنیان ، رۆمان ، عەرەبان‌و یێن دیتر ، ب کێفخوەشی‌یەك مەزن قەبول کرن . لۆما ژی تەڤگەرا ڤان مللەتان پشتی شەر ژ نوهڤە ئاکتیفیەك مەزن گرت خوە .

رزگاریخواز ، رۆناکبیرو کەسێن سیاسی یێن مللەتێ کورد ژی ل خوە وەرگلین‌و ب خوین گەرمی کەتن خەباتێ ب تایبەتی ل ئستەنبۆلێ کۆمەلە ، پارتی هاتن دامەزراندن‌و رۆژنامێن کوردان دەست ب وەشانێ کرن . دڤێ تەڤگەرێ . دەیێ جیەك بەرچاڤ گرت کۆمەلا بلندبوونا کورد[٢] (Teali Cemiyeti Kürti) و کۆڤارا ژین بوو گەلەك کەسێن ناڤدار ئێن تەڤگەرا نشتمانی‌یا کوردستان دڤێ کۆمەلێ دە جە گرتن‌و د وارێ سیاسی‌و دیپلۆماسی‌دە دۆزا ب دەستخستنا مافێن مللەتێ کورد کرن . گەلەك لقێن ڤێ کۆمەلێ ل کوردستانێ ژ هاتبوون دامەزراندن . مینا ، ئامەدێ (دیاربەکرێ) ، بدلیسێ ، خارپێتێ‌و دێرسمێ .

کامووران بەدرخان وان سالان هەرچی گەلەك خۆرت بوو (٢٤ – ٢٥ سال) ، ژی وەك ئەندامەکی پێشکەتی یێ بەرچاڤ دڤێ خەباتێ دەجێ خوە گرت . ئەم دبینن کو دوان رۆژان‌دە کامووران د کۆڤارا ژین‌و رۆژناما سەربەستی دە ب ناڤێ خوە گۆتاران چاپ دکە[٣] دۆز دکە کو مافێن مللەتێ کورد لگۆر پرەنسیبێن ولسۆن بێن داین .

دداویا سالا ١٩١٩ – ئادە ژبەر گەلەك سەدەمان ، دوبەندی دنابەینا ئەندامێن Kürt Teali Cemiyeti دە دەرکەت . سەدەمەك ئەساسی ئەو بوو ، کو ژ ئەندامێن کۆمەلێ هنەکان دۆزا سەرخوەبوونا کوردستانێ دکرن‌و هنەك ژی ل دژی بوون کو کوردستان ڤەقەتە ، وان دخوەست د چارچوڤا ئمپاراتۆریێ دەئۆتۆنۆمی ژ کوردا رەیێ داین ل سەر ڤێ دوبەندیێ

گەلەك ژ ئەندامێن کۆمەلێ یێن دۆزا سەرخوە بوونێ ڤەقەتیان وب ناڤێ ، (Teşkilat-I içtimaye Cemiyeti) کۆمەلا تەشکیلاتا ئجتماعي[٤] ، کۆمەلەك نوە ئاڤاکرن . پرانیا ڤان کەسان بەرپرسیارو نڤیسکارێن کۆڤارا «ژین» ێ بوون پشتی جودا بوونێ ژین ئێدێ نەوەك کۆڤارێ لێ وەك رۆژنامەك رۆژانەژ بال وانڤە هات وەشاندن ئیرۆ دهن چاڤکانیان دە هنەك ئاگاهداری ددەهەڤا رۆژناما ژین‌دە هەنە ل کۆر چاڤکانیەکی[٥] . ئەم تێدگهەن کو ب کیماسی ٣٢ هەژمار دەرکەتنە . لەورا ئەوا چاڤکانی ژ هەژمارا ٣٢ ئا یا رۆژناما (ژین)ێ تشتان پێشبەری مرۆڤ

دکە .

کاموران عالی بەدرخان ژی ژوان کەسان بوو کو دۆزا سەرخوەبوونا کوردستانێ دکرن .

ل سەر کارو بارێن کۆمەلا Cemiyeti Teşkilat - I içtmaiye و رۆژناما ژین ، پەیوەندیێن وان ب کوردستان رە هەتانها نەهاتیە رۆنیکرن . لێ هن بوویەر هەنە کو مرۆڤ دگهینن وێ قەناعەتێ کو ئەڤ کۆمەلەو رۆژناما ژین ب کوردستانێ پەیوەندی دانینە . تەئسیرا وان ل سەر تەڤگەرا کوردی ل وەلاتی چێبوویە ب تایبەتی ژی ل سەر کۆمەلێن هەرێما خارپێت و دێرسمێ . نوری دەرسمی[٦] دده خویا کرن کو ئەو وگەلەك خۆتێن کوردێن دێرسیمێ ژی ل هەمبەر تۆتۆنۆم خوازان رابوونەو وان ژی جیێ خوە ل با دۆز دارێن سەرخوەبوونێ گرتنە . جار دن عالی کەمال د پرتووکا خوە یا ب ناڤێ دیرۆکا ئەرزنجانێ[٧] دە دبێژە ، کو عەلی شێر کاتبێ حەیدەر بەگ ، ل کۆچگری . ل ناڤ عەشیران دگرا . رۆژناما «ژین»ێ و بەلاڤۆکێن ل سەر مەسەلا سەرخوەبوونا کوردستانێ دناڤ خەلکیدە بەلاڤ دکر .

سەرۆك عەشیرێن هەرێما کۆچگری هەم د کۆمەلێن کوردی یێن وان هەرێمان دە جیە گرتبوون و هەم ژی پەیوەندیێن وان ب تەڤگەرا کوردی یا ل ئستەنبۆلرە هەبوو .

دداویا هاڤینا ١٩١٩ – ئان دە کاموران بەدرخان ، جەلادەت بەدرخان ، ئەکرەم جەمیل پاشا[٨] وهن کەسێن دن ، د ریا دەریا سپیرە پشتی هاتنە حەلەبێ داوێ بەرێ خوەدانە کوردستانێ . د ٣ – ێ ئیلۆنا ١٩١٩ – ئان دە گیهاشتن مەلەتیێ متەسەرفێ مەلەتێ خەلیل راحمی کو ئەو ژی بەدرخانی بوو پەرگی وان هات .

هەر د وێ دەمیدە مستەفا کەمال و هەڤالبەندێن وی ژی کۆنگرا سێواسێ دچڤاندن . مستەفا کەمال دریا فەرماندارێن هێزێن لەشکری یێن ئۆسمانی یێن د هەرێمێ دە ، رێ ل بەر وان گرت ، لەشکەر شاند سەروان ، کاموران و هەڤالێن خوە مەجبوور مان بەر ب ئادیەمان – کەختایێ ڤەکشیان ، هاتن نك بەدر ئاغا . کاموران بەدرخان و هەڤالێن خوە پشتی کو دئامانجا خوەدە ب سەر نەکەتن ، جاردن ڤەگەریان ئستەنبۆلێ .

د دیرۆکا کوردستانێ دەئەڤ مەسەلا هان ژی هەتا ئیرۆ رۆنی نەبوویە . مستەفا کەمال دنڤیسارێن خوەدا ئدعا دکە ، کو بەدرخانی ژ بالا ئنگلیزان و حوکوومەتا ئستەنبۆلڤە هاتن شاندن وێ هەرێمێ دا کو ئێرش بێن سەر وان و نەهێلن کۆنگرا سێواسێ بچڤە . تەڤگەرا وان پووچ ببە ، جاردن ئەو دبێژە ، کو سیخورێ ئنگلیزی بینباشی (مێجەر) نۆئەل (Noel) ژی ب وانرە بوو ول هەرێمێ ب نۆکەری حوکوومەتا ئستەنبۆلێ والیێ خارپووتێ عالی گالپ رە یەك بوون .

گاڤا مرۆڤ ل سەر ڤێ مەسەلێ هوور رادوەستە ئەرێ خویا دبە کو ئارمانجا بەدرخانیان یەك ژی ئەو بوو . کو نەهێلن مستەفا کەمال و هەڤالێن وی ل سێواسێ کۆنگرێ بچڤنن و د هەرێمێدە ل سەر ناڤێ کوردان کار بکن ودڤێ نقتێدە وان و والیێ خارپێتێ عالی گالپ هن کار ب هەڤرە کرنە لێ ڤێ یەکێ توجاری نارە خویا کرن کو ئەڤ کار ل سەر ناڤێ ئنگلیزان یان ل سەر حەسابێ حوکوومەتا ئستەنبۆلێ دهات کرن .

ژعەینی ئیدعایێن کەمالیستان ئێن بێ بنی و بەلگە . هەتا ئیرۆ بەلگە نینن . کو ئنگلیزان ب نۆئەلرە بەدرخانی شاندن ژ بۆ کارو بارێن کەمالیستان پۆچ بکن و نەهێلن کۆنگرا سێواسێ بچڤە . هەر چڤاس بەدرخانی و نۆئەل د دەمەکێ دە هاتبوون کوردستانێ لێ ب هەڤرە نەهاتبوون .

بەدرخانی ل حەلەبێ راستی نۆئەل هاتبوون ئارمانجەك رەسمی یا چوونیە نۆئەل هەبوو و ئەڤ راستە راست ب ئارمانجا بەدرخانیان ڤە نەگرێدایی بوو . نۆئەل ل سەر ناڤێ کۆنفرانسا ئاشتیێ یا پاریسێ رەسمی هاتبوو شاندن کو ژ بۆ حازریا کۆنفرانسا پاریسێ راپۆرتەکێ ل سەر دەموگرافیا رۆژهلاتێ ئانادۆلێ حازر بکە[٩] . ئانکو ل وێ هەرێمێ نفووسا ترکا ، کوردا ، و ئەرمەنیان تەسبیت بکە ڤ کاری ژی نە ب دزی لی ب ریەك رەسمی و ئەشکەرە دە دکر لێ ژبەر کو کارێ وی چاڤێ کەمالیستان د ترساندن و ل حەسابێ وان نەدهات . رێ ل بەر گرتن . وی ب هن کارێن «نەقانونی» ڤەگرەداندا کو ل هەرێمێ نەگەرەو پاشدە ڤەگەرە .

نۆئەل و بەدرخانی هەتا مەلەتیێ ب هەڤرە چوو بوون . لێ ل گۆر ب . نیگیتین[١٠] دبێژە ، دده ما تێکچوونا ئۆسمانیان دارەئیسێن کوردان . د١٩١٩ – ئاندا ل کەختایا نێزی مەلەتیێ خوەستن تەڤگەرەکێ دژی کەمالیستان راکن . شەڤ سەرڤیسا ئستخباراتا ئنگلیزی یێ ل حەلەبێ ئالبای بەل (Albay Bell) ، هات ورل سەر ناڤێ حوکوومەتا خوە ژوان خوەست کو دەڤ ژ کاری بەردن و ل سەر ناڤێ هەڤالبەندان وەعد ددا کوردان کو دکۆنفرانسیدە دێ داخوازێن مللی یێن کوردان ل بەر چاڤ بێن گرتن .

د ١٢ –ێ ئیلۆنا ١٩١٩ – ئان دە موعتەمەدێ سیاسیێ بلند ئێ

ئنگليزی ئالبای . پ . پەل «Albay p. peel» هات مەلەتيێ ژ فەرماندارێن لەشكەری يێن ترکەرە داخويا کرن . کو وەزيفەك نۆئەل ئا تەڤلهەڤيێ چێکرن نينە . هايا وی ژ تشتەکی وها تونەو گەر تشتەکی وهاهەبە ویێ نۆئەل دەردەست بکە بشينە حەلەبێ[11] .

قاسی کو ژ لێکۆلينێ مرۆڤ تێ دگهێژە نۆئەل ددەما گەرا خوەدە سەمپانيا خوە ژ کوردا رە ددە نيشاندان . لێ وەك هنەك ديرۆکناس ژی دبێژن ئەڤ نە نەتيجا سياسەتا حوکوومەتا ئنگليز . لێ ژيا رامانێن وی يێن شەخسی بوون . لەورا ویێ دەمێ . پشتی کو لرووسيا ئۆرديا دانکن و کۆلچاك ل هەمبەر ئۆرديا سۆر شکيانو ئنگليزان ديتن . کو نە حوکمەتا موسەوات ئا ئازەربەيجان . نەحوکوومەتا مەنشەويك ئا کورجستانو نەژی جکومەتا تاشناك ئا ئەرمەنيستان ویێ خوە نەگرنو نکاربوون ل هەمبەر بۆلشەويکان ببن بەندەك ، ژ بۆ وان وەلاتەك تەنێ مابوو کو «رێ ل بەر بۆلشەويزمێ بگرە» ئەو ژی ترکيا کەماليست بوو . لۆما ژی ئنگليزان نەدخوەست ، کو ترکی لێ بەرچەببە . ترکيەك پەرچەکریو بچووك ل دژی بۆلشەويزمێ نکاربيبوو مافێ وان ب پارێزە . ئەرێ دهن تشتاندە ئەو وکەماليست نەل هەڤ بوون . لێ وان د سياسەتا خوەست کەماليتان «تەنکيل» لێد خوەستن ب نەرمی «تەديب» بکن . ئاليکاريا کوردان ژ بۆ دامەزراندنا کوردستانێو پەرچەکرنا ئانادۆلێ نە دبوو «تەديب» (تەربيەکرن) ئا کەماليستان لێ دبوو پووچکرنا وان .

لۆما ژی مرۆڤ دکارە بێژە ، کو نەبەدرخانی لسەر حەسابێ ئنگليزان چووبوون کوردستانیو دەست ب تەڤگەرێ کربوون نەژی ئنگليزان ئاليکاريا وان دکرن . پەيوەندێن کو هەبوون ژی ل سەر ئەساسێ تێکلێن شەخسیو دوارەکی پر تەنگدە بوو .

ل ئالی دن تفاقا بەدرخانيانو واليێ سێواسێ عالی گالپ ئەرێ هەبوو لێ بەس د نفتەکێدە بوو . د گەلەك نقتان دە (و ب تايبەتی د مەسەلا کوردستانێ دە) وانو عالی گالپ ل هەڤ نەدکرن . عالی گالپ لسەر ناڤێ حوکوومەتا ئستەنبۆلێ دخوەست رێ لبەر کۆنگرا سێواسێ بگرە لێ نەدخوەست ئەڤ کارێ هان فەيدێ بگهينە تەڤگەرو ئارمانجا بەدرخانيان . لۆما ژی تفاقەك ئەساسی د ناڤبەرا وان دە پێك نەهاتو ژ بەر کو عالی گالب ب تووژابێ ل دژی تەڤبگەرا کورد بوو ، زوو تێك چوو

پشتێ ڤان چەند نقتان ئا چێتر بەر ب هش دچە ئەوە ، کو بەدرخانی لسەر ناڤێ تەڤگەرا کوردێن ل ئستەنبۆلێ (وئحتمالەك مەزن لشەر ناڤێ (Teşkilat-I içtimaye cemiyeti) هاتبوون شاندن کوردستانێو وان دخوەست خوە بگهينن عەشيرێن ديرسمێ . کۆچگرێ . کو ئسەر ئەساسی سەرخوەبوونێ ژهەر دەرێ کوردستانێ پێتر ئاکتيڤ کەتبوو ناڤ وان .

ب باوەريا مە هەر ئەڤ سەدەمە . کو ڤێ کاری هان مستەفا کەمال پر ترساندیەو هەو قاس ل دژی ڤێ هاتێ راوەستيایە . وەك کوتێ زانين تەڤگەرا کوردێن ديرسمێو ب تايبەتی کوچگری (سێواسی)داو بێ بوو سەری هلدانەك گور کو ب ناڤێ سەری هلدنا کۆچگرێ تێ ناسين . ڤێ نقتا هان هەتا ئيرۆ ژ بال ديرۆك زانان نەهاتيە رۆنيکرن لۆما ژی هەتا ئيرۆ نە ئارمانجا ئەساسی‌یا بەدرخانيانو کارێ وانێ ویێ دەمێو نە ژ پەيوەنديا سەری هلدانا کۆچکری ب کۆمەلێن نەتەوايەتی يێن کوردو ب رۆژناما ژينو تەئسيرا وان لسەر سەری هلدانێ نەهاتيە ئەشکەرەکرن . دڤێ نقتێ دەلێکۆلينێن نوە ئێن فرەهـ چێبن .

هێژابێ بالکشاندنێ يە . کو ئەم بێژن . برۆفيسۆر م . ئا . حسرەتيان تەڤگەرا بەدرخانيان ئا کو ئەم لەسەر رادوەستن ب ناڤێ «سەری هلدنا کوردان یا مەلەتیێ»ب ناڤ کريە .

«.... پشتی کو تەڤگەرا رزگاريخوازی‌یا ترك دبن سەرۆکاتيا مستەما کەمال‌دە ب سەرکەت ، هەموو مافێن کوردان هاتن ئنکار کرن . سەرۆکێن کوردان ئێن کو ژ بۆ مافێن ملەتێ کورد شەر کربوون ژ وەلات هاتن ب دوورخستن . ئێريشەك تووژو توند چوو سەر ملەتێ کورد . دڤێ دەمی‌دە . د دەرهەق ئەمين عالی بەدرخانو هەر سێ لاوێن وی دە فەرمانا دار دەکرنێ دەرکەت . ئەمين عالی بەدرخانو کورێ وی ثورەيا بەدرخان[12] چوون ، ل مسرێ ب جێ بوون ، کاموورانو جەلادەت[13] ژی چوون ئالمانيا ، دەست ب خوەندنا بلند کرن»[14] .

د دوو خوەندنا خوەيا بلندرە کاموران عالی بەدرخان جارەك دن ب ئاکتيڤی د تەڤگەرا سياسی‌یا رزگاريخوازيا نەتەوا کورد دەجێ خوە گرت . دخۆيبوونێ دە وەك ئەندامەکێ پێشتی کار کرو د ئامادەبوونا خۆيبوونێ يا ژ بۆ شەرێ چەکداری‌یا دەما سەری هلدانا ئاگری (ئارارات) دە خەبتی . لێ ئەڤ کارب سەرنەکەتوخۆيبوونێ نەکاری تەڤی شەری چەکداری سەری هلدانا ئاگری ببەو ل هەزيمێن دن ئێن کوردستانێ ئاگرێ سەری هلدانێ بێخە . پشتی ڤێ تێك چوونێ ، کاموران عالی بەدرخان چوو ئالمانيا ل

فاكولتا (كوليژا) حقووقیٚ ئا بازاریٚ لەیپزیكیٚ (Leîpzig) ناما خوەیا دوكتوری چیٚكر دبن چاڤدیریا ماموستایێ حقووقیٚ ، پروفیسور یاكوبی . و شهادەناما دوكتورایێ وەرگرت .

پاشیٚ چوو باریسیٚ ل زانینگەها (سوربونی) یا فرنسزی ل ویٚریٚ ژی شهادەناما بلند یا فەلسەفیٚو ئادابیٚ وەرگرت [١٥] . پشتی دوكترریٚ ، كامووران عالی بەدرخان هات ل بەیرووتیٚ دەست ب ئاڤوكاتییٚ كر . دڤیٚ دەمیٚ دە كامووران بەدرخان ژ ئالیكیٚ دە ئاڤوكاتیا خوە دكر ژی ئالی دن ژی دەست ب نڤیسكاری‌و روژنامەگیرییٚ كر . دسالیٚن ٣٠ - یٚ دەو د نیڤیٚ یەكەو ئیٚ سالیٚن ٤٠ - یٚ ، دە هەم ب كوردی‌و هن ب زمنیٚن دن گوتارو پرتووك نڤیساندن . گوتارو وەرگەریٚن وی ، بەرهەڤوكیٚن وی یێن د واریٚ فولكلوری دە د كوڤاریٚن بریٚ وی جەلادەت عالی بەدرخان دە ، هاوار (١٩٣٢ - ١٩٤٣)و روناهی (١٩٤٢ - ١٩٤٥) دە چاپ دبوون . (تەفسیرا قورئانیٚ ، حەدیسیٚن پیٚغەمبەرو چارینیٚن خەیام» ب كوردیەك خوەش‌و بلند هاتنە وەرگەراندن‌و د هاواریٚ دە چاپ بوونە .

دواریٚ هوزانا كوردی‌دا ، نەمازە د هوزانا رامیاری دە . كامووران بەدرخان ئیٚكە ژ پیٚشرەویٚن هوزانا نشتمانپەروەری یا هەڤچەرەخ ، و هیٚژاترین هەلبەست ڤەهاندنە ل‌سەر شویا هوزانا كوردی‌یا نوو ، زیٚردەستی‌و ستەمكاری یا ل‌سەر ملەتیٚ كورد ، پر دیارە دڤان هوزانان‌دا . وناسناڤیٚ وی یێ هوزانی «گەروك» بوو ، سەیدایێ گەروك گەلەك هوزانیٚن لامەرتینیٚ فەرنسزی‌و فیكتور هوگوی وەرگەراندنە كوردی ، هەرووسا هوزانیٚن محەمەد ئەمین بوتی‌و ئبراهیم مەلاو حوسەینیٚ ئەمین‌و گەلەكیٚن دن وەرگەراندنە زمانیٚن بیانی [١٦] .

ددەستپیٚكا گولانا ١٩٤٣ - ئان دە دەست پیٚكر ل بیٚرووتیٚ روژناما روژانوو یا حەفتەیی وەشاند . وەك مە بەریٚ ژی گوت ، روژنامی چار رووپەل بوون ، سیٚ رووپەلیٚن ویٚ ب كوردی‌و یەك ژی ب فرانسزی ، داوییٚ روژنامە هەم ب كوردی‌و هەم ب فرانسزی دەركەت . كامووران بەدرخان د روژنامیٚ‌دە ژ ئالیكی دە جیە ددا ئەدەبیات‌و فولكلورا كوردی ، دیروكا كوردستانیٚ‌و ژیانا كوردەواری - ژی ژئالی دن دە ژی بیروباوەریٚن خوەیێن مەسەلا كورد ددا خویا كرن . دوزا یەكیتی‌و سەرخوەبوونا كوردستانیٚ دكر . د بەشیٚ فرانسزی دە ژی داخوازیٚن كوردا دوزا مافیٚن نەتەوایەتی یێ كوردان‌و ژیان‌و دیروكا كوردان ب بیانیان ددا ناسكرن ، بالا وان دكشاند سەرڤیٚ مەسەلیٚ .

ژیلی روژناما روژا نوو . كامووران بەدرخان ل بەیرووتیٚ ، د ٦ یٚ مەها ١٢ - ئا سالا ١٩٤٣ - ئان‌دە كوڤارا ستیٚر ئا مەهانی ژی دەرخست . ئەڤ كوڤار ژی وەك زیٚدایا روژا نوو سیٚ هەژمار دەركەتنە وەشانا روژانوو د بهارا ١٩٤٦ - ئان‌دە راوەستیا .

غەیری خزمەتا كامووران بەدرخان بو روژنامەگەری‌و پیٚشخستنا چاندا كوردان ل بەیرووتیٚ ، كامووران بەدرخان تەڤی چەند هەڤالان رابوون ب ئامادەكرنا دو ژوریٚن بچووك ژخانوویێ قونسلخانەیا فرانسزی ل بەیرووتیٚ وەك قوتابخانەكا بچووك . ئیٚڤاریٚن هەموو روژا ، دا چەند نەخویندەواریٚن كورد لیٚ كومكت‌و وان فیٚریٚ خوەندن‌و نڤیسینا زمانیٚ كوردی كت . پشتی ویٚ ب دەمەكیٚ رابوو ب ڤەكرنا یەكەمین قوتابخانا تایبەتی‌یا كوردی ل گەرەكا «المصیطبة» ل بەیرووتیٚ ، ڤیٚ قوتابخانا هان خزمەتەكا گەلەك مەزن گەهاند كوردیٚن لوبنانیٚ ل دەمەكیٚ دریٚژ ، وهەر ووسا هەمی ئیٚڤارا پروگرامەك ب زمانیٚ كوردی ، ل‌سەر دیروك‌و چاندا كوردا ، د رادیویا بەیرووتیٚ‌دا پیٚشكیٚش دكر [١٧] .

د سالا ١٩٤٧ - ئان‌دە كامووران بەدرخان چوو فرانسایێ ل ور سازگەها لیٚكولینی‌یا كوردی ساز كرو بوو بەرپرسیاریٚ ڤیٚ سازگەهیٚ . ڤیٚ سازگەهی ب ناڤیٚ Bulletin du Centre detudies kurdes (بولتەنا مەركەزا لیٚكولینی یا كورد) بولتەنەك (كوڤارەك وەرزەیی) ئنفورماسیونی دەرخست‌و تیٚدە هایداری یێن دەرهەڤا پرسا كوردی‌دە رابەری بیانیان دكر ، بالا وان دكشاند سەر ڤیٚ مەسەلیٚ‌و ١٣ هەژمار ژڤیٚ بولتەنیٚ هاتنە وەشاندن .

دسالا ١٩٤٨ - ئان دە ئەو چوو دەولەتیٚن یەكبوویی یێن ئەمەریكاو مەموراندوومەك ل‌سەر رەوشا گشتی‌یا كوردا پیٚشكیٚشی سەكرەتەریٚ گشتی‌یێ نەتەوەییٚن یەكبوویی كر [١٨] .

د وی دەمیٚ دە ل خوەندەگەها زمانیٚن روژ هەلاتی یێن زیندار (زانینگەها پاریس) دەست ب هینكرنا زمانیٚ كوردی كر [١٩] . وقاسی ١٢ سالان دەرسیٚن زمانیٚ كوردی ل ڤیٚ خوەندەگەهیٚ بیٚ پارە گوتن ، چمكی ل یاسا (قانوون) فرانسی چیٚنابت یەكیٚ نە ژ خەلكیٚ فرانسایێ دەرسا ل زانینگەهیٚن ویٚ بدەت ب پارە . ول سالا ١٩٦٠ - ئان دە ژییٚ كامووران بەدرخان گەهشتە ٦٥ سالییٚ ، و ل‌یاسا فرانسزی دەل ڤی ژییٚ پیٚویستە هەر ماموستایەك بیٚتە خانەنشینی كرن (تەقاعد) ، لیٚ بەلیٚ كارگیٚریٚن زانینگەها پاریسیٚ ب چاڤەكی پر بلند بەریٚ خوە ددان خەباتا كامووران بەدرخان ژ بو پیٚشڤە برنا زمانیٚ كوردی ل زانینگەهی‌و بیٚ پارە ژبەر ڤیٚ

ئەگەریْ هاتە دوْرخستن ژ شەرێ ژێ ژ سالا ۱۹٦۱ ۱۹٦۲ ئاڤ دە حوکومەتا فرانسزی بوْ وی پارەیەکیْ (مووچە) بەردەوام دانا . هەتا سالا ۱۹۷۰ ئادە هاتە خانەنشینی کرن[۲۰]

لڤر ب گرانیا خوەدا خەباتا زمانیْ کوردیو چاندا کورد کر . فەرهەنگەك کوردی فرانسزی . چەند پرتووکێن گەرامەرا کوردی چێکر . لسەر زمانو چاندا کوردی د گەلەك کوْنفرانسادا لێکوْلین خواندن . د روْژنامێن ئاورووپی دە مینا . روْژناما «لژورنوْڤو» و کوْڤارا کوْمەلا مەلەکی یا ئاسیا یا مەرکەزی (J. R. C. A. S)و یێن دن ، لسەر مەسەلا کورد گوْتار نڤیساندنو ژ بوْ دوْزا ملەتیْ کورد راگینە رایا گشتی یا ئاورووپا . هەرچی فەرساەندێن کو کەت بەردەست ژی فەیدا گرت ، رەوشا کوردان دا ناسکرن . د سالا ۱۹٥٤ – ئاف دە ئەو ب ناتالیە دوْسسوْفە تژکی (Nathalie dossovetzky)یا پوْلوْنی رە زەوجی[۲۱] .

ودسالا ۱۹۷۱ – ئاڤدە پروْفیسوْریْ کورد کاموران بەدرخان هاتە هەلبژارتن ئەندامیْ کارا (عامل) کورا زانیاریي کورد ل بەغدا[۲۲] .

سالا ۱۹۷۰ ئاف دە ئەوو ژنا خوە چوون کوردستانا ئیراقیْ ودەمەکیْ ل ور ما . د داویا ژیانا خوەدا چوونا وی یا کوردستانیْ تەئسیرەك مەزن لیْ کرو گاڤا فەگەریا فرانسایێ «وان هەلبەستێن دەستانی ، ڤیرینێن داوی یێن مروْڤەکی» ژ قەنەماوی رژیان . دسباتا سالا ۱۹۷٥ – ئاف دەژنا وی چوو رەحمەتیْ . پشتی ویْ ب دەمەکیْ کورت ئەو توْشی نەخوەشیو هنەك کودانێن رامیاری یێن گران بوو . ڤیْ یەکیْ ژانو ئێشەك گران خست دلیْ کاموران بەدرخان .

ڤ خەباتکاریْ هێژاییْ تەڤگەرا رزگاریخوازو رەوشەنبیریا کوردی . د ٤ . یْ چلیا پێشی سالا ۱۹۷۸ – ئاف دە ل پاریسیْ چاڤ گرتن ، خاتریْ خوە ژ دنیاییْ خوەست . لسەر وەسیەتا ڤ مروْڤ پەروەرو نەفسی بچووکیْ کورد . لاشی وی دان فاکولتا (کولیژا) طبی یا پاریسیْ بوْ لێگەرینێن زانستی[۲۳] .

ژبەری مرنا خوە کاموران بەدرخان وەسیەت کربوو ، کو مالیْ وی بێت ترخان کرن ژبوْ دامەزراندنا دەزگەهەکا چاندی – زانستی ب ناڤێ (بەدرخان – کوردستان[۲٤]

پشتی مرنا وی ب چەند سالان کتێبخانا وییا تایبەتی هاتە ڤەگوْهاستن بوْ ئەنستیتویا کوردی ل پاریسیْ .

ژیْ نافو دەنگیْ پر بلندیْ کاموران عالی بەدرخان دناڤ مروْڤێن دەموکراتیك . زاناو شەهرەزایێن جیهانیْ . وب هەلکەفتنا بوورینا چل روْژا لسەر وەفاتا وی . زانینگەها سوْربوْنی لپاریسیْ رابوو ب ئاهنگەك مەزن . گەلەك زاناو روْناکبیرێن جیهانیْ بەشداری تێدە کرنو ئاخفتن لسەر ژیانو ئافراندنێن رەحمەتی . ئەڤ دەنگو باسەییْ هاتیە بەلاڤکرن ژئالیْ گەلەك ئاژانسێن (وەکالات) دەنگو باسێن جیهانی ل چاخیْ خوەدا[۲٥] .

کاموران عالی بەدرخان هەم تێکوْشەرەکیْ سیاسی‌ییْ هێژاو هەم ژی روْناکبیرەك کوردیْ ژیهاتی بوو . دواریْ ئەدەبیو زمان زانیو پێشدەخستنا زمانیْ کوردی دەخەباتەك هێژا کر . ژبلی کوردی ترکی ، عەرەبیْ ، ئالمانی ، فرانسزی ، یوْنانیو ئنگلیزی زانیبوو .

ژبلی گوْتارێن وی یێن د هاوار ، روْناهی ، ستێر روْژا نوو ، ژین ، سەربەستیو روْژنامەو کوْڤارێن ئەورووپی دە چاپ بوویی ، ئافراندنێن وی یێن دن ئەڤن[۲٦] :-

۱ – دلیْ کورێن من ، کتێبخانا هاوار هەژمار ۳ ، چاپخانا تەرەقی ، شام ۱۹۳۲ ، ٤۰ رووپەل (هوْزان) .

۲ De la Question Kurde Loi de deórtation et de disperion des Kurdes. 1934,40 pp.

۳ – Der Schnee Des Lichtes (بەرفا روْناهیْ) ، کاموران بەدرخانو د . کورتووندەلچ . بەرلین ۱۹۳۷ . هوْزانێن کوردی .

٤ – Der Adler on Kurdistan (ئەمیریْ کوردستانیْ) ، کاموران بەدرخانو هەربەرت ئورتەل ، بەرلین ۱۹۳۷ .

٥ – Le roi du Kurdistan (قرالیْ کوردستانیْ) کاموران بەدرخانو ئەدولف فالگەروْل ، پاریس ۱۹۳۷ .

٦ – Pro verbes kurdes (مەتهەلوْکێن کوردی) ، کاموران بەدرخانو لوسی پول مارگرێت ، پاریس ۱۹۳۷ . ئەڤ پرتووك یا هاتیە وەرگەراند بوْ زمانیْ عەزەبی ب ناڤیْ ، دراسة في الشعر الكردي ، ترجمه رفيق حلمي ، بغداد ۱۹۳۹ .

۷ – livres scolaries kurdes شام ۱۹۳۷ .

۸ – دەرسێن شەریعەتیْ ، کتیبخانا هاوار ۱۲ ، چاپخانا تەرەقی ، شام ۱۹۳۸ ، ۱٦ر .

۹ – ئەلفابیْیا کوردی ، کتیبخانا هاوار ، چاپا یەکەم ، چاپخانا تەرەقی ،

شام ۱۹۳۸ . ٤٨ ر .
۱۰ – ئەلفابەیا من . کتێبخانا هاورا ۱۱ . چاپخانا تەرەقی . شام ۱۹۳۸ . ۳۲ ر .
۱۱ – خوەندنا کوردی . کتێبخانا هاوار ۱۰ . چاپخانا تەرەقی . شام ۱۹۳۸ . ۸۰ ر .
۱۲ – چارینێن خەیام . کتێبخانا هاوار ۱۳ . چاپخانا تەرەقی . شام ۱۹۳۹ . ۳۲ ر .
۱۳ زمانێ کوردی . چاپخانا تەرەقی . شام ۱۹۵۳ . ۲۵۳ ر .

۱٤ – langue kurde (زمانێ کوردی) . چاپا یەکەم . پاریس ۱۹۵۳ . ۲۵۳ ر .
۱۵ – la Queztion kurde پاریس ۱۹۵۹ . ۱٦ ر .
۱٦ – Kurdish Question . پاریس ۱۹٦۰ .
۱۷ – langue kurde ، (زمانێ کوردی) . چاپا دووەم . پاریس ۱۹٦٤ ، ۱۷۰ ر .
۱۸ – le kurdes saus paine پاریس ۱۹٦۵ . ۱۷۲ ر .
۱۹ le dossier du kurdistan dussud (دوسیا کوردستانا باشوور . پاریس ۱۹٦۵ .
۲۰ – mon livre cours pratique de le langue kurde (نقیسا من) . پاریس ۱۹٦۵ .
۲۱ – Kurdes la langue marenelle, aalphabet et lectures (زمانێ مادەر) ، پاریس ۱۹٦۵ ، ٤۰ر.
۲۲ – فێربوونا خوەندنا کوردی ، پاریس ۱۹٦۸ ، ٦۱ ر.

۲۳ ئەلفابێیا کوردی ، چاپا دووەم ، بەیرووت ۱۹٦۸ ، ٤٨ر.
۲٤ – دەستپێکا خوەندنێ ، پاریس ۱۹۷۱ ، ۱٦۵ر.
۲۵ – دەرسێن دیانەتێ و حەدیسێن جەنابێ پێغەمبەر ، پاریس ۱۹۷۱ .
۲٦ – ژ تەفسیرا قورئانێ ، پاریس ۱۹۷۱ .
۲۷ – پەرچێن بژارتە . پاریس ۱۹۷۱ .
۲۸ – هۆزانێن کوردی یێن لیری ، پاریس ۱۹۷۳ ، ب فرانسزی .
۲۹ – زمانێ کوردی – گرامەرا کوردی – ترکی ، کامووران بەدرخان و س ، شڤان ، وەشانێن کاوا ، ئستەنبۆل ۱۹۷٦ .
۳۰ – نەخوەشیێن کوردستانێ ، پاریس ۱۹۷٦ . هۆزان .ە
۳۱ – turkçe izahli kürtce چاپا دووەم ، ریکا ئازادی ، ئستەنبۆل ۱۹۷۷ . ٦۰ر.

۳۲ – le calvaire du kurdistan kurdistan
۳۳– پاریس؟، ۲٦ر
La lyre kurde Le. calaire du
۳٤ – jenosit . پرتووکەکە ب زمانێن (ترکی – فرانسزی – ئنگلیزی) لسەر عەشیرا جوانروو (ل کوردستانا ئیرانێ) . کامووران بەدرخان یێ نڤیسی . پاریس ؟
۳۵ – فەرهەنگا کوردی ئالمانی . کامووران بەدرخانو د هادانك .
۳٦ – فەرهەنگا ئالمانی کوردی .
۳۷ – أدرنه سقوطنك ایچ یوزی (رویێ ئەساسیێ رۆخاندنا شارێ ئەدرنە) . کامووران بەدرخانو جەلادەت بەدرخان . چاپخانا سەربەستی . ئستەنبۆل ۱۳۲۹ . ۱٤۹ر.

ل رووپەلێ دوماهیێ ڤێ پرتووکێ ناڤێ ڤان پرتووکێن بنەمالا بەدرخان پاشایێ ب زمانێ ترکی نڤیسین و چاپکرین یێ هاتیە نڤیسین[۲۷] :–

ا – (بۆ برا هاودینەکانمان ئەو کارەساتە پیشان ئەدات کە لەرۆم ئێلی بەسەر موسولمانەکاندا هات) نڤیسینا کامووران بەدرخان . جەلادەت بەدرخان .
ب – چار بەرگ ژ (سلطنت أدبیه) پێك هاتیە ژ هۆزانو پەخشانێن کامووران بەدرخانو جەلادەت بەدرخان . ب زمانێ ترکی .
ج – دو بەرگ ژ پرتووکا (حەجلە) . هۆزانو پەخشانێن کامووران بەدرخان ب زمانێ ترکی .
د – فەرمانێ کۆمەلایەتێ ئافرەت لەفرەنسی یەوە (ئورەیا بەدرخان) . وەرگەراندیە ترکی .
هـ – هەلچونێ میللەت بەرامبەر کارەسات کامووران بەدرخان وجەلادەت بەدرخان یا وەرگەراندی ترکی .
و – میرنشینا عەزیزانا کوردی ، ئورەیا بەدرخانو جەلادەت بەدرخان نڤیسیە .
ز – داوەری (محاکەمات) «سەن» لە پاریس . ئورەیا بەدرخان نڤیسیە .
ئافراندنێن کامووران بەدرخان یێن چاپ نەبووی :–
۳٨ – فەرهەنگا کوردی – فرانسزی . ئەڤ خەبات کارێن کو کامووران بەدرخاند سی سالێن داووینێن ژیانا خوە دەپێك ئانی بوو . نها ئەنستیتویا کوردی ل پاریسێ د دومینەو تەمام دکە ، ژ بۆنا چاپکرنێ[۲٨] .
۳۹ – فەرهەنگا فرانسزی – کوردی .

٤٠ - تەفسیرا قورئانیٚ (ژی تەنیٚ هن سورە چاپ بوونە)

٤١ - چار ئنجیل .

٤٢ هۆزانێن دوماهیێ بۆ کوردستانیٚ .

**ژێدەرو دەهمەن :**

١ ژبۆ بەرهەڤکرنا ڤیٚ گۆتاریٚ . ژێدەریٚ مەییٚ بنگەهی پێشگۆتنا رۆژناما رۆژا نوو (١٩٤٣ ١٩٤٦) .
(بەرهەڤۆك) ، وەشانێن ژینا نوو . چاپا یەکەم . سوێد . ئۆپسالا ١٩٨٦ . بوو. وهموو ژێدەرێن ب زمانیٚ ترکی دڤیٚ گۆتاریٚ دا د ئەسلیٚ خودەدە د پێشگۆتنا رۆژا نوو دەنە . وئەوێن دن پێن مەنە . ویا ژ هەژی گۆتنییە کو بێژن ژیانو ئەفراندنێن زانەییٚ کورد کاموران بەدرخان هێژاییٚ نامەکا (اطروحه) دوکتۆرائیێیە ، نە گۆتارەکا هۆسا بچووك .

٢ - ئەڤ کۆمەلە دمەها ١١ - ئان . یان ژی یا ١٢ ئان ئا ١٩١٨ - ئان دا هاتیە سازکرن ، سەرۆکیٚ ویٚ سەید عەبدولقادر شەمدینی ، ئالیکاریٚ سەرەکیٚ پێشین ئەمین عالی بەدرخان ئالیکاری سەرەکی ددویان فوئادپاشا ونەڤ کەسە ژی ئەندام بوون . سەید عەبدوللا ، میرالی خەلیل بەگ ، م . عەلی بەدرخان ، م ئەمین بەگ ، خوجە عەلی ئەفندی . شەفیق ئەرواس ، پروفیسور شوکری بابان . فەتحوللا ئەفەندی ، د . شوکری محەمەد کاموران بەدرخان ، وخەلیل خەیالی -هند ڤی کۆمەلیٚ کۆڤارەك کوردی ترکی ، ب ناڤیٚ ژین دەرئێخست ، کۆڤارا ژین دپاییزا سالا ١٩١٨ - ئاندا ل ئستەنبۆلیٚ دەست ب دەرکەتنیٚ کریە ، و ٢٥ هەژمار وەشاندن ، تاریخا هەژمارا پێشین ٧ - ١١ - ١٩١٨ - ئان ، و هەژمارا ٢٥ ئا دتاریخا ٢ - ١٠ - ١٩١٩ - ئان دەرکەتیە . بنێرە ، م . ئەمین بوزار سلان ، کۆڤارا ژین (بەرهەڤۆك) ، جلد ١ ، وەشانخانا دەنگ . سوێد ، ئوپسالا ١٩٨٥ . ژپێشگۆتنیٚ ، ر ٢٣ ور ، ٥ .

٣ - هەڤالیٚ هێژا پێزانیٚ ئالیخانی دگۆتارەکا خوەدا ل کۆڤارا کاروان هەژمار ١٤ - تشرینی دووەم ، ١٩٨٣ . ر ٢٧ ، دبێژت : ژ هەژمارا ٢٠ هەتا هەژمارا ٣١ ژ رۆژناما کوردستان (١٨٩٨ - ١٩٠٢) ، کاموران بەدرخان هاریکاریو ب ریٚ ئێخستنا ڤیٚ رۆژنامیٚ کریە . ئەڤە لنگیەك مەزنە ، چمکی هەژمارا ٣١ - یٚ رۆژناما کوردستان سالا ١٩٠٢ .ئادەرکەتیە ، وی چاخی ژییٚ کاموران بەدرخان حەفت سال بوون چاوا زارۆیەکیٚ هۆسا بچووك دیٚ ئیشی د رۆژنامە گەرییێدە کەت .

٤ - دداویا سالا ١٩١٩ - ئاندە ، ئەڤ کۆمەلە هات ساز کرن ، سازکەرێن ڤیٚ کۆمەلیٚ ئەڤ کەسێن ژێرین بوون . ئەمین عالی بەدرخان ، جەلادەت بەدرخان . کاموران بەدرخان . کەمال فەوزی ، ئەکرەم جەمیل پاشا . د . شوکری محەمەد . مەمدوح سەلیم . مستەفا پاشاییٚ یامولکی . خەلیل رامی بەدرخان . مەولان زادە رفعەت . د . عەبدوللا جەودەت . حکمەت بابان . پرۆفیسۆر شوکری بابان .... هتد بنێرە . د . بلەج شیرکوە . القضیة الكردیة . مطبعة السعادة . القاهرة ١٩٣٠ . ر ٥٣ . م . ئەمین بۆز ئەرسەلان . ژێدەری ب ناڤیری .ر ٣٨ . رۆژناما التاخی هەژمار ١٠١ . سالا یەکەم . ١٠ ئاب ١٩٦٧ .

٥ - hanioğlu Abdullah Cevdet Sukru Hanioglu
روویەلیٚ ٢٩٧

٦ - د.م نووری دەرسیمی . Kurdistan tarihinde Dersim (دیرۆکا کوردستانیٚدا دەرسیم) چاپخانا عانی . حەلەب ١٩٥٢ .

٧ - Erzincan Tarihi

٨ - د پرتووکێن دیرۆکا ملەتیٚ کورددا . رۆلا گرنگێ ئا بنەمالا جەمیل پاشاییٚ ئامەدی (دیاربەکری) . (عەلی . عومەر . قەدریو ئەکرەم) دخەباتا پەیدا کرنا ماڤێن ملەتیٚ کورد . بەحسا خەباتا وان ب فرەهی نەهاتیە کرن . لیٚ بەلیٚ ئیشو کارێن وان د کۆمەلێن کوردان پێن ل ئستەنبۆلیٚ پشتی سالا ١٩٠٠ - ئاندە هاتبوون سازکرن . گەلەك دیارە . وهێژاترین پرتووکا ل سەر خەباتا ڤان کۆمەلان پرتووکا زنارسلۆپی (قەدری جەمیل پاشا) ، دۆزا کوردستان ، ژ ٦٠ سال هەتا نها بیرانینیٚ شەریٚ رزگارییێ ئا ژ بن دەست یێ نەتەوا کورد
Doza Kurdistan, kürt milletinin 60 Seneden beri Esaretten) kurtulus savasi hatirat
، چاپخانا ستەور ، بەیرووت ١٩٦٩ یە .

٩ - ئەڤ راپۆرتە یاهاتیە وەرگەراندن ب ناڤیٚ ، یادداشتەکانی مەیجەر نوئێل لە کوردستانا ، وەگێرانی حسین أحمد جاف وحسین عثمان نێرکمەجاری ، چاپخانا ئۆفسێت حوسام ، بەغدا ١٩٨٤ ، ٢٢٤ر .

١٠ - باسیل نیگیتین ، کورد ، ج ١ ، روویەلیٚ ٣٨ . ب ترکی .

١١ - Z. Saruhan , Kurtuluş Savasi Günlügü
ج ٢ ، روویەلیٚ ٩٨ .

١٢ - رۆنا کبیرو نشتمانپەرەریٚ کورد ثورەیا بەدرخان ، کوریٚ مەزنیٚ ئەمێن عالی بەدرخانە ، رۆلەکا گەلەك مەزن ددیرۆکا رزگاریخوازییا کورداندا

دیتیه . زانه‌یێ ئنگلیزی درایڤه‌ر دبێژت (ته‌ڤگه‌را رزگاریخوازا ملله‌تێ کورد د سالا ۱۹۰۸ (سالا شۆرشا دستۆریا ئۆسمانلی) . لسه‌ر ده‌ستێ ئوره‌یا به‌درخان په‌یدا بوویه) . وپشتی وێ سالێ رۆژناما کوردستان ل ئسته‌نبۆلێ‌و پاشێ د نابه‌ینا سالێن شه‌رێ جهانی‌یێ یه‌که‌م ل قاهیرێ ده‌رئێخست . ول سالا ۱۹۱٦ - ئانده کۆڤارا ژین ئا نیڤ مه‌هی ب زمانێ کوردی - عه‌ره‌بی - ترکی . ل قاهیرێ ده‌رئێخست . وپشتی خه‌لاسیا شه‌رێ جهانی‌یێ یه‌که‌م کۆمه‌لا خوه‌سه‌ری‌یا کوردستانێ ل قاهیرێ سازکر . و پاشێ ل سالا ۱۹۲٦ ئان ده . کۆمه‌لا خویبوونێ ل کوردستانا ترکی‌یێ دامه‌زراند . ووه‌ك ئه‌ندامه‌کێ پێشه‌نگ د شۆرشا ئاگری‌ده خه‌بتی . پشتی تێك‌چوونا شۆرشێ دچه‌ل ده‌وله‌تێن یه‌کبوویی یێن ئه‌مه‌ریکاو پاشی هات ل پاریسێ جیوار دبه . لسالا ۱۹۳۸ - ئان چوو به‌ر دلۆڤانیا خودێ مه‌زن . وئه‌ڤ پرتووکێن ژێرین ل دوو خوه هشتن :

the case of kurdistan against turkey - p
Issued by the kurdish Independence league,
55. E Allegheny Ave Philadel phia. 1929.
بLa Question kurde . Ses origines et Ses -
Causes le caire, 1930.


بنێره ،کۆڤارا رۆژی کوردستان، هه‌ژمار ٥٩، حوزه‌یران ۱۹۸۰.ر۹ .د . بله‌چ شیرکوه ، ژێده‌رێ ب ناڤبری ،ر٥١ -٥٢ . جه‌مال خزنه‌دار ، رابه‌ری رۆنامه‌گه‌ری کوردی . به‌غدا ۱۹۷۳. ر۲۱ . منصور شلیطا، "یوسف ملك ، ذکری الامیر جلادت بدرخان "،ر۱۳. یوسف ملك، قبرص‌و بربریه الاتراك في القرن العشرین . مطابع سمیاء بیروت ١٩٥٥، ١٩٥.

۱۳ - ژبۆ چێتر زانینا ژیان‌و ئافراندنێن جه‌لاده‌ت به‌درخان بنێره ، کاروان ، هه‌ژمار ٥٧ ، ته‌مووزی ۱۹۸۷ ر ٧٥ - ۸۰ .

١٤ - پێشگۆتنا کۆڤارا رۆناهی (به‌رهه‌ڤۆك) چاپخانا ژینا نوو سوێد ، ئۆپسالا ١٩٨٥ ..

١٥ - کۆڤارا برایه‌تی ، هه‌ژمارا ۳ ، ئاب ۱۹۷۰ .

١٦ - المقدم منذر الموصلي ، عرب واکراد ، الطبعة الاولی ، دار الغصون ، بیروت ۱۹۸٦ . ر٣٤٥ . کۆڤارا کوری زانیاری عیراق - ده‌سته‌ی کورد ،به‌رگی حه‌فته‌م ۱۹۸۰ . ر۲۸۲ .

١٧ - د . أدیب معوض ، الاکراد في لبنان وسوریا ، المطبعة الامریکیة ، بیروت ١٩٤٥ .ر١٥ . وکۆڤارا برایه‌تی . ژێده‌رێ ب ناڤبری .

١٨ - ئازادی . هه‌ژمار ٤. کانوون ۱۹۷۸ .

١٩ - هه‌ر ئه‌و ژێده‌ر .

٢٠ کاروان . هه‌ژمار ٤٩. تشرینی یه‌که‌م ١٩٨٦ . ر١٢٦ -١٢٧

٢١ ئازادی . ژێده‌رێ ب ناڤبری .

٢٢ - کۆڤارا کوری زانیاری کورد ، هه‌ژمارا یه‌که‌م . به‌رگا یه‌که‌م . ١٩٧٣ . ر٣٢٤.

٢٣ - ئازادی . ژێده‌رێ ب ناڤبری .

٢٤ - رۆژی کوردستان ، هه‌ژمارا ٥٥ ، حزه‌یران‌و ته‌مووزی ١٩٧٩ .ر٢١ .

٢٥ - هه‌رئه‌وژێده‌ر

٢٦ - بارا پتر ژڤان پرتووکان د کتێبخانا کوری زانیاری کورد - ده‌هه‌نه .

٢٧ - کاروان ، هه‌ژمار ٥٠ ، تشرینی دووه‌م ١٩٨٦ . ر٨٦ور ٩١ .

٢٨ هێڤی . کۆڤارا چاندی یاگشتی . وه‌شانێن ئه‌نستیتویا کوردی - پاریس. هه‌ژمارا ١. ئیلون ١٩٨٣. ٢٤ .


**تێبینی**

١- پرتووکێن کامووران به‌درخان یێن دبن نه‌مرێن ٢ - ١٦ ، مه ژپرتووکا د . که‌مال مه‌زهه‌ر ئه‌حمه‌د ، مێژوو ، (مطابع دار افاق عربیة)، به‌غدا ١٩٨٣. ٣٦٤ . وه‌گرتیه .

٢ - پرتووکێن دبن نه‌مرێن ١٣- ٢٣ ٢٥- ٢٧ ، مه ژپرتووکا مصطفی . فه‌رهه‌نگی ئه‌دیب‌و نۆسه‌رانی کورد ، چاپخانا ئه‌سعه‌د . به‌غدا ١٩٨٦ . ر ١٠٦ - ١٠٧ وه‌رگرتیه

٣ - پرتووکێن دبن نه‌مرێن ٢٨- ٣٠ - ٤٢، مه‌ژکۆڤارا رۆژی کوردستان. هه‌ژمار ٥٥ ، ژێده‌ری ب‌ناڤبری ٢٠ - ٢١ وه‌رگرتیه .

٤ - پرتووکا دبن نه‌مرا ٣٤، مه‌ژکۆڤارا هێڤی ، هه‌ژمار ٥ ، گۆلان ١٩٨٦ ، پاریس .ر١٧ وه‌رگرتیه .

٥ - پرتووکا دبن نه‌مرا ٣٥، مه‌ژتووکا عرب واکراد ژێده‌ری ب ناڤبری ، ر٣٤٣ . وه‌رگرتیه.

٦ - پرتووکا دبن نه‌مرا ٣٦ مه‌ژکۆڤارا برایه‌تی . ژێده‌رێ ب ناڤبری . وه‌رگرتیه.

ل دوماهی‌یێ ئه‌ز پر ژ دل سۆپاسیا هه‌ر دو مامۆستایێن خوه. مامۆستا محه‌مه‌دێ مه‌لا که‌ریم‌و دۆکتۆر که‌مال مه‌زهه‌ر ئه‌حمه‌د دکم. ژ بۆ هاریکاریا وان، خودێ مه‌زن مینا وان پرکت دناڤ ملله‌تێ مه‌ده.

# کەس و شت و ووشە

وەرگێرانی
فەتاح حامە عەلی

Persons Things and Words

ئەنتۆلۆجی زمانی بە بەرنامەیێکی زانستی نویێ دادەنرێت کە لە پاڵ زانستی زمانو زانستی رەگەزو مێژووو شارستانیەت سەری هەڵداوەو پەیدابووە . کەرستەی ئەنتۆلۆجی زمانی کە لەم ووتارەدا باسی لێوە دەکەین ، ئەو پەیوەندی‌یەمان بۆ دەردەخات کە لە نێوان زمانو شارستانیەتو جیهانی دەوروبەردا هەیە .

**بیردۆزی وۆرف** :

**(بنیامین لی وۆرف)کە فەرمانبەرێکی کۆمپانیای (تەئمین)ی دژبە سووتان بوو بەووردی چاودێری کاروباری خوی دەکرد . ئاگر لە ئەمارەکانی نەوت بەربوو کە لەسەریان نووسرابوو بەتاڵن** ( Empty) لەبەر ئەوە خەڵکەکە مەترسی‌یان نەدەکردو بەبێ ترس پاشماوەی جگەرەکانیان فرێ دەدایە دەوروبەری ئەم ئەمارانە چونکە ووشەی (بەتاڵن) ئەوەی نەدەگەیاند کە هەڵمی ناو ئەمارەکان ناسووتێن . بە لاّم (بنیامین‌لی‌وۆرف)لەبەر ئەوەی رۆشەنبیر بووو ئەوکاتەی کە لە ئیش‌و کاری کۆمپانیا نەبووایە ، دەستی دەکرد بە لێکۆڵینەوەی نووسراوەکانی (ئەزتیك)و (مایاس) کە زمانی نەتەوەکانی دانیشتووی مەکسیك‌و ئەمریکای ناوەراستن . پاشان خووی دایە زمانەکانی هیندی کە زمانی نەتەوە رەشەکانی ئەمریکان . کارەکەی ووردە ووردە بەرەو پێشەوە بردو تا وای لێهات ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی بووە بیردۆزێك کە بە بیردۆزی (وۆرف) ناسراوەو لەهەموو جیهان‌دا بلاّو بووەتەوە . لە دوای‌مردنی وۆرف کۆنگرەیێکی جیهانی بەسترالەشیکاغۆ، ئەم کونگرەیەش لەپێناوی ئەوە سازکرا کەوا ئێستا پێی دەڵێن بیردۆزی‌وۆرف . ناوەرۆکی بیردۆزەکەش دەڵێ : بیرکردنەوەو رەوشتی ئادەمیزاد بەتەواوەتی بەندن بەزمانەوەو ئەم دووانە پشت بە زمان دەبەستن .

ئایا وۆرف لە بۆچوونەکەی راستی کردووە ؟

**شتەکانو ناونانیان** :

چەند رەنگ دەتوانین لەپەلکەزێرینەدا دەست‌نیشان بکەین؟ بێ گومان رەنگی : سوور، نارنجی، زەرد، سەوز، شین مۆر . ئەم دابەش‌کردنە بەپێ‌ی زمانی ئینگلیزی‌و ئەڵمانی راستە بەلاّم لەزمانی رووسی‌دا تەنیا رەنگی شین دوو جۆرە کە هەریەکەیان زاراوەیێکی تایبەتی هەیە کە واتای شینی ئاسمانی‌و شینی تێر دەگەیێنن[1] . لەزمانی یەکێ لە نەتەوەکانی لیبیریا هەموو رەنگەکانی پەلکەزێرینە بە دوو ووشە دەردەبرن : یەکەمیان وەك چۆن نیگارکێشەکان زاراوەی (رەنگە گەرمەکان) (warm)کە سوورو نارنجی‌و زەرد دەگرێتەوە ، دووەمیان رەنگە ساردەکانە (cold)کە شین‌و مۆرو ... هتد بەکاردێنن . دەربارەی رەنگەکان هەر لەمەندە ناوە ستێ ، بەڵکو هەندێ زمان دابەش‌کردنی تریان هەیە بۆ رەنگەکان، ئەگەر کۆمەڵەیێك وەربگرین وەکو :
(سەوز، شین، بۆر، قاوەیی خەڵکی ویڵز ئەم رەنگانە لە هەموو رەنگەکانی شەبەنگی خۆر لە سێ ووشەدا کۆدەکەنەوە : (Ilwyd)

(glass)(gwyrdd)ئەوەی دوایی‌یان بە واتای هەر شتێك دێت کە بە قاوەیی وە یا بۆرێکی تێر داپۆشرا بێ ، بەڵام (glass)ڕەنگی بۆری سووكو شین تێرو سووك دەگرێتەوە ، زاراوەی (gwyrdd) ئەو ڕەنگە دەگرێتەوە لە شەبەنگ کە پێ‌ی دەڵێن سەوز . بەم جۆرە دەبینین کە بۆ یەك دیاردە چەند ناوێکی جیاجیای بۆ بەکار دێنن لە زمانە جۆربەجۆرەکان‌دا ، ناو لێ‌نان دەگۆڕێت ، هەر چەندە کە هەموو خەڵك لەجیهان‌دا بە چاویان هەمان ڕەنگ دەبینن بەڵام زمانەکان دووپاتی لەسەر ڕەنگە جیاجیاکانی شەبەنگ دەکەنەوە .

بەم جۆرە دەبینین کە بۆ یەك دیاردە ناوی جۆربەجۆر بەکاردێت، ناو نانەکە دەگۆڕێتو هەموو ئادەمیزاد لەسەر ئەم زەوی‌یە بە هەمان چاو ڕەنگەکان دەبینن بەلاّم زمانەکان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە ڕەنگی لەیەك جیا لە شەبەنگی خۆر وە یا تیشکی شەپەنگ‌دا هەیە .

زمان خۆی نابەستێتەوە بە هەمان لێکدانەوە دەربارەی جیهانی دەرەوە . زمانی ڕووسی وەکو زمانی ئینگلیزی ووشەی تایبەتی هەیە بۆ ناوی (خوشك)و (برا)[٢] بەڵام ئەم جیاکـردنەوەیە لەنێوان ئەم دوو ووشەیەدا لە زمانی هەنگاری‌دا نی‌یە ، بەڵکو قسەکەر لەم زمانەدا ئەگەر باسی برای گەورەو خوشکی گەورەی کرد هەر وەکو یەکیان دەردەبرێت . بەڵام لەزمانی (مەلایۆ) زاراوەی خوشكو برا هەردووکیان لەژێر زاراوەی ڕەگەزی (Saudara) کۆ دەبنەوە . هەر وا دابەش‌کردنی سەیرتر هەیە ، بەڵێ سەیرترە بە پێ‌ی تێ ڕوانینی زمانەکانی هیندۆ ئەورووپیدا . ئەمانەش لەزمانەکانی هیندی و دانیشتوانی (میلانیزی)و نەتەوەکانی ئەفریقیاو ئەمریکاو ئاسیاو ئوستڕالیادا دەبینرێت .

هەمیشە ناو بۆشتو فرمانیش بۆ کردەوە دادەنرێت ئەمەش ئاشکرایە لە زمانەکانی ئینگلیزی‌و فەرەنسی‌و ئەڵمانی‌و گەلێ زمانی‌تر . ئێمەش وەکو زۆربەی ئەورووپی‌یەکان جیهان دابەش دەکەین بۆ دوو بوار : یەکەم شتو دووەم ڕووداو، لەڕاستی‌دا ئەم دابەش‌کردنو وەسفە تایبەتی‌یە بە زمانی ئێمەوە نەك بۆ جیهانی دەرەوە چونکە هەمیشە جیهانی دەرەوە لە جووڵەی هەمیشەیی‌دایە : دەڵێین to strike وto run فرمانن لە کاتێکی دیاریکراودا ، کەواتە لەبەرچی (an attack) ناوە فرمان نییە ؟ دیاردەکەش هەمان دیاردەیە کە ڕوویداوەو لەکات دروستبووە .

ئەم ووشانەی (lighting) ڕووناکی ، (wave) شەپۆڵ، (pulsation) لێدانی دڵ ، ناونو وەسفی شت دەکەنو وەسفی ڕووداو ناکەن هۆیەکەش لەبەر ئەوەیە کە زمانەکەمان بە باشی زانیوەو بەم شێوەیە پۆلین‌کراوە، پۆلین‌کردنی‌تریش دوور نی‌یە .

ئەم ووشانە لە زمانی هیندی‌یە هوپی‌یەکانی ووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا فرمانو ناونین . لەزمانی (بۆتکاس) دانیشتوانی دوورگەکانی (ڤانکۆڤەر) لە کەنەدە هەموو ووشەکان فرمانن بەپێ‌ی زمانی ئینگلیزی، لەڕاستی‌دا لەزمانەکەیان دابەش‌کردن بۆ شتو ڕووداو نی‌یە، بە یەك جۆر سەیری جیهان دەکەن لەبەر ئەمە یەك پۆل ووشە لە زمانەکەیان‌دا هەیە . لەم زمانە بێ هاوتایە ووشەی (ماڵ) بۆ دروست‌کردنی خانووو ئەو خانووەی کەخەڵکی تێدا دەژی بەکاری دێنن . هەروا بۆ ئاگریش ئەو ئاگرەی کە داگیرساوەو دەسووتێو ئەو ئاگرەی کەشتی پێ دەسووتێنن وە یا بۆ ئاگرکردنەوەش هەر هەمان ووشەی ئاگر بەکار دێنن . بەلاّم بە یارمەتی پاشگر (suffi xes)دانیشتوانی ئەم دوورگەیە واتای نوێ لەهەمان ووشە دروست دەکەنو ووشەکە ئاراستەی واتای نوێ دەکرێت ، ووشەی (ماڵ) واتاکەی دەگۆڕێت بۆ : ئەو خانووەی کە ماوەیە کە دروست کراوە ، هەروا بۆ خانووەکی کاتی ، بۆ خانووی داهاتوو ، بۆ ئەو خانووەی کە لەماوەیەك‌دا هەبووە ، بۆ ئەو خانووەی کە دەبێتە ماڵ . هیندی‌یە هوپی‌یەکان بۆ هەموو شتێك کە توانای فڕینیان هەبێت ناوێك بەکار دێنن جگە لە باڵندە . بەلاّم بۆ باڵندە ناوێکی‌تر بەکار دێنن ، ووڕف ئەڵێ : ناوی یەکەم چینی F-B دەگرێتەوە (هەموو شتێك کەتوانای فڕینی هەبێت جگە لە باڵندە) (Flying minus bird)هوپی‌یەکان هەمان ووشە بەکار دێنن بۆ مێرووو فڕۆکەو فڕۆکەوان جگە لە باڵندە . زمانەکان چەمکی کاتو شوێنی یەکسانیان تیایە . وەك دیارە : (ڕابردووو ڕانەبردووو داهاتوو) تەنیا دابەش کردنی کاتی‌یە کە بگونجێت . بەلاّم لای هوپییەکان ئەم دابەش‌کردنەی کات نی‌یەو نرخێکی ئەوتۆی نی‌یە . ئەوان لە ژیانی ڕۆژانەیان‌دا کارو باری خۆیان جێ‌بەجێ دەکەن بە گەڕانەوەیان بۆ ئەو بارانەی کەئەرکی فرمان دیاری‌یان دەکات (Moods)بۆ نموونە : (من بە گەیشتنی ئەو هەواڵ ڕادەگەیێنم) ئەمەش هەموو ئەو ڕووداوانە دەگرێتەوە کە لەڕابردووو ڕانەبردوو دەردەکەوێت (became) هات ، (become)دێ ، ئەم بارە گریمانانە دەگرێتەوە : (من گریمانە دەردەبڕم دەربارەی گەیشتنی) کە لای ئێمە ئەم بارە جیایانە دەگرێتەوە :

ئەو دێت ، ئەو لەوانەیەبێت . وا دیارە کە ئەو هات . ئێمە کات بە ڕۆژو بە ساڵ دەژمێرین واتە بە یارمەتی ئەو ناوانەی کە نیشانە نین بۆ هیچ شتێك . بەڵام هوپی‌یەکان بیریان لە شتێکی ئاوا نەکردۆتەوە – ناو لای ئەوان نیشانەیە بۆ شتی ڕاستەقینە وە یا بۆ تەنێکی سروشتی بینراوو هەست پێکراو – لەجیاتی ڕستەی ئێمە : (دوو ڕۆژ تێپەڕی)

ئەوان دەڵێن : (ئەوە جاری سێیەمە کە خۆر دەرکەوت) وە یا ووشەی (جار) وەلادەنێن کە لە رستەکەدا دەرکەوتووە (خۆر دەرکەوت سێ) واتە : (سێ جار خۆر دەرکەوت). وەرگێرانی ووشە بە ووشەی : (دوو رۆژ کە تێپەری) بۆ زمانی هوبییەکان شتێکی زۆر سەیر دەردەچێت کە مایەی پێکەنینە چونکە بەپێی زمانەکەیان رۆژیش قاچی دەبێت .

لەراستیدا هوبییەکان هەست بە واتا ناکەن چونکە ئەوان لەو بروایەدان کە رۆژی دووەم شتی دووەم نی‌یە ، بەڵکو رووداوەکە هەمان رووداوەو پچراوەو وەستاوە دوایی دەست دەکاتەوە بە بەردەوام بوون . ئێمە نالێین : (پرۆفیسۆری چوارەم تۆماس کە هات) لەحیاتی : (پرۆفیسۆر تۆماس ئیمرۆ وانەی چوارەم دەڵێتەوە) ئەم جۆرە دابەشکردنانە لەجیهاندا کە زۆر جیاوازە لەگەڵ هی ئێمەدا تەنیا لەزمانی هوبی‌یەکان دەرناکەوێت بەڵکو لە زمانەکانی هیندۆ ئەوروپیش‌دا هەستی پێ دەکرێ . رووسەکان ماوەی بیست‌و چوار سەعات بەم شێوەیە دابەش دەکەن : رۆژ هەڵات ، سبەینە ، رۆژ، ئێوارە ، شەو . ئینگلیزەکانیش ئەم ماوەیە بەم جۆرە دابەش دەکەن : سبەینە ، پێش نیوەرۆ ، پاش‌نیوەرۆ ، ئێوارە، شەو [٣] .

لەزمانی ئەڵمانی‌و ئینگلیزی جیاوازی هەیە لەنێوان دەست‌و باسك‌دا ، بەڵام لەزمانی رووسیدا بۆ هەردووکیان هەر (دەست) دەڵێن [٤] ، هەر وا لەزمانی رووسی‌و ئینگلیزی‌و گەلێ زمانی‌تر (دوو چاو)دەووترێ کەچی لای ئێرلەندی‌یەکان هەر بە یەك ئەندامیان دادەنێن‌و چاوێك بەنیوەی ئەندامی بینین دەزانرێت ، ئینگلیزەکان‌و ئەڵمانەکان‌و فەرەنسی‌یەکان جیاوازی لەنێوان پەنجەی دەست‌و پێ دەکەن Fingers) , (Toes)) بەڵام رووسەکان بۆ هەردووکیان هەریەك ناوبەکار دێنن [٥] .

**گەرانەوە بۆ بیردۆزی وۆرف :**

کەواتە جیهان رەنگ‌دانەوەیە بەشێوەی جیاجیا لە زمانە جۆر بەجۆرەکان وەتاهەندێ چەمکی گشتی چەسپاو وەکو : شوێن‌و کات ناونانی جۆر بەجۆری هەیە بەپێی زمانە جیاوازەکان ئەوەی زیاتر روون‌و ئاشکرایە ناونانی فرەچەشنی شت‌و رەنگ‌و رووداو سیفەتە ئەمانەش تێکرا راستین‌و لەزانستی زمان هاتۆنەتە دی، بەڵام ئەم راستی‌یانەش بەشێوازی جیاواز شی‌دەکرێنەوە .

ئێمە هەموومان زمانەکەمان لەسەردەمی منالی زووەوە فێر دەبین ، منالێ لە سەرەتای ژیانی‌یەوە هەست بە جیهانی دەوروبەری دەکات، ئەم هەست‌کردنەش لەچوارچێوەی زمانی زگماکی ئەنجام دەدرێت هەرچەندە کەجیهانی دەوروبەرەکەش جیاوازبێت‌و گەلێ شتیشی لی‌بێت ، لەسەرەتادا ئادەمیزاد ئەوشت‌و رووداوانە دەبینێت‌و هەستیان پێ دەکات کەناوی تایبەتی‌یان هەیە . زمانی زگماکی جیهانی دەوروبەر بەشێوازی تایبەتی خۆی شی‌دەکاتەوە ، ئەم شی‌کردنەوەو هەست پی‌کردنەش دابەش‌کردن بەسەر هەمووماندا دەچەسپێت . ئەڵمانەکان دەڵێن : wording of the world واتە کردنی جیهانی بەتاکەتاکەو دەربرینی بە تاکەکان ، ئەوەیە بیرو باوەری وۆرف . خەڵك تەنیا لەجیهانی شتی دەوروبەر ناژی وەهەروەها تەنیا لە جیهانی ژیانی کۆمەڵایەتیش ناژی ، بەڵکو لەجیهانی زمانی دایکیش دەژین . جیهانی دەورو بەرمان پەنجەی بۆ درێژ دەکرێت بەپێی جیهانی زمان .

**وۆرف ئەمە بەم شێوەیە دەردەبرێت :**

هەر زمانێك جگە لە زاراوەکانی کۆمەڵێ بیروباوەرو ئەحکامی تیایە کە دژ بەبیرو باوەرو ئەحکامی ترن ، جگە لەمەش زمان پابەندی گۆرانە ، ئەمەش ئەو گۆرانانە دەگرێتەوە کە لەجیهانی دەوروبەری ئەو کەسانەی کە بەم زمانە گفتوگۆ دەکەن ، بەشێوەیێکی روونتر جیهان لەبواری فیزیکی‌یەوە هەروەکو خۆی دەمینێتەوە بەلام لەبارەی بیرو هەستی ئادەمیزاد وەك خۆی نامینێتەوە ، هەموو زمانێك جیهان بەشێوەی جیا جیاشی دەکاتەوە لەماوەی پێشکەوتنی جیا جیای‌دا . بۆ وێنە : ناو نانی ئاژەڵ لەزمانی ئەڵمانی کۆن‌و نوێ‌دا ، ووشەی (Tier)ئێستا لەئەڵمانی‌دا بۆ هەموو ئاژەڵێك بەکاردێ، کەچی لەکۆن‌دا ئەم ووشەیە تەنیا بۆ ئاژەڵە درندەکان بەکارهاتووە بۆ جیاکردنەوەیان لە ئاژەڵە ماڵی‌یەکان . ووشەی (wurm)دیسان لەزمانی ئەڵمانی کۆن‌دا بۆ هەموو جۆرە کرم‌و مارو جاڵجاڵۆکە بەکار هاتووە ، بەلام لەزمانی ئەڵمانی نوێ‌دا هەریەك لەمانە ناوێکی تایبەتی خۆی هەیە ، هەروا ووشەی (Fogel)لە ئەڵمانی کۆن‌دا ئێستابووە بە (Vogel)کە واتای باڵندە دەبەخشێت . کەچی لەکۆن‌دا بەهەموو باڵندەو هەنگ و پەپوولەو مێش ووتراوە . بەم شێوەیە ئەڵمانەکان لەکۆن‌دا ئاژەڵیان کردبوو بە دوو بەشەوە ئەوانەی درندە بوون‌و ئەوانەی ماڵین بوونە، درندەکانیان دووبارە بەپێی بزووتنەوەیان دابەش کردبوو بۆ (Tier)ئەو ئاژەڵانەی کە توانای راکردنیان هەبووە ، (Fogel)ئەوانەی کەتوانای فرینیان هەبووە ، (worm)ئەو ئاژەلانە وەیا زیندەوەرانە کەخشۆك بوونە (Fisch)ئەو ئاژەلانەی کەتوانای مەلەکردنیان هەبووە .

ئەم پۆل‌کردنە زۆر ئاشکرایە بەلام لەگەڵ ئەو ووشانەدا نەدەگونجا کە بۆ پۆل‌کردنی ئاژەڵ بەکاردێن لە زمانی ئەڵمانی ئێستادا . زمانی ئەڵمانی کۆن جیهانی بە وێنەیێکی دیاری کراوی تەسك دەخستەروو، لەگەڵ ئەوەشا کەجیهانی راستەقینە هەر هەمان جیهانە بەلام ئەڵمانەکان بە جیهانێکی جیای

دادەنێن کەجیاوازی لەگەڵ رابردوودا هەیە ئەمەش تێکرا دەکاتە کاریٚ کەزمان دروست بکرێتو پێك بهێزێت .

وۆرف دەڵیٚ : دوو چاری ئەو کێشەیە بووم کە لەراستیدا زۆر دووربوو لەزانستی زمان ، کاتیٚ لە کە لە کۆمپانیای تەئمینی دژبەسووتان کاری دەکرد . بەلاٚم بیردۆزی (زمانوبیروراستی) کە لەلایەن وۆرفەوە دانرابوو لەراستی‌دا هیچ پەیوەندی بەئاگر کوژاندنەوە نەبوو بەڵکو بیردۆزەکەی لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی وورد لەوبنە بنە مایانەی کەزمانیان لەسەر دارێژراوە هاتەکایەوە بە تایبەتی ئەو بنەمایانەی کەجیان لەگەڵ بنەمای زمانەکانی ئەوروپی‌دا . ئەو زمانانەش جیهان شی دەکەنەوە بە شێوازێکی زۆر سەیر .

بە کورتی دەڵێین : زمانەکان رێگەی تایبەتی خۆیان هەیە کە بە هۆیانەوە جیهانی دەوروبەر شی دەکەنەوە . ئادەمیزاد هەر لەسەرەتای تەمەنیا زمانی زگماکی خۆی وەردەگرێتو فێری دەبێت لەبەر ئەوەی هەست بەجیهان دەکات لەتەمەنی منالی یەکەم‌دا لەروانگەی زمانە زگماکی‌یەکەی خۆی . پاشان وۆرف ئاشکرای کردوو دووپاتی کردەوە کە ئێمە دیلین بەدەست ووشەکانەوە ، ئێمە هەر لەسەر دەمی منالی‌یا فێری یاسای زمانی زگماکی دەبین بە شێوەیێکی ئۆتۆماتیکی ، لەتەك فێربوونو وەرگرتنی زمانی زگماکی هەروا بەبیٚ ئاگاداری فێری رێگەی بیرکردنەوەی تایبەتی شاراوە (میتافیزیکی)دەبین .

هەر زمانێك پێرەوێکی تایبەتی هەیە لە دابەش‌کردنی جیهان‌دا بۆ بوارە جیاکان بەهۆی ووشەکانەوە بۆ نموونە :

لە زمانی (ئەزتیك)دا تەنیا ووشەیێك بەکار دێنن بۆ واتای بەفر ، سەرما ، سەهۆڵ ، واتە بۆ هەر سێکیان یەك ووشە بەکاردێنن کەچی ئەم ووشانە هەریەکەیان ناوێکی تایبەتی‌یان هەیە لە زمانی رووسی‌و ئینگلیزی‌و گەلیٚ زمانی‌تر[٦] ، دانیشتوانی ئەسکیمۆ تەنیا بۆ بەفر دەیان زاراوەیان هەیە وەکو :

بەفری سەر زەوی ، ئەو بەفرەی کە لەکاتی هەڵکردنی با دەبارێت (زریان) ، بەفری تواوە ، بەفری بەستوو ... هتد . بۆ هەر بارێکی بەفر ناوێکی تایبەتی هەیە . وۆرف بەشی‌کردنەوەی زمانە هیندی‌یەکانی ئەمریکای باکوور هاوبەشی‌یەکی زۆری زانستی زمانی کردووە ، خزمەتی وۆرف لە بواری لێکۆڵینەوەی زمان راستی‌یەکە وهیچ کێشەو مشتو مری لەسەر نی‌یە ، بەلاٚم ئەستێرەی وۆرف بەرەو کزی خۆی نواند ئەمەش بەهۆی ئەوبیردۆزە تایبەتی‌یەی خۆی‌بوو کە دەربارەی پەیوەندی‌یە تێکچڕاوەکان بوو لە نێوان بیرو زمانو رۆشەنبیری‌یەوە .

**زمانو رۆشەنبیری :**

ئایا بیردۆزی وۆرف راستە ؟ ئایا هەر زمانێك میتافیزیکی تایبەت بەخۆیەوە هەیە ؟ گریمان (نیوتن) بەزمانی هوبی گفتوگۆی کردووەو بیری کردۆتەوە لە جیاتی زمانی ئینگلیزی ، ئایا ئەمە دەبووە هۆی جیاوازی شێوەی جیهان لەرووی فیزیکی‌یەوە ؟ (وۆرف خۆی ئەم لایەنەی لەیەکیٚ لە لێکۆڵینەوەکانی خستۆتە روو) رۆڵی زمان لە تێگەیشتنو وەرگرتنی جیهانی دەوروبەر چی‌یە ؟ گرنگی ئەم گیروگرفتە زۆر ئاشکرایە ، هەروا ئەم هەڵوێستە فەلسەفی‌یەش روون دەبێتەوەو ئاشکرا دەبێت کە پێویستە مرۆف وەری بگرێت بۆ شیتەڵ کردنی . رۆشنبیرە سۆڤیەتی‌یەکان گیروگرفتەکە بەپێی مادیەتی دیالەکتیك لێك-دەدەنەوە کە دەڵێت : جیهان پێش هەست کردنو تێگەیشتن دێتو شتیش پێش ئەو ناوە تایبەتی‌یەوە دێت کە بۆی دانراوە .

ئایا زمان کار لە بیرکردنەوە دەکات ؟ بەڵیٚ زمان کار لە بیرکردنەوە دەکات بەلاٚم نەك لە ناوەرۆکی بەڵکو لە شێوازی بیرکردنەوە ، ناوەرۆکی بیر رەنگدانەوەی راستی‌یەو مەبەستو ئامانجی زمانیش گواستنەوەی زانستو زانیاری‌یە لە راستی‌یەوە واتە هەڵێنجانی زانستو زانیاری لە راستی‌یەوە . کابرای رووسی دەڵێت : ماوە لەنێوان مۆسکوۆ لینیگراد (٦٤٠)کم)ە بەلاٚم کابرای ئینگلیزیش دەڵێت هەمان ماوە (٤٠٠)میلە شێوازەکە هەندێك دەگۆڕێتو چەمکەکە ناچەسپێت (میل جیاوازەلەگەڵ‌کم) بەلاٚم هەر هەمان رەنگدانەوەی راستی‌یەو رەنگدانەوەکەش راستە .

جگە لە ئاسانکاری هونەری (ئەمەشیان دەبێتە هۆی گۆڕینی شێوازی بیرکردنەوە) هەموو زمانێك توانای ئەوەی هەیە کەوێنەی راستەقینەی جیهانی دەرەوە بخاتەروو . زۆربەی هەرەزۆری زانایانی جیهان دان بەم راستی‌یە دەنێن با هەر یەکەیان هەڵوێستی فەلسەفی جیا جیاشیان هەبێتو ناچار دەبن لەسەر ئەوە بەپیٚ ی ئەو راستی یانەی کە تێکەڵ یەکتر - بوونە .

چەند ساڵ لەمەوپێش کۆڕێك لە شیکاغۆ بەسترا بۆ لێکۆڵینەوەی ئەگیروگرفتانەی کە بەستراونەتەوە بە بیردۆزی وۆرفەوە . لەم کۆڕەدا زانایانی بوارە جیاوازەکان هاوبەشی‌یان تیاکرد - زمان ، لۆجیك ، سایکۆلۆجی ، ئەنترۆپۆلۆجی ، فەلسەفە ، ئەتنۆگرافی . ئەم گیروگرفتە سەرەکی‌یەی کە لەم کۆڕەدا باس‌کرا بەناوو نیشانی (زمانورۆشەنبیری)بوو . ئایا زمان بڕیاری تیٚروانینی ئادەمیزاد بۆ جیهان دەدات؟ وۆرف لە وەلاٚمی ئەم پرسیارەدا

وونی : بەلێ . بەڵام زۆربەی زاناکان ئەم وەڵامەیان لاراست نەبوو . ر ...ینی سایکۆلۆجی پەنجە بۆ ئەم خاڵانە درێژدەکەن :
...ـت پێش ئەوەی زمان فێربێت جیهانی دەرەوە وەردەگرێت ئادەمیزاد جیهانی دەرەوە شی‌دەکاتەوە پێش ئەوەی بیرکردنەوەی زمانی لادروست بێت . کاتێ کە منالێ فێرە قسە دەبێت دەست دەکات بە یەکەوە نووسانی ...و ...نو شارەزایی وەرگیراو ئەمەش بە بەکار هێنانی زمانەکەی ئەنجام دەرێت . شت پێش تاکەکانی زمان دەکەوێت‌و پێچەوانەش راست‌نی‌یە ئەمەش هەندێ لەو قسانەی زمانەوانی ئەمریکی بە ناوبانگ (جۆزێف‌گرینبەرج)کە لە کۆڕی شیکاغۆدا ووتویەتی : (گریمان دوو پیاو بە دوو زمانی جیاواز قسە دەکەن . واتە هەر یەك زمانێکی تایبەت بەخۆیەوەی هەیە . هی یەکەم بەزمانی ئینگلیزی‌و دووەم بەزمانی رووسی قسە دەکات . ئەم دوو پیاوە لەسەر رووی مانگ نیشتنەوەو هەردووکیان لە سروشتێکی جیاوازن کە جیایە لەگەڵ سروشتی پێشتریان چونکە هەمیشە رووی مانگ وەکو رووی زەوی نی‌یە . پاشان لەسەر رووی مانگ دابەزین‌و لەسەر زەوی نیشتنەوە ئەگەر هەر یەکەیان باسی هەستی خۆیان بۆ ئێمە بکەن بەپێی بیروباوەری ووڕف دوو وێنەی زۆر جیاوازمان دەست دەکەوێت واتە دوو مانگی جیاواز لەیەکتر (مانگی ئینگلیزی‌و مانگی رووسی). ێرەدا دەڵێین : پشتگیری‌کردنی بیردۆزی ووڕف پێویستی بە نموونەی چوونە ئاوسمان نی‌یە چونکە لە مێژووی مرۆڤایەتی‌دا گەلێ رووداو هەیە وەکو چوونە ناو مانگە . پێش هەزار ساڵ عەرەبەکان گەیشتنە زەوی باکوور . خوورەوشت‌و نەریتی نۆرمەندی‌یەکان زۆر سەیربوو لای عەرەبەکان . سەیربوونەکەش لە راستی‌دا هەروەکو سەرسام بوونی مرۆڤە بەرامبەر بە مانگەوە . جگە لەمەش زمانی عەرەبی هەرچەندە زۆر جیاوازی هەیە لەگەڵ زمانی نۆرمەندی‌یەکان . لەگەڵ ئەم هەموو جیاوازی‌یەش‌دا دەبینین ئەو وەسفەی کە عەرەبەکان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویانەوە بە تەواوەتی لەگەڵ زمانی کۆنی نۆرمەندی‌یەکان دەگونجێن دەتوانین هەمان دیارەو رووداوو شارو چیا ببینین .

هەر زمانێك وێنەی جیهانی بەرێگەی تایبەتی خۆی کێشاوە بەڵام گواستنەوەی پەیام لە راستی‌یەوە بە ووردی‌وبە راستی دەبێت .

زمانەوانە هاوچەرخەکان بەراووردی زمان لەگەڵ سیستەمی ئەندازەیی دەکەن (Geometrical Co-ordinates)گواستنەوە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی‌تر وەکو گواستنەوەی سیستەمی ئەندازەیی‌یە بۆ سیستەمێکی تر جیهانی دەرەوە هەمان جیهانـەلام شێوەکەی لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی‌تر دەگۆرێت . ووڕف باش بۆ ئەمە چووە کە زمان کار لە بیرکردنەوەمان دەکات لەژێر بارو دۆخێکی دیاری‌کراودا (لە رێگەی بیرکردنەوە نەك لە ناوەرۆکی) ئەم کارکردنەش جاری واهەیە لەرەوشتی خەڵکیش‌دا رەنگ دەداتەوە . (ئەمارە بەتاڵەکانی نەوت کە گڕیان سەند بهێنەرەوە یاد) بەڵام ووڕف راستی‌یەکی گرنگتری لەیادکردووە ئەویش ئەوەیە کەراستی‌و تاقی‌کردنەوەی کرداری ئادەمیزادو ژیان کارێکی زور لە بیرکردنەوە دەکەن . لە دوا شی‌کردنەوەدا دەردەکەوێت کە ژیان‌و راستی رۆڵی سەرەکی‌یان هەیە نەك زمان . جارێکیتر دەگەرێینەوە بۆ ئەمارە بەتاڵەکانی نەوت . ئەم رووداوەش لەوانەیە لەهەموو وولاتێك‌دا رووبدات چونکە ووشەی (بەتاڵ)هەر واتای بەتاڵ دەگەیێنێت جا بەهەر زمانێك بنووسرێت : ئینگلیزی. یابانی . کوردی[7] . رووسی . ئەم جۆرە رووداوانە کەم رێك دەکەوێت روودات لە وولاتێك کە نەوتی هەبێت چونکە دانیشتوانی هەر زوو هەست بە مەترسی نەوت دەکەن .

جیاوازی لە نێوان ئینگلیزی‌و رووسی‌و ئەڵمانیو کوردی[8] گرنگ نی‌یە بەڵکو گرنگی‌یەکە لەوەدایە کە جیاوازی لە نێوان ئەو خەڵکەدا هەیە کە لە بوارێکی تایبەتی کار دەکەن‌و لەگەڵ ئەو خەڵکەی کە راستی نازانن‌و هەستی پی‌ناکەن . شارەزایی نوی ئاسۆی زانیاری خەڵکی فراوان کردۆتەوە بەرامبەر بەجیهان‌و دەوڵەمەند کردنی بیرکردنەوەو دروست کردنی چەمك‌و تاکەتاکەی زمانی‌ی نویێ بۆ دەربرینی جیهان بە گەرانەوەمان بۆ ئەو شەبەنگەی کە لەمەوبەر باسمانکرد دەبینین کە زمانی رووسی جیاوازی دەکات لەنێوان دوو رەنگی شین‌دا وە بۆ هەریەکەیان ووشەیێکی جیاواز بەکاردێنن. بەڵام لەزمانی ئەڵمانی‌و ئینگلیزی‌دا ووشەی لێکدراو بەکاردێنن بۆ رەنگی شینی تێرو شینی‌ئاسمانی[9] لەئینگلیزی‌دا :

(Hellbla) . (Dunkelblau) لەئەڵمانی‌دا(Dark Blue) . (Light Blue) بەکاردێنن . جیهان بەرەو هێنانەدی جۆربەجۆرەکان دەروات‌و ژمارەی ووشەش لەهەر زمانێك‌دا دیاری کراوە بێ‌گومان ئێمە ئەگەر ژمارەی ئەو شتە جۆربەجورانەی بێ‌کۆتایی کەم-بکەینەوە (جۆربەجۆرەکانی رەنگە زۆرەکان)بۆ ژمارەیێکی کەمی چەمك بۆ نموونە (ژمارەیێکی کەمی ئاوەڵناو کە وەسفی رەنگەکان دەکات) دەتوانین ژمارەیێکی زۆری ئاوەڵناو لابنێین کە بنچی‌نین‌و لەجیاتیان گرنگی بە هەندێ سیفاتی دیارو سەرەکی بدەین . ئەو هونەرمەندەی کە مامەڵە لەگەڵ رەنگەکان دەکات زۆر پێویستە جیاوازیەکی وورد بکات لەنێوان پلەکانی رەنگ وە بۆ هەر یەکیان ناوێکی تایبەتی دابنێت . بەڵام لەژیانی ئاسایی‌ماندا تەنیا پێویستمان بە چەند سیفاتێك دەبێت بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی پێویستی رۆژانەمان . لێرەدا دەتوانین ووشەی (سەگ) بکەین بە نموونەو بەبێ ئەوە بچینە ناو دوورو درێژی

لایەنەکە . ئەوانەی کە ئارەزوویان لەپەروەردەکردنو ڕاگرتنی (سەگ) هەیە تەنیا بەوەندە ناوەستن کەناوی (سەگ) بێنن بەڵکو ناوەکە بە پێ ی ناونانەکە دەڵێن . ئێمە زۆر جار بەرەو وەلانانی هەندێ لایەنی ووردی شت دەڕۆین بەتایبەتی لەو کاتەی کە زۆر پێویستمان بە شتەکە نەبێت . بەڵام کاتێ پێویستی یەکی زۆرمان بەو شتەوە هەبێت لە توانای زماندا هەیە کە چەند ووشەیێکی تری بخاتە پاڵو بۆی بەکاربێنێت . تاقی کردنەوەکانی ژیان هەر چۆنێك بێت هەندێ جار پێویستی دێتە پێشەوە پێش ئەوەی کە شارەزاییمان پەیدا کردبێت . وە پێش ئەوەی کە کاتێکی تەواومان هەبێت بۆ پۆلێنکردنی کۆمەڵەیەکی دیاریکراوی شتو مەك . لەبەر ئەوە ماوەیێك بە نەشارەزایی دەمێنینەوە بەرامبەر بە بابەتەکە . ئەمەش ئەوکاتەدا ڕوودەدات کە هەڵەدەکەین بیرکردنەوەی چەوتیش هەر لەبەر نەشارەزاییمانەوە دەبێت بۆ ئەو ماددەیەی کە دەمانەوێ چارەسەری بکەین دەبێتە هۆی ڕوودانی کارەسات (ڕووداوی ئەمارە بەتاڵەکان) .

ئەگەر بیرکردنەوەمان بەهۆی شێوازی بیرکردنەوەی چەوت وە یا لەبەر هەر هۆیەکی تر بێت وێنەیێکی چەوتی جیهانمان پێ ببەخشێ کاروباری کرداری جیهانو وێنەکە دەخاتەوە بارێکی ڕاست جا ئێستا بێت وە یا لە دوارۆژا بێت .

بێگومان ڕاستی چەند بوارێکی هەیە . بەڵام ناتوانین ئەموەیێکی کورت هەست بەم هەموو بوارەبکەینو بە تاقیکردنەوەبگەینە هەموو بوارەکانی ڕاستی . بۆ نموونە : ئادەمیزاد بە درێژایی هەزاران ساڵ هەوڵی داوە وێنەیێکی ڕاستی جیهان وەدەست بێنێت . وە یا نهێنی بۆ ماوە چی یە ؟ بۆچ منداڵ شێوەی لەباوکی دەکات ؟ بنچینەی کردارەکانی دەروونی مێشکی ئادەمیزاد چی یە ؟

زانستی نەگەیشتە شیکردنەوەو ئەنجامی ئەو گیروگرفتانە تەنیا لەم دوایی یەدا نەبێت . ئەم بوارانەش وەکو زەوی یەکی بە پیت بوو بۆ خەیاڵی ئادەمیزاد . وە هەر ئەمەش بووە هۆی مانەوەی ڕەگو ڕیشەی داستانو ئەفسانە لەبیری خەڵک لێرەدا هەست بە کاریگەری زمان دەکەین بۆبیرکردنەوە . هێشتا زمان پڕە لە دەربڕینی وەکو (ڕۆژ هەڵات)و (قسە لەگەڵ خۆما ئەکەم) کەچی ڕۆژ توانای جوولەی نی یەو لەشیش خودی نی یە .

کاریگەری زمان لەبیرکردنەوە بە شێوەیێکی ئاشکرا و دیار لە ئەدەب و ئەکتۆر دەردەکەوێت چونکە وێنەکان بە ووشە دەکێشرێنو دەخرێتە ڕوو . ووشەکانیش ڕەگەزی تایبەتی یان هەیە . ئەو وێنە نووسراوەی لە زمانێکا پێشاندەدرێت کە ووشەکانی بە نێرو مێ دەردەبڕێ لە زمانێکی تر

نرخێکی ئەوتۆی نی یە (وەکو زمانی کوردیو عەرەبی)[11] ئەمەش بوارێکی زۆر خۆشە کە لێکۆڵەرەوەکان بۆی دەڕوانن . ووزف لە بۆچوونەکەی ڕاستی کردووە کە زمان کار لەبیرکردنەوە دەکات بەڵام تارادەیێك هەڵەشی کردووە کە ووتویەتی : ئەم کارکردنەی زمان بۆ سەر بیرکردنەوە لە هەموو کاتێکدا دەبێت . لەڕاستی دا ئەمەش ڕوو دەدات بەڵام تەنیا لەو حاڵەتانەدا کە هێشتا کاروباری کرداری دەسەڵاتی بەسەرا نەچەسپاوە . کاریگەری زمانی دیاریکراوە وە بەشارەزایی لەژیاندا ڕاست دەکرێتەوە . ئەمەیان دیسان هۆیەکە کە نرخێکی زۆر بە لێکۆڵینەوەکانی ووزف دەدات هەر چەندە کە بیردۆزەکەی وەکو ئەوانی تر ڕەتکراوەتەوە .

**جیهانێکی نموونەیی :**

لە ڕێگەی زانستو هونەرو فەلسەفەوە ئێمە دەتوانین جیهانێکی نموونەیی دروست بکەین . بەڵام گرنگترین هۆ بۆ ئەم کارە زمانی ئاسایی ڕۆژانەیە . زمان ڕێگەیێکی سەرەکی یە بۆ ئاڵو گۆڕ کردنی زانیاری لەناو ڕۆڵەکانی کۆمەڵی ئادەمیزاددا . پاشان زمان توانای ئەمەشی زیاترە . توانای دروستکردنی جیهانێکی نموونەیی هەیەو وا لە جیهانەکە دەکات کە بەگۆشەیێکی دیاریکراو تێپەڕ بێت لێرەدا جیاوازی یە بنچینەیی یەکە خۆی دەشارێتەوە لەنێوان زمانو هێکانی هونەری کەو زانیاری دەگوازێتەوە بەبێ ئەوەی لەگەڵیا تەبایی و بەبێ هەوڵ دان بۆ کردنی بە نموونەیی وە یا نرخاندنی بە هەر ڕێگەیێك بێت .

لەڕاستی دا خزمەتی ووزف ئەوەوە دەردەکەوێت کە سەرنجی مەردمی ڕاکێشا بەرەو ڕاستی هەستپێکراو هەروا پەنجەی بۆ ڕۆڵی کرداری لەنێوان دەربڕینی کرۆکی نموونەیی ڕاکێشا لەگەڵ لە زمانەکاندا ڕاستە ووزف تا ڕادەیێك موبالەغەی کردووە دەربارەی ڕۆڵی زمان بەرامبەر هۆیەکانی تری بەدواچوون . زمان بەهۆی بنچینەیی داوە هەروەکو زۆر وە لە مێژووی بیر ئەو بیرو بۆچوونانەی کە زیاتر دەمەتەقێیان لەسەر دەکرێت ئەو لەش ئەو بیرو بۆچوونانەن کە زۆر سوودبەخشن یەکێ لە ڕەخنەگرەکانی بیردۆزی ووزف ووتویەتی هەڵەکانی ووزف مەردم بۆ لای خۆی دەکێشێت زیاتر لەو شتە پڕو پووچانەی دووبارەکراوەکە لەلایەن زۆربەی زانستپەروەرەکان بە دوو دڵی یەوە وەردەگیرێت لە جیهانی ئێستامانا مەبەستمان لە تەنیا هۆ دەبێت بۆ بەدواچوون بەڵام لە هۆیەکانی تر گرنگترە

ئێمە دەسەلاتمان بەسەر ... ... ... دەبێت کاتی کە ئێمە لە ئەمەیێکی ... هەست بە جیهانی دەرەوە دەکەین ...

ـەم جیهانەدا هەیە بەڵام زمان هەر لە سەردەمی منالّی زووەوە وەردەگرین . زمان ناسراوە لای هەمووان هەر بەهۆی ئەوەوە دەتوانین دەمەتەقێ لەسەر ئەو دیاردانە بکەین کە هێشتا زانست پەردەی لەسەر نهێنیەکانیان لانەداوە . ئێمە دەتوانین قسە لەسەر بارێکی وابکەین کە هەمیشە روونادات . زمان ماوە بە گواستنەوەی زانیاری دەدات ، دەربڕین لە هەڵوێستەکانمان بەرامبەر هەر بیرێك . دەگێڕنەوە کە ئەنشتاین ووتویەتی : هیچ زانایێك بیرنەکاتەوە بە شێوازی ڕێژەو یاسا . ئێمە بیردەکەینەوەو بە شێوەیێکی سەرەکی پشت بە زمان دەبەستین . بەڵام یاسا بزاوتنەکانی تر هۆی یارمەتی دەرنو مەبەستەکە بە تەواوەتی ناخەنە روو . جگە لەمەش بزاوتن زۆر ئاشکرایەو لاسایکردنەوەیەو جوولەی لە زمانی ئاسایی ئادەمیزاد کەمترە . زمان سیفەتێکی تری هەیە کەلەیاسا بزاوتنەکانەوە نی‌یە ئەویش ئەوەیە کە هەموو کەسێك دەتوانێ بەکاری بێنێت واتە گفتوگۆی پێ‌بکات هەر ئەمەشە کە زمان لە زانستو هونەر جیا دەکاتەوەو ئەم دووانە پێویستیان بەراهێنانو مەشق‌کردنی تایبەتی هەیە . هونەرمەندی هەڵکەوتوو دەتوانێت شێوازی تایبەتی خۆی دروست بکات ، زاناش دەتوانێت پەرە بە یاسایەکی نوێی هێماو ڕێژە بداتو بەرەو پێشەوەی ببات لە فیزیك‌و کیمیاو بیرکاری‌و لۆجیك . بەڵام هەر یەك لەمانە هەر چەند کە بلیمەتو زیرەك بێت ناتوانێ لە جیاتی زمانی زگماکی خۆی زمانێکی تر بەکار بێنێتو زمانە زگماکی‌یەکەی وەلابنێت ، جا زمانەکەی تر هی بێگانە بێت وەیا زمانێکێ دروست‌کراو بێت .

ئێمە لەسەردەمی منالّییەوە زمان وەردەگرین بێ ئەوەی ئاگامان بێت ، هەرچەندە ئێمە زمان لەسەردەمی منالّیمانەوە وەردەگرین بەلام لەم ماوەیەدا ناگەینە ئەو هەنگاوەی کە هەست بە یاساکانی زمان بکەین ، کاتێ هەست بەم یاسایانە دەکەین کە فێرە نووسینو خوێندن دەبین .

ئەم گشتی‌یەش لەلایەن زاناکانەوە سوودبەخش دەبێتو ئەوان ئەم گشتی‌یە بەکاردێنن بو شیکردنەوەی ئەو گیروگرفتانەی کە بۆ یەکەم جار دەردەکەونو بە تەواوەتی لە دەرەوەی ئەم جیهانەن . ئێمە دەتوانین بچینە ناخی سەدەکانەوە بۆ ئەوەی بزانینو ئاشکرای بکەین کە چۆن باوكو باپیرانی ئیمە پێش دەیان سەدە ژیاون ؟ ئەمەش بەهۆی شی‌کردنەوەی هێما نووسراوە مێژوویی‌یەکانەوەو پاشماوە دێرینەکانەوە ئەنجام دەدرێت .

بەلام هەندێ ماوەی مێژوویی واهەیە کە هیچ جۆرە نووسینێکی لە دوا بەجێ نەماوە ، هەروا (هیرۆ دۆتس)و (تاستیس) یش باسیان نەکردووە لەگەڵ ئەوەشا هۆیەکی گرنگ هەیە یارمەتیمان دەدات نەك بۆ زانینی بەرهەمو رۆشەنبیری‌یەکان بەڵکو بۆ وەدەست‌هێنانی وێنەیێکی ئاشکرای ژیانی تایبەتی‌یان . ئەم هۆیەش زۆر بەهێزو کاریگەرە چونکە یارمەتیمان دەدات بچینە ناخی مێژووەوەو شارەزایی لە ژیانی ئایینی باوكو باپیرانمان پەیدا بکەینو ئاگامان لە نهێنی‌یەکانی بوونیان هەبێت ، ئەو شتەی گەرانەوەی کە هەمیشە نی‌یە . ئەم هۆیە گرنگەش بۆ گێڕانەوەی مێژوو تەنیا زمانە .

**گێڕانەوەی دروست‌کردنی جیهانێکی نموونەیی :**

زمان هۆیەکە بۆ دروست‌کردنی جیهانێکی نموونەیی . زمان سامانی هەموو رۆڵەکانی کۆمەڵە . زمانی جوتیارو میرە هی هەژارو دەوڵەمەندە هەموویان هەر هەمان زمان بەکار دێنو گفتوگۆی پی‌دەکەن . ئەوەش دەبێت چونکە یەکێ لە سیفەتەکانی زمان گشتی‌یە ناتوانین بیگۆڕین ئەگەر هۆیەك لەئارادا نەبێت . تاکەکانو دانە سیمانتیکی‌یەکان دیسان دووچاری هەمان گۆڕین دەبن بەلام بەشێوەیێکی زۆر لەسەر خۆ . گۆڤارە میللی‌یەکان زۆر جار ووتاری تایبەتی‌یان تیایە دەربارەی رەگەزی ووشە . ئەو زانستەی کە لە رەگەزی ووشە دەکۆڵێتەوە پێی دەووترێ ئەتیمۆلۆجی (Etymology) ئەو زانستەش هەر ماوەی پەیدابوونی ووشەیێکمان بۆ دەرناخات لە زمانێکاو هۆیەکەی بخاتە روو بەڵکو زانستی ئەتیمۆلۆجی واتا سەرەتایی‌یەکانی ووشەش دیسان هەر پیشان دەدات .

بەلام ئەتیمۆلۆجی لە راستی‌دا پڕە لە هەندێ بابەتی گرنگترو سەرنج راکێشتر . رەگەزی ووشە وێنەی تایبەتی شتە وەسف‌کراوەکە دەست‌نیشان دەکات وەکو چۆن مێژووی ناوو وێنەی تایبەتی کەسێکمان پێ دەبەخشێت . لە توانای زانستی ئەتیمۆلۆجی هەیە کە پەردە لەسەر جیهانی شاراوەی کەسێك هەڵماڵێ کە پێش هەزاران ساڵ کۆچی دوایی کردووە وەیا پێش ماوەیەکی زۆر دوور ماڵ‌ئاوایی لەم جیهانە کردووە .

ئێستا باسی ووشەی (وورچ) دەکەین ، لە زمانی گریکەکانەوە (ئەرکتۆس)ی (Arctos) پێدەڵێن لە زمانی لاتینی دەبێنە (ئورسوس)[١٢] (Ursus) لەزمانی هیندی‌کۆن دەبێنە (رکشاش) (Rkshas). هەموو ئەم ووشانە لە ناوێکی هیندو ئەوروپی‌یەوە دارێژراون کە کرۆکەکەی وەکو (رکتۆس)ە (Rktos) ئەم ناوەهیندۆ- ئەوروپییەش لە زمانی رووسی‌و زمانە سلاڤی‌یەکان ناوی نەهاتووە .

لەبەرچی ووشەکانی وەکو : ئاو ، لووت ، دوو ، سێ ، من ، دایك پارێزگاری شێوە کۆنەکانی هیندۆ ئەوروپی‌یان کردووە ؟ لە بەرچی ووشەی ناوی هەرە کۆنی (وورچ) وون بووەو لەناوچووە ؟ بۆ وەلامی ئەم پرسیارە

زمانەوانەکان ئەم شیکردنەوانە دەخەنە روو: نەرەی رابردووی کۆنی سلاڤی یەکان کە بروایان بە ئەفسانەوە بەهێزبوو دەترسان لەوەی کەناوی (وورچ) دەرببرن جا لەبەر ئەوە ناوی خوازەیی شوێنی ناوە راستەقینەکەی گرتەوە کەلای ئەوان ترسناك بوو ، سلاڤی یە کۆنەکان کە باسی وورچیان بکردایە لەترسان نەیاندەووت وورچ بەڵکو دەیانگوت : (هەنگوین خۆر)[13] ، ئەڵمانەکانیش بەناوی (قاوەیی) (Brown) ناویان دەبرد ، دەبرد ، ووشەی (Bar)ی ئەڵمانیو (Bear)ی ئینگلیزی هەر لە (Brown)ەوەکەوتوونەتەوە ، بەم ڕێگایە زمان یارمەتیمان دەدات بۆ ئەوەی شارەزایی لە جیهانی داپۆشراوی نەوەی رابردوو پەیدا بکەین نەك هەر ئەمە بەڵکو شارەزایی لە ئەفسانەو ترسیان پەیدا بکەین .

**ووشەو ژمارە** :

سەیرترین شێوەی بیرکردنەوەی سەرەتایی ئادەمیزاد بەروونترو ئاشکراتر لەناوی ژمارەوە خۆی دەنوێنێت ، نەك هەر لە ناوەکانی ژمارە بەڵکو لەرێگەی ژماردنو دارشتنی ژمارەو بەکارهێنانیشیاندا .

بیرکاری بە کۆنترین زانست دادەنرێت ، بەلاَم ئەم سیستەمە بزاوتنی یە زۆر نوێیە ئەگەر بەراووردی بکەین لەگەڵ زمانی ئاسایی . هەندێ لە زاناکان دەڵێن بەشێ لە نەتەوەکان توانای ژماردنیان لە سێ ژمارە زیاتر نی یە ، واتە هەر هەتا سێ دەژمێرن (یەك، دوو، سێ) ئەمەراستە بەلاَم بە تەواوەتیش راستنی یە ، بەشێك لە نەتەوەکانی ئوستراليا تەنیا سێ ژمارەیان هەیە (یەك ، دوو، سێ) بەلاَم ئەمەش ئەوە ناگەیێنێ کە کابرایەکی ئوسترالی ناتوانێ جیاوازی لە نێوان سێ کەنغەرو مێگەلێك کەنغەر بکات . شتەکەش ئاسانە، لەزمانەکەیاندا ناونانی پێویست بۆ ژمارەی لەسێ زیاتر نیە . ئەمەش بەستراوەتەوە بە ڕێگەی (اقتصاد)ی لەژیان لای ئوسترالی یەکان .

بەم بۆنەیەوە دەڵێین ژمارەی ئەم جۆرە زمانانە زۆر نی یە . زۆرترین زمانەکان وەتا زمانە زۆر سەرەتایی یەکانیش ناونانی زیاتریان هەیە ، لە جیاتی ژمارەی چوار دەڵێن دوو دوو وەبۆ ژمارەی پێنجیش دەڵێن : دوو دوو ویەك[14] بەلاَم دانیشتوانی دوورگەی (ئەندامان) بەم شێوەیە دەژمێرنن لەژماردندا تا ژمارە چوار دەژمێرن پاشان پەنجەی دەستیان بەکار دێنو دەڵێن (هەروا) وەبەکۆتایی هاتنی ژمارەی پەنجەی دەست کابرای ئەندامانی دەست لە لووتی دەدات .

هەر لەسەرەتاوە ئادەمیزاد پەنجەکانی بۆ ژماردن بەکارهێناوە هەروا دارو رنینی قەدی رووەکیشیان دیسان بۆ ژماردن بەکارهێناوە بەم شێوەیە پاش تێپەربوونی هەزاران ساڵ ئینجا ئادەمیزاد هەستی بەوەکردووە کە ژمارە بە تەواوەتی سەربەخۆیە لە تایبەتی یەکانی شت . هەروا چەند سەدەیێك بەسەر چوو پێش ئەوەی ژمارە جیا ببێتەوەو تایبەتی کانو ئەرکەکانی لەسیستەمێکی ئیشاری رێك کەوێت (sign system) .

زۆر زەحمەتو قورسە بگەینە جیهانی داپۆشراوی ئەو نەتەوانەی کە پێش هەزاران ساڵ ژیاون . بەلاَم شێوەکەی وورده وورده بەرەو تەواوبوون رۆیشت . زاناکان توانیان لە رێگەی بەکارهێنانی هەندێ پاشماوەی ئێسكو پروسك بە تەواوەتی شێوەی هەندێ لە ئاژەڵە کۆنەکان بخەنەوە پێش چاوو سەر لەنوێ شێوەی ئەم ئاژەڵە هەرە کۆنانەمان نیشان بدەنەوە . وەلێکۆڵینەوە زانستی یەکانی زمانیش توانامان پێ دەبەخشێت بۆ گێرانەوەی بنیاتنانی جیهانی باپیرانمان ، جیهانی پێش مێژوو .

**زمانەوانی ئەتنۆلۆجی** :

وورده وورده پەیوەندی زانستی زمان لەگەڵ زانستە کۆمەلاَیەتی یەکانی تر لە زیادبوون دایە . ئەم زانستانە لەناو کۆمەڵدا سەریان هەڵداوەو پەیدابوونە هەروا زمانیش هەر لەناو هەمان کۆمەڵدا دروست بووەو هاتۆتەکایەوە ، کەواتە زمان پەیدابووەو بەرەو پێشەوە تەکانی داوە هەر لەناو کۆمەڵو لە پێناوی کۆمەڵدا .

لەسەر دەمی پەترۆسی گەورە ژمارەیێکی زۆر لە ووشەی هۆڵەندی پەڕیوەتەوە نێو فەرهەنگی دەریایی رووسی ، ئەگەر بێتو مرۆڤ مێژووی دۆزینەوەی جوگرافی وەلابنێت ئەوا ناتوانێ هەست بەهۆی بوونی ژمارەیێکی زۆر لە ووشەی عەرەبیو فەرەنسی بکات کە لە زمانی دانیشتوانی (مەدغەشقەر)دا هەن . هەروا هەست بە پەیوەندی زمان بە زمانەکانی (ئەندەنۆسی)و (بۆلینزی) ناکات .

بە بێ گەڕانەوەمان بۆ ئەتنۆگرافیو زانستی زیندەوەرزانی ناتوانین لە هەندێ راستی زمانەوانی رووت بگەین . زمانەکانی هەندێ لەنەتەوە بەرازیلی یەکانو زمانی ئەو نەتەوانەی کە لە هێڵی یەکسانەوە نزیکن ، لەو هەموو زمانەدا ووشەیێکی گشتی نی یەواتای (تووتی) ببەخشێ بەلاَم هەر لەناو ئەم زمانانەدا گەلێ ووشە هەیە بۆ جۆرەکانی (تووتی) . هۆی ئەمە چی یە ؟ هۆیەکەش هەر لەبەر ئەوەیە کە جۆرەکانی (تووتی)ی جیاوازی یان لەگەڵ یەکتردا هەیە بەڵکو جیاوازییەکی زۆریش ،جا لەبەر ئەمە بۆ هەر جۆرێکیان ناوێکی تایبەتی بەکاردێنن کە جیایە لەگەڵ ووشەی (تووتی) ، ووشەی (تووتی) تەنیا لەناو زمانی ئەو نەتەوانەدا بەکار دێت کە (تووتی) جۆر بە جۆریان نی یە . لەمەش گرنگترین دەستکەوتە ئەتنۆگرافی یەکانو کۆمەلاَتی یەکانە . خالێ سەرەکی ئەوەیە کە تاکەکانی

ـرمـنەوانی بە تەواوەتی دەگونجیٚ لەگەلْ پیٚویستی‌یەکانی کۆمەلاٌیەتی ئەو ـەتەوەی کە ئەم زمانە بەکار دیٚنیٚت . دانیشتوانی دەورو بەری گۆماوەکان ـەـاوچەی بیابانی‌دا (٦٠) شەست ووشەی بەجۆر بەجۆریان هەیە کەواتای ـدـ رخورمای هەمەچەشن دەبەخشن ، واتە هەر جۆرە داخورمایەك ناویٚکی ـتـیەتی خۆی هەیە کە چی تەنیا ووشەیٚکیان نی‌یە کەواتای بەفر بگەیێنیٚت ، ئەمە راستە چونکە ئەوان بەفریان نەدیوەو لە ناوچەی ئەوان بەفر نابارێت . ئیٚستا نموونەیەك لە باکوور دیٚنینەوە : خەلْکی هۆزی (نانتسی) (٤٠) چل ووشەی جیاواز بەکاردیٚنن بۆ هەموو جۆرەکانی بەفر : (توونـد ، نەرم ، ـیـنج ، نویٚ) ... هتد . بەفر لە ژیانی ئەم خەلْکە زۆر گرنگە چونکە ـکـ رێکی زۆر لە پاوەنی ئاسك دەکات‌و پاشان بە ئاسانی راو‌یان دەکەن . چەمکی رووت کەمە لە زمانی ئەو نەتەوانەی کە لە پلەی ژێرەوەی پەیژەی پیٚشکەوتنی کۆمەلاٌیەتی دا .

نووسین دەربارەی فیزیك زۆر زەحمەت دەبیٚت ئەگەر بە زمانی (بۆشمان) وزمانی نەتەوە دیٚرینەکانی ئوسترالی بنووسرێت . لەتوانادا نی‌یە بەکردار پنچینەی فیزیکی ناوکی وەتابیرکاریش بخریٚتە رووبەزمانی رووسی‌و ئینگلیزی ئاسایی‌و گەلیٚ زمانی‌تر چونکە پیٚویستە ئیٚمە کۆمەلیٚ چەمك‌و زاراوەی وەکو (چەند) ، (دابەش)، (جاران) – ناوە زانستی‌یە کانیان – بخەینە ناو زمانی ئینگلیزی‌و رووسی‌و زمانی‌تر . هەرهەمان‌شت بەسەر زمانی(بۆشمان)و زمانی نەتەوە رەسەنەکانی ئوسترالیا دەچەسپیٚت ، لەتوانای ئەم زمانانەدا هەیە کەچارەسەری هەموو زانستیٚك بکەن بەمەرجیٚ چەمك‌و زاراوە نوێیەکانیان پی‌بدرێت[١٥] بۆ نموونە رۆلّەکانی (چوکچی) chukchi کەلە قوتابخانەکانی یەکیٚتی سۆڤیەت دەخوێنن‌و هەموو زانستەکان فیٚردەبن کەچی لە زمانەکەی خۆیان‌دا (حەوت ، هەشت ، نۆ) نابینرێت .

ناتوانرێت زمانەکان دابەش بکرێن بۆ زمانی سەرەتاو زمانی پیٚشکەوتوو . هەرچەند پیٚویستی هاتە پیٚشەوە بۆ چەمکی نویٚ ، هەر پیویستی‌کە خۆی دەکاتە کاریٚ کە ووشە دروست بیٚت‌و سەر هەلْبدا . مەنگۆلیەکان سیستەمیٚکی زۆر ووردیان هەبوو بۆ رۆنانی ئەو زاراوانەی کە چەمکی زۆر ئالۆزیان دەردەبری لە فەلسەفەو ئایینی بوزی . هیچ لەم زاراوانە پیٚش‌بوزی نەکەوتووە . لە سەدەی هەژدەم‌دا کاتیٚ کە پسیۆری (Lomonosov) ئەوەی دۆزی‌یەوە کە زانستی‌ر ووسی هەژارە لە رووی چەند بیریٚکی زانستی ، هەر زوو ژمارەیٚکی زۆر لە زاراوەی رووتی پیٚویستی هیٚنایە ناو زمانی رووسی . زمانی ئەو نەتەوانەی کە ژیانیٚکی کۆمەلاٌیەتی سەرەتا بەسەر دەبەن هەمیشە لەزمانەکەیان‌دا ژمارەیٚکی کەمی زاراوەی رۆشنبیری دەبینرێت ، ئەمەش ئەگەر شتیٚك بگەیەنیٚ ئەوە دەگەیێنیٚ کە ئەم رۆشەنبیری‌یە سەرەتایی‌یە هەژارەو هیچی‌تر . چونکە ئیٚمە لەلایەکی ترەوە دەبینین کە زمان هەموو ئەو زاراوانەی ئامادەکردووە لەهەموو بواریٚکی زیندووی گرنگ . ئەمەش پەنجە درێژئەکا بە تایبەتی بۆ ئەو زاراوانەی کە زۆر گرنگن لە ژیانی کۆمەلاٌیەتی هۆزەکانی ئوسترالی .

ژمارەی زاراوەکانی خزمایەتی لە زمانی هۆزی (کوناری) خۆیان لە بیست ئەدەن . لای هۆزی (واتی واتی)ئەم زاراوانەی خزمایەتی خۆیان لە بیست‌و دوو تەدەن ، وتیٚکرا ژمارەی زاراوەی خزمایەتی لای هۆزی (کولور – کوریدیت) پەنجا زاراوەیە . هەر هەمان شت بەسەر زاراوەکانی تەمەن دەچەسپیٚت (چونکە ئەم زاراوانەش زۆر گرنگن لای ئوسترالی‌یەکان ) ، ژمارەی ئەم زاراوانەی تەمەن لای ئوسترالی‌یەکان لە هەموو ئەو زاراوانەی تەمەن زیاترە کە لە زمانیٚکی ئەوروپی‌دا بەکاردیٚن بەراووردی بکە لە نیٚوان زاراوەکانمان (منالْ ، گەنج ، جوامیٚر ، پیر) لەگەلْ پازدە (١٥) ووشەی کە لە زمانی (ئەراندا) بەکاردیٚن بۆ هەموو پلەکانی تەمەنی میٚینە .

ئەگەر لەوبارە بکۆلْینەوە کە (بۆشمانەکان)و ئوسترالی‌یەکان تیٚیدا دەژین دەبنین کە زمانەکانیان کەمتر نی‌یە لەرووی خۆراهیٚنانیان بە بوارەکانی ژیان لەگەلْ زمانە پیٚشکەوتووەکانی تر . زمانی (ئەراندی) چەمکی وەکو (چیا ، گرد ، رووبار)ی تیا نی‌یە . لەبەر ئەوە ئەرکی خوێندنی جوگرافیا ئەرکیٚکی زۆر قورس دەبیٚت . بەلاٌم پیویستە لە سەرمان ئەوە لە بیرنەکەین کە لە زمانەکەیان‌دا بۆ هەر چیایەك‌و بچووکترین گرد ناویٚکی تایبەتی هەیە . دەست‌نیشان‌کردنی بزاوتن لەم زمانەدا زۆر ئاسانتر دەبیٚت لە زمانی ئینگلیزی‌و رووسی .

زمانی (ئەراندی) بیست‌وهەشت‌ناوی تیایە بۆ (مار) هەروا ناوی رەگەزی هەیە بۆ (مار)وەیا بە شیٚوەیٚکی تر بۆ هەموو ماریٚك (Ampa) دەلْیٚن بەلاٌم ئوسترالی‌یەکان بە دەگمەن ئەم ناوە بەکار دیٚنن چونکە هەمیشە دەیانەویٚ جۆری مارەکە بزانن ، ژەهراوی‌یە یا نا ؟ ئایا مارەکە دەخورێت ؟ ....هتد . بارودۆخی کۆمەلاٌیەتی‌و ریٚگەی هەمەجۆری پیٚشکەوتن دەبیٚتە هۆی دروست‌بوون‌و سەرهەلْدانی تاکە تاکە جۆر بەجورەکان‌و دارشتنە زمانەوانی‌یە فرەچەشنەکان .

بەلاٌم بەهەلْەدا دەچین ئەگەر قسە لەسەر زمانەکان بکەین‌و هەندیٚکیان بەباش لەقەلْەم بدەین‌و هەندیٚکی تریان بە خراپ ، ئەمەش وەکو ئەوەیە کە بلْیٚین کامیان باشترە ؟ دارخورما یان دارکاژ ، ئەفریقیا یان ئەوروپا .

ژمارەی دانیشتوانی سەر رووی زەوی سێ هەزار ملیون کەسەو چەند هەزار زمانیش هەیە (نزیکەی سێ هەزار زمان هەیە) ، ئادەمیزاد هەمووی وەکو یەکە با لە رووی رەگەزو رۆشەنبیریو رەسەنایەتی جیاوازبن ، وەبەهەمان رێگا هەموو زمانەکانی جیهان لەرووی نرخو مافیانەوە یەکسانن و وەك یەکن .

ئەم باسە لە کتێبی (اصوات واشارات)وەرگیراوەو کراوە بە کوردی . أکۆندارتۆف دانەری کتێبەکەیە بە زمانی ئینگلیزی . لە لایەن ئەدوەر یوحەنا کراوە بە عەرەبی .

**پەراوێزەکان**

(١) لەزۆر زمانیتریش رەنگەکان پلەیان بۆ دانراوە ، ئەم پلانەی رەنگ لەزمانی کوردیش‌دا دەبینرێن ، بۆرەنگی شین دەڵێین : شینی ئاسمانی ، شینی تێر ، شینی قەزوانی ... هتد . نەك بۆ ئەم رەنگە بەڵکو بۆ رەنگەکانی تریش ئەم پلانە دێنە ووتن ، بۆ رەنگی سووریش دەڵێین :

ئاڵ ، سووری تێر ، سووری تاریك ، سووری پەمەیی ... هتد بۆ دەرخستنی پلەی رەنگە تێرەکان زۆر جار لەجوارچێوەی وەك یەك‌دا دەردەبرین و بەو شتە سروشتیانەیان دەچوێنین کە رەنگەکانیان زۆر تێرن وەکو : سپییە وەك بەفر وە یا شیر ، سوورە وەك خوێن ، شینە وەك قەزوان چونکە سوورو سپیو شین لەم سێ شتەدا بەتێری خۆیان دەنوێنن .

(٢) لەزمانی کوردیش هەر بە هەمان شێوەیە .

(٣) لە کوردیش‌دا ماوەی بیست و چوار سەعات ووردتر دابەش دەکرێت

بەم شێوەیە : بەرەبەیان ، بەیان رۆژ هەڵات ، سبەینە ، چەشتەنگاو ، پێش نیوەرۆ ، دوا ی نیوە رۆ ، نیوەرۆ ، پێش رۆژئاوا ، رۆژئاوا شێوان ، شەو ، ماڵ نووستانان ، نیوە شەو .

(٤) لە زمانی کوردی‌دا هەردووکیان هەن (دەست)و (باسك) وە هەردووکیان بەکاردێن بەپێی پێویستی قسەکە ، بەڵام بەگشتی دەست دەووترێت و گشتی‌ترە لەباسك ، چونکە یەکێ کە باسکی دەشکێ هەر دەڵێ دەستم شکاوە .

(٥) لە زمانی ئێمەدا بە ووشەیێکی سادە دەرنابرێن بەڵکو بەشێوەی لێکدراو دەریان دەبرین ، بۆ هەر دووکیان ناڵێین (پەنجە) بەڵکو دەڵێین پەنجەی پێ ، پەنجەی دەست .

(٦) لە زمانی کوردیش هەریەك لەم ووشانە ناوێکی تایبەتی هەیەو تەنیا بۆ بەفریش چەند ناوێك هەیە .

(٧) لای ئێمەوە زیاد کراوە .

(٨) لای ئێمەوە زیاد کراوە .

(٩) رەنگەکان لەزمانی کوردیش‌دا بەشێوەی لێکدراو دەردەبرێن وەك لەمەوبەر باسمان لێوەکرد .

(١٠) ئێمە سووری تاریك دەڵێین .

(١١)لای منەوە زیادکراوە .

(١٢) لە زمانی کوردیدا ئەوەی من ئاگام لێبێت ئەم ناوانەی بۆ بەکار دێت : وورچ ، هوورچ ، حرچ ، حوورچ ، هرس ، هورس کە ئەمانەش تێکرا مێژووی بەرەو پێش‌چوونی ووشەکە دەردەخەن . لە لاتینی‌یەکەش (ئورسوس)ی پێ ووتراوە ، جا ئەگەر سەیری (ئورسوس)ی لاتینیو (هورس)ی کوردی بکەین یەکسەر هەست بەوە دەکەین کە هەردووکیان هەریەك ووشەن بەتایبەتی ئەگەر ئەم پاشگری (وس)ە لە لاتینی‌یەکە لابدرێت چونکە بەشێکی سەرەکی نیە لە ووشەکە ئەوا دەبێتە (ئورس) کە لەگەڵ (هورس)ی کوردی یەك‌دەگرنەوەو لەکۆن‌دا هەریەك ووشەبوونە .

(١٣)ئێستاش لای ئێمە ئەو شتانەی کە مەترسی‌یان لێدەکرێت ناوە راستەقینەکەی ناهێنن : بۆ جنۆکە دەڵێن لەمەچێتر ، بۆ مار دەڵێن گوریس یا پەتك .

(١٤) لە زمانی کوردی ئەم دیاردەیە زۆر باوبووە ، ئێستاش هەر ماوە بەڵام بەشێوەیێکی کەمتر بە تایبەتی پیرەکان ئێستاش لە جیاتی ژمارەی چل دەڵێن دوورجار بیست ، بۆ ژمارەی پەنجاش دەڵێن : دوورجار بیست و دە ...بەم جۆرە .

(١٥) دەربارەی ئەم راستیە لەزمانی کوردی‌دا کە لە حەفتاکانەوە خوێندنی قوتابخانە ناوەندی‌یەکان و ئامادەیی‌یەکان بووبەکوردی ئەم راستی‌یەمان بۆدەردەکەوێت .

• بۆ ماوە : وراثە

٥

# گەشت لەگەڵ دوو کێشی عەرووزدا بەناو گوڵزاری شیعری کوردیدا

نزار سابیر

پاش ئەوەی شاعیرانی کورد ئاشنای عەرووز بوونو خستیانە بواری بەکارهێنانەوە ، بە پێی سروشتی زمانو چەشەی مۆسیقی لە ووشەی کوردیدا هەندێك کێشیان فەرامۆش کردو هەندێکی تریشیان بە پێی پێوست ، لەسەر ڕێو شوێنی زیحافو عیللەت ، دەستکاری کرد ، تا لە شیعری کوردیدا هەندێك کێش بەکارهێنرا ، کە ئەو کێشانە بەو جۆرە لە عەرووزی شیعری عەرەبیدا بەدی ناکرێ . بەمە عەرووز لە شیعری کوردیدا چەند شەقڵێکی تایبەتیو جیاوازی وەرگرت . ئەو کێشانەی کە زیاتر لەوانیتر بە ئاهەنگی خۆشو ترپەی ڕێکیان جیادەکرێنەوەو لە بارترن لەگەڵ زمانی شیعریدا ، ڕێژەی بەکارهێنانو مامەڵەکردن لەگەڵیاندا زیاترە . ئەگەر تەماشای شیعری کوردی سەر بەعەرووز بکەینو بەچاو هەوڵی پۆلێن کردنی کێشەکانی بدەین ، ئەوا دەبینین دوو کێشی (ڕەمەل)و (هەزەج) لە هەموو کێشەکانیتر زیاتر بەکارهێنراون . بەتایبەتی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا کە شاعیران ، لەپاش پڵاوبوونەوەی کێشی پەنجەو لە ژێرکاری قوتابخانە ئەدەبیی یە تازەکانداو سەباندنی بابەتی نوێدا ، وورده وورده خۆیان لە عەرووز دەدزی یەوە ، بەجۆرێك کە سەیری دیوانی زوربەی شاعیرەکانی سەردەمی نێوان دووجەنگی جیهانیو پاش ئەوانیش بکەین ، دەبینین لە تەك کێشی پەنجەدا بە زۆری بەو کێشە عەرووزانە شیعریان هۆنیوەتەوە کە سووکنو تێکڕا یەك جۆر تەفعیلەیان تیدایەو زیاتر باون لای شاعیران . جا لەو کێشە باوانەش دوو کێشی ڕەمەلو هەزەجە ، کە لە دووتوێی دیوانی ئەو شاعیرانەی جگەلە کێشی پەنجە ، بە عەرووزیش شیعریان هۆنیوەتەوە ، زورترین ژمارەی شیعر بۆ خۆیان دەپچڕن . ئەوەتا (بێکەس) لە نیوان ٨٧ پارچە شیعردا ، جگە لە بەشی منداڵانەکەی ، ٣٤ شیعری بە کێشی ڕەمەل ووتووە .

ئەوەی پێویستە بووترێ ، ئەم دووکێشەو کێشەکانی تریش لە لایەن زۆر مامۆستای بەڕێزەوە باس کراونو لێیان کۆڵراوەتەوە . (شێخ نوری شێخ صالح) لە ڕۆژنامەی (ژیان)ی ساڵی ١٩٢٦ دا تەفعیلەکانی ئەم دوو کێشەو چەند کێشێکی تریش دارشتووەو نمونەشی بۆ هێناونەتەوە ، بەبێ ئەوەی ناوی بەحرەکان بڵێت [١] . مامۆستا (ئەحمەد هەردی) لە گۆڤاری (برایەتی)دا ساڵی ١٩٧١ کەمێك بە درێژی باسی کێشی شیعری کوردی کردووەو لە ناواخنی باسەکەیدا ، لە سێ کێشی (ڕەمەلو هەزەجو موزاریع) دواوەو تەفعیلەکانی بۆ دارشتوونو نموونەی بۆ هێناونەتەوە [٢] . دکتۆر (ئیحسان فوئاد) لە گۆڤاری (کۆلێجی ئەدەبیاتدا) ، باسێکی خۆی بەتایبەتی بۆ ئەم دوو کێشە تەرخان کردووەو ، لە شیعری تازەدا نموونەی بۆ هێناونەتەوە [٣] . مامۆستا (عبد الرزاق بیمار) یش لە چەندپێتی باسێکدا ، چڵاو چڵ ، ناوی بردوون [٤] . ڕەنگە لای هەندێکی تریش باس کرابن [٥] .

ئەشێ ئالێرەدا بووترێ : باشە خۆ باس کردنی عەرووز ، بگرە کێش بە گشتی ، بابەتێکی هەستیو ئەندێشەیی نی یە تا بەجۆری جیاوازو چێژی شیرنترەوە دەرببڕێ ، زانستێکی ئەوەندە بەربڵاوو ئاڵۆزیش نی یە تا بۆچوونو شی کردنەوەی زێدەتر هەڵبگرێ ، بەڵکو بریتیە لە کۆمەڵێك ڕەگەزو ڕێسای جێگیرو تایبەتی ، کەلە دوای یەك جار باس کردن هەرچی بووترێ ، زیادەیەو لە جوینەوەی کۆنەکە تێپەڕ ناکات . ئەی کەواتە ئەم باسە سوودی چی یەو ئەم قەوان لێدانەوەیەت لەچی ؟

بۆ ڕەوینەوەی ئەم پرسیارە چەند خاڵێك دەکەم بە بنەمای وەڵامەکەمو خۆمی پێ قنیات دەکەم جا نازانم تا چ ڕادەیەك سەری ڕەزامەندی خوێنەرم بۆ ئەبزوێنی .

یەکەم . ئەوانەی تا ئێستا لەم دوو کێشەیان کۆڵیوەتەوە ، مامۆستا ئەحمەد هەردی لێ دەرچی ، کە لە باسەکەی (برایەتی)دا کێشی

هەزەجی باش شیکردبۆوە ، بە تەواوی شۆڕنەبوونەتەوەو پەلیان نەهاویشتووە بۆ هەموو کە لە بەرەکانی .

دووەم : باسەکە هەندێك ڕەخنەو ئیزافەی تێدایە کە تا ئێستا نە خراونەتە ڕوو ، ئەمانەش لە دوو تۆی باسێکی ئاوادا نەبێت ناتوانرێ سەربەخۆ بلاوبکرێنەوە .

سێیەم : کێشی شیعر بە گشتی ، گۆشەیەکی زۆر بچووکی لە بایەخی ڕۆشنبیران داگیرکردووەو زۆر کەم لە سەر لاپەڕەی گۆڤار ڕۆژنامەکاندا خۆی دەنوێنیو ،ڕووناکبیری ئەمڕۆ ، بە تایبەتی لاوەکان ، فڕێیان داوەتە دەلاقەی کەمتەرخەمی‌یەوەوشارەزایی‌یەکی ئێجگار کەمیان تیادا هەیە . پاشان ماوەیەکی زۆریشە ئەم دوو کێشە بە شێوەیەکی سەربەخۆ نەخراوەتە بەر چاوی خوێنەران ، جا ئەگەر هەندێك لەکێشەکان لەوەو پێش باس کرابن ، پێم وابێت دوو بارە کردنەوەی ئەمڕۆ ، بێ کەڵك نابێت .

پێش ئەوەی بچمە سەر کێشە کان ، حەز دەکەم سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە ڕابکێشم کە لەم باسەدا بە پێویستم نەزانی لە (سەبەبو وەتەدو فاسیلە) بدوێم ، چونکە مامۆستا ئەحمەد هەردی لە باسەکەی خۆیدا لە گۆڤاری (برایەتی دا بە درێژی باسی کردوونو ، مامۆستا (بیمار) یش لە گۆڤاری (ڕۆشنبیری‌نوێ)دا لە ژمارە (١١٣ی ساڵی ١٩٨٧ لە لێکۆڵینەوەیەکی درێژدا ئەوانەی شیکردۆتەوە . هەرچی (زیحافو عیللەت یشە گەرچی تا ئێستا سەر بە خۆلێیان نەکۆڵراوەتەوە ، بەلام لەم باسەدا جێیان نابێتەوەو زیاد لە پێویست درێژی دەکەنەوە . خوا یاربێت لە لێکۆڵینەوەیەکی داهاتوودا لێیان دەدوێم . مایەوە ئەوە بڵێم لەم باسەدا منیش پەیڕەوی هەمان نیشانەم کردووە کە لای مامۆستایانی عەرووز باوەو بە کاریان هێناوە لە دەربڕینی برگەی کورتو درێژدا ، کە (ب) بۆ برگەی کورتو ، نیشانەی( ) بۆ برگەی درێژ بەکاردەهێنرێت .

**(١) کێشی ڕەمەل .**

ڕەمەل بەواتای ڕۆیشتنی خێرا دێتو بۆیە بەم ناوە ناونراوە ، چونکە بە هۆی بەدوای یەکدا هاتنی (فاعلاتن)ەوە ، خێرا لەدەم دێتە دەرێ [٦] . هەروەها ڕەمەل مانای بارانی کەمیش دەگەیەنێت [٧] . ئەم کێشە لە بنەڕەتدا لە عەرووزی عەرەبیدا بەم جۆرە هاتووە :

فاعلاتُن فاعلاتُن فاعِلاتُن [٨]

واتە ئەگەر بە برگەی درێژو کورت بیپێوین ، بریتیە لە ( - ب - - ) کە دووبارە بوونەوەی لە دێڕە شیعرەکەدا ، ئاهەنگێکی خۆش ئەدا بەپەردەی گوێداو زیاتر گوێگر ئەخرۆشێنێ بۆ وەرگرتنی ناوەڕۆکەکە . بۆیە لەبەرکردنی شیعرەکە ، بەوجۆرە ، ئاسانترەو لەئەنجامی بەدوای‌یەکدا هاتنی برگەی کورتو درێژ ، بە شێوەیەکی ڕێكو بەردەوام ، مەودای هەڵەکردنو بیرچوونەوە تەسك ترە .

**ڕەمەل لە شیعری کوردیدا :**

هەر تەفعیلەیەك پێی دەووترێت (هەنگاو) یان (پێ) . لە کوردیدا ئەم کێشە بە زۆری لە هەر نیوەدێڕێکدا چوار هەنگاوە ، واتە تێکڕا لەدێڕە شیعرێکدا هەشت هەنگاوە . بەلام تائێستا ، لە چەند شیعرێکی ئەم دوایی‌یەدا نەبێت ، بەشێوەیەکی تەواو بەکارنەهێنراوە ، واتە چوارجار یان سێ جار (فاعلاتُن) لە نیوە دێڕێکدا نەبینراوە . ڕەمەل لەشیعری کوردیدا بەم جۆرانە هاتووە :

(١) ڕەمەلی هەشت هەنگاوی مەحزوف :

لێرەدا (عەرووزوزەری) هەر بەیتێك ، واتە دوا هەنگاوی هەر نیوە دێڕێك ، گۆڕانێکی بە سەردا دێت کەپێی دەووترێت (حذف) . ئەمەش بریتیە لە لابردنی سەبەبی سووکی کۆتایی (فاعلاتن) ، کەلە (تن) پێکهاتووە ، پاش ئەوە (فاعلن)ی دەخرێتە جێ . ئەوسا کێشەکە لە هەرنیوە دێڕێکدا وای لێ دێت :

فاعِلاتن فاعِلاتن فاعِلاتن فاعِلن

سالم دەڵێ :

لێم گەڕێن با گۆشەگیر بم دەستە ئەژنۆ کەف زەنان
گێژە لووکەی بای نەدامەت تاری کرد صەفحەی جیهان [٩]

شی کردنەوەکەی بەم جۆرە دەبێت :

لێمگەڕێن/با گۆشەگیربم/دەستەئەژنۆ/کەفزەنان
گێژەلووکەی/بای‌نەدامەت/تاری‌کرد/صەفحەی جیهان

فاعِلاتن فاعِلاتن فاعِلاتن فاعِلن
- ب - - - ب - - - ب - - - ب -

مەحوی دەڵێ :

سەرکە جۆشێکی‌نەبێ من زرکە تاڵم بۆچیە
دڵکە هۆشێکی نەبێ شیشەی بەتاڵم بۆچیە [١٠]

بێکەس دەڵێ :

داری ئازادی بەخوێن ئاونەدرێ قەت بەرناگرێ
سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگرێ [١١]

هەردی دەڵێ :

فتنە دووچاوی مەستت ، پڕتەپیسمی جوانی‌یە
پڕ شەرابی کامەرانی‌و عەرەقی بەردەنی‌یە [١٢]

**(٢) ڕەمەلی شەش هەنگاوی مەحزوف**

لەهەر نیوەدێرێکدا ، لە جیاتی چوار ، سێ جار تەفعیلەکە دوبارە دەکرێتەوە :

فاعِلاتن فاعِلاتن فاعِلن

رەمەل بەم جۆرە ، بەکارهێنانی کەمترە لە جۆرەکانی تری .

حاجی قادری کۆیی دەڵێ :

تاجی «بسم الله رحمن الرحیم»
نامەسەر بۆ دەفعی شەیتانی رەجیم
ماجەراێکم هەیە بێ بێش و کەم
هیچ درۆی تێدانی یە بابۆت بکەم[13]

بەم جۆرە شی دەکرێتەوە :

تاجی بسمیل/لاهی رەحما/نی ررەحیم
نامەسەربۆ/دەفعی شەیتا/نی رەجیم
فاعِلاتن فاعِلاتن فاعِلن
-ب - - -ب - - - ب -

سالم دەڵێ :

هەر طرف شەمعی روخی جانانەیە
گەردی ئەو دائیم وەکو پەروانەیە
دەست لە تۆ هەڵناگرم تانەمکوژن
حەرفی ناصح سەربەسەر ئەفسانەیە

هەندێك جار کێشەکە لەوەش کورتتر بەکارهێنرێت ، بەلابردنی هەنگاوی تر بەپێی هەلبژاردنی شاعیر ، ئیتر تەفعیلە تەواوەکە بێت یان مەحزوفەکە . بۆ روونکردنەوەی ئەمە ، ئەم کۆپلە شیعرەی (گۆران) شی دەکەینەوە ، کەتیایدا بەچەند جۆرێك کێشی رەمەلی بەکارهێناوە . ئەمەش مامەڵەکردنێکی نوێیە لەگەڵ ئەم کێشەداو ، دەرچوونە لەوئەندازە عەرووزی یەی کە شاعیران خوویان پێوە گرتووە لە شیعرەکانیاندا .

ئۆف هەزار ئۆف ! ئاخ ، هەزار ئاخ ! تاقیامەت ئاخ و داخ !
من کە سنگم بەردە ، طبعم بەرزە چەشنی شاخ و داخ ،
من کە خوێنم ئاگرە ،
چوونە جۆشم حازرە ،
من کەمایەی فەخری تەئریخی بەرووم ،
تاقەرەنگی ئابرووم
مەردی بێ باکی دلێری بوو هەموو ...
کوا ؟ مەگەر ئەصلی نەبوو ؟
ئۆف ، هەزار ئۆف ! ئاخ ، هەزار ئاخ !
نەگبەتی کوردی هەژار ، ئاخ[14]

کێشانی دێرە شیعرەکان یەك لە دوای یەك بەم جۆرەیە :

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلن
فاعلاتن فاعلاتن
فاعلاتن فاعلاتن

لێرەدا ئیستێك دەکەین و لە ئاستی چەند سەرنج و رەخنەیەکدا دەوەستین . دکتۆر کامل بەسیر لە کتێبی (رەخنە سازی یەکەیدا لەبەشی (مۆزو ئاوازی هۆنراوە)دا ، باس لەکێشی شیعرێکی دەکات کە رەمەلەو دەڵێ :

(..بۆیە هەستیارەکەی عەرووزی بەحری رەمڵی هەلبژاردوە کە لە هەرە بەحرە درێژەکانی ئاوازی هۆنراوەی عەرەبی یە ..)[15] .

لە کوردیدا کە ووشەی (هەرە) دەخرێتە پاڵ ئاوەڵناوێکەوە ، دوا پلەی بەراوورد دەگەیەنێت جا لێرەدا (هەرە) خراوەتە پاڵ ئاوەڵناوی (درێژ) ەوەو . ئەمانیش ئیزافەکراونەتە سەر ناوەکەکە بەحری رەمەلە ، واتە بەحری رەمەل درێژترین کێشەو لەو درێژتر نی یە . ئەگەر مامۆستا مەبەستی لە شیعری عەرەبی سەر بە عەرووز بێت ، چونکە دەڵێ (لە هەرەبەحرە درێژەکانی ئاوازی هۆنراوەی عەرەبی یە ..)[16] ، ئەوا لە شیعری عەرووزی عەرەبیدا کێش هەن کە لە رەمەل درێژ ترن چونکە رەمەلی تەواو لە عەرەبیدا لە هەر نیوە دێرێکدا بریتیە لە سێ جار (فاعلاتن) ، واتە (١٢) برگە . لە کاتێکدا دوو کێشی (وافر)و (کامل) لە هەر نیوە دێرێکدا بریتین لە (١٥) برگە . بەلام ئەگەر دکتۆر مەبەستی لە شیعری کوردی سەر بە عەرووز بێت و ئەوەش کە لە کۆتایی دەربڕینی ناوبراود

ووتێتی ، تەنیا بۆ ئەوە بێت ئاگادارمان بکات کە ئەو کێشەی ئەو باسی دەکات سەر بە عەرووزی عەرەبی‌یە ، چونکە ئەو باس لە شیعرێکی کوردی دەکات ، ئەوا کێشی (هەزەج) لە کوردیدا لە هەموو کێشەکانی تر درێژترەو بریتیە لە [١٦] بڕگە ، لە کاتێکدا رەمەل[١٥] بڕگەیە .

پاش ئەوە مامۆستا دێتە سەر شی‌کردنەوەی دێڕە شیعرێك کە دەڵێ :

بەختەکەم بە د بەختو شوومە سەر لەهەر ڕێگەی بێم
ئارەزووم ئاوی حەیات بێ کانی مانگا دێتە ڕێم

بەم جۆرە دەیپێوێت :
فاعِلات/ فاعِلات/ فاعِلات/ فاعِلات
فاعِلات/فاعِلات/فاعِلات/فاعِل[١٧]

مامۆستا بەسیر ئەم تەفعیلانەی داناوە ، بە بێ ئەوەی سەرو بۆریان بخاتە سەر ، واتە دیاری نەکراوە پیتی کۆتایی (فاعلات) نەجوولاوەبان بۆری لەسەرە ، بەڵام لە بەرئەوەی هەر هەنگاوێك لە (حشو)[١٨]ی بەیتەکەدا بریتە لە (٤) بڕگە ، دیارە مەبەستی لە (فاعلات)ەکەیە .

هەروەها لە دوا تەفعیلەی دێڕەکەدا (فاعل)ی نووسیوو کە دیارە بۆری لەسەرە ، چونکە برێتە لە (٣) بڕگە . بەم پێیە دوا بڕگەی تەفعیلەکان هەموویان کورتن ، لە کاتێکدا بەرامبەرەکانیان لە شیعرەکەدا درێژن ، تەنیا لە یەکێکیاندا نەبێت کە پشووی دەکەوێتە سەرو درێژ دەکرێتەوە .

پاشان مامۆستا لە یەکەم نیوە دێڕی شیعرەکەدا (ی)ەیەکی زیادەی خستۆتە سەر ووشەی (ڕێگا) ، واتە (ڕێگایی)ی نووسیوە ، دیارە لە بەر ئەمە شە عەرووزی نیوە دێڕی یەکەمی بە (فاعلات) داناوە . ئەمە لە لایەکەوە کێشی نیوە دێڕەکە تەمەڵ دەکات‌و لە لایەکی تریشەوە کێشی دێڕەکە بە گشتی لەنگ دەکات ، چونکە ئەو کاتە دەبێت بەرامبەر (گایی بنێم) ، (فاعلن) دابنرێت کە ئەمەش لە کێشەکە لادەدات‌و بڕگەیەکی تر دەخاتە سەر نیوە دێڕی یەکەم وهاوسەنگی شیعرەکە تێك دەدات ، لەبەر ئەوە ئەو(ی)ە زیادەیە ، هەروەکو مامۆستا خۆشی لە شوێنێکی تردا ڕاستی کردۆتەوە .

کەرت‌کردنی ڕاستی شیعرەکە بەم شێوەیە دەبێت :

بەختەکەم بەد/بەخت‌و شوومە/سەر لە هەر ڕێ/گەی بنێم
ئارەزووم ئا/وی حەیات بێ/کانی مانگا/دێتە ڕێم
فاعِلاتن / فاعِلاتن / فاعِلاتن / فاعلن

دکتۆر ئیحسان فوئاد لەو باسەدا کە پێشتر ناومان برد ، بەم جۆرە تەفعیلەکانی کێشی رەمەل دەنووسێت :

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلُ[١٩]

واتە دوا بڕگەی هەنگاوی کۆتایی بەکورت داناوە ، کە ئەمە هەڵەیەکی ئاشکرایە ، چونکە بە هیچ جۆرێ بڕگەی کورت لە کۆتایی شیعرەوە نایەت . با نموونە هەر لەو شیعرانەوە وەرگرین کە دکتۆر شی‌کردوونەتەوە . دوا هەنگاوی شیعرەکە ، کە هی مامۆستا هەردی‌یە ، بریتیە لە (نێتەوە)و دکتۆر بەم جۆرەی داناوە : (– ب ب) . واتە بڕگەی (وە)ی بەکورت داناوە . ئەم دانانە ڕاست بوو ئەگەر ئەو بڕگەیە لە شوێنێکی تردا بوایەو ڕاستەوخۆ بڕگەی تری بە دوادا بهاتایە ، بەڵام کە کەوتە کۆتایی‌یەوە ، وەستان‌و پشوویەکی دەکەوێتە سەر کە بمانەوێت‌و نەمانەوێت ، یان بە (وا) لە دەم دێتە دەرێ یا بە (وەهـ ،) ، کە ئەو (هـ)ەیە لەگەڵ هەناسەکەدایەو زۆر هەستی پێناکرێت . دکتۆر ئەم هەڵەیە لە هەموو نموونەکانی تریشدا دووبارە دەکاتەوە ، کە لە یەکێکیاندا بڕگەی کۆتایی پێك‌هاتووە لە (کەم) کە ئەمە ئاشکرایە بڕگەیەکی درێژە .

مامۆستا حەسیب قەرەداخی لە لێکۆڵینەوەیەکدا بە ناوی (سالم لە ڕێبازی کلاسیزمدا) دەربارەی چەند کێشێکی شیعرەکانی سالم دواوەو لە کێشانی ئەو شیعرەدا کەدەڵێ (لێم گەڕێن باگۆشە ..) تەفعیلەکانی ڕاست نووسیوە ، کە چی ناوی کێشەکەی بە (خەفیف)[٢٠] بردووە ، لە کاتێکدا کێشەکە رەمەلەو لە سەرەتادا شیمان کردەوە .

**(٣) کێشی ڕەمەلی مەخبوونی مەحزوف :**

من بەش بە حاڵی خۆم تا ئێستا ئەم جۆرەی کێشی رەمەلم لە شیعری عەرەبیدا نەبینیوە ، ڕەنگە ئەگەر بشبێت زۆرکەم بێت . شاعیرانی کورد ، بەتایبەتی شاعیرانی سەدەی پێشوو، کەم‌و زۆر شیعریان پێ هۆنیوەتەوەو ئەشێ هەر لە شیعری فارسی‌یەوە وەریان گرتبێ. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم کێشە لە دیوانی شاعیرە کلاسیکی‌یەکاندا، ژمارەیەکی تا ڕادەیە زۆر لە شیعرەکانیان بۆ خۆی ئەپچڕێ، بەڵام تا ئێستا، من ئاگام لێ‌بیت، کەس لێ‌ی نەدواوە . ئەو گۆڕانەی لەم کێشەدا ڕوویداوە ، ئەوەیە کە پاش ئەوەی دوا هەنگاوی کێشەکە (حەزف)ی بەسەردا هاتووە، (خەبەن) بە سەر تەفعیلەکاندا هاتووە، واتە لابردنی پیتی دووەمی نەجوولاو (ساکن) لە یەکەم سەبەبی سووکی تەفعیلەکە کە ئەویش (ئەلفە). بە جۆرێکی تر بڵێین، ئەلفی بڕگەی یەکەم لە تەفعیلەکە لابراوە تا لە بڕگەی درێژەوە بکرێ بە کورت، ئەو کاتە بەم جۆرەی لێ‌دێت: (ب‌ب – –). ئەم گۆڕانەش کەمتر دەچێتە سەر هەنگاوی یەکەمی نیوە دێڕەکان‌و شاعیر بەپێ‌ی پێویست لە شیعرەدا ناو بەناو . ئەم گۆڕانەی بەسەردا دێنێت . کەواتە کێشەکە بە گشتی بەم جۆرەی لێ‌دێت :

فاعِلاتن فَعِلاتن فَعِلاتن فَعِلن
– ب – – ب ب – – ب ب – – ب ب –

سالم دەڵێ :

ڕۆژی دڵ هەر شەوی تا ڕەچ لە مێ بێ چ لەوێ
منزڵی گێسوی یارەچ لە مێ بێ چ لەوێ
گوشە گیرم لە فیراق‌و لەو صاڵ مەیخەرەڵا
جایی من هەردوو لە نارەچ لە مێ بێ چ لەوێ

بەم جۆرە کەرت دەکرێت :

ڕۆژی دڵ هەر/شەوی تارە/چ لە مێ بێ/چ لەوێ
مەنزڵی گێ/سوی‌یارە / چ لەمێ بێ /چ لەوێ
فاعِلاتن/ فعِلاتن / فَعِلاتن فَعِلن
- ب - - ب ب - - ب ب - - ب ب -

حاجی قادر دەڵێ :

ئەو فەلەك ڕیفعەتە هەر لە حزەنیقابێکی هەیە
کێ دەزانێ وەکوو من خانە خەرابێکی هەیە

تا دەڵێ :

شیعرەکانم کە غەریبی وەتەن‌و نەو سەفەرن
وەرە بیخوونەوە ئەم نوقتە ئەوابێکی هەیە

ئەگەر سەیری دێری دوایی شیعرەکە بکەین ، دەبینین نیوە دێری دووەم
وەرە بیخوو/نەوە ئەم نوق/تە ئەوابێ/کی هەیە
بەم شێوەیەیە : فَعِلاتن فَعِلاتن فَعِلاتن فَعِلن
ب ب - - ب ب - - ب ب - - ب ب -

هەنگاوی یەکەم بریتیە لە (فعلاتن) واتە مەخبونە ، بەڵام تێکرای دێرەکانی تر بە (فاعلاتن) دەست پێ‌دەکات . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە شاعیر بۆی هەیە لە کاتی پێویستدا ، بە پێی زیحافەکە ، دەستکاری تەفعیلەکان بکات .

ئەم کێشەش زۆر جار هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی لادەبرێت ، واتە لە هەر دێرە شیعرێکدا دەبێت بە شەش هەنگاو . بۆ نموونە نالی دەڵێ :

عومری بێ حاسیلی من چوو بە عەبەس
ئەمەلم هەرچی هەبوو بوو بە عەبەس [٢١]

ئەم کێشە ، لە پاڵ ئەو گۆڕانانەی کە باسمان کرد ، گۆڕانێکی تری بەسەردا دێت کە پێی دەووترێت (بەتر) . ئەو کاتە کێشەکە بەگشتی پێی دەووترێت (رمەلی مەخبوونی مەحزووفی ئەبتەر) .

(بەتر)یش یەکێکە لە عیللەتەکان‌و دەچێتە سەر (عەروز)یان (زەرب)ی دێرەکە ، واتە دوا هەنگاوی نیوە دێرەکان . ئەم گۆڕانەش لە کۆبوونەوەی (حەزف)و (قەتع) پێك‌دێت ، واتە تەفعیلەی دوایی کێشەکە ، پاش (حەزف) (قەتعی) بەسەردا دێت ، کە بریتیە لە لابردنی پیتی نەجووڵاوی وەتەدی تەفعیلەکە کە (نوون)ە کەیەو پاشان (تەسکین) کردنی پیتی پێشەوەی کە (لام)ەکەیە . ئەنجام تەفعیلەکە دەبێت بە (فاعل) ، ئەوسا (فعلن)ی دەخرێتە جێ . با سەیری ئەم شیعرەی نالی بکەین :

دڵ دەڵێ سەیری چەمەن خۆشە جەوابی نادەم
موددەتێکە لە قەفەس دابە عەزابی نادەم
مەجلیسێکی چەمەن‌و بلبل‌و بەزمی گوڵ‌و موڵ
بە دوو سەد مەدرەسەوو دەرسی کیتابی نادەم

تا دەڵێ :

تەلەبی سینەبی چاکم مەکە بەو چاوانە
سینەکەم چاکەبە ئینسانی خەرابی نادەم

شی‌کردنەوەی دێری یەکەم بەم جۆرەیە :

دڵ دەڵێ سەیـ/ری چەمەن خۆ / شەجەوابی / نادەم
موددەتێکە/ لە قەفەس‌دا/بەعەزابی/نادەم
فاعِلاتن / فَعِلاتن / فَعِلاتن / فَعْلن
- ب - - /ب ب - - /ب ب - - / - -

بەڵام ئەگەر سەرنجی دێرەکانی تر بدەین ، تەنیا لە یەك جێگەی تردا نەبێت ، هەموو (عەرووز)ی شیعرەکە مەخبوونە ، واتە بریتیە لە (فعلن) ، لە کاتێکدا (زەرب)ەکانیان ئەبتەرە ، واتە (فعلن)ە . ئەگەر هەر عەرووزی دێری یەکەم ئەبتەر بوایەو هەموو ئەوانی تر لە شیعرەکەدا مەخبوون بوایە ، دەمانتوانی بڵێین ئەمە پەیوەندی بە قافیەوە هەیەو بۆیە عەرووزی یەکەم بەو جۆرە دانراوە ، تا لەگەڵ زەربەکەیدا کەم‌و زیادی نەبێت‌و قافیە یەکە لەنگی تێ‌نەکەوێت ، ئەمەش لە زانستی عەرووزدا بە (تەصریح) ناو دەبرێت . بەڵام لە دێری پێنجەمی شیعرەکەدا هەمانشت ڕوودەداتەوەو (عەرووز)ە کە دیسان ئەبتەرە ، کە ئەم جارەیان ناتوانین بیبەستینەوە بە قافیەکەوە :

تەلەبی سی/نەبی چاکم/مەکە بەوچا/وانە
فَعِلاتن فَعِلاتن فَعِلاتن فَعْلن

لەمەوە ئەوە دەرەنجام دەکەین کە شاعیرمان خۆی نەبەستۆتەوە بەو یاسایانەوە ، کە شاعیرانی عەرەب پەیڕەوی‌یان کردووە . بەڵکو بە پێی پێویست (عەرووز)ەکانی جارێ بە مەخبوونی‌و جارێ بە ئەبتەر بەکارهێناوە .

**(٢) کێشی هەزەج :**

ئەم کێشە ناونراوە (هەزەج) چونکە لە زرنگانەوەی دەنگ دەچێت . بەوەی دوو سەبەبی سووك بە دوای وەتەدەکاندا دێت . ئەمەش یارمەتی

دریژبوونەوەی دەنگەکە دەدات . هەروەها ووتراوە بۆیە ناونراوە هەزەج ، چونکە عەرەب گۆرانی پیّ‌دە لیّت ، هەروەها هەزەج جۆریّکە لە گۆرانی [٢٢] .

مَفاعیلن مَفاعیلن مَفاعیلن

ب ب ب

بەم شیّوەیە ، بە پیّی شویّنی برگەی دریّژو کورت ، تریەیەکی ریّك‌و ئاوازیّکی خۆش درووست دەبیّت کە هەرچی بۆ کیّش رەمەل ووترا لە سەرەتادا ، بۆ ئەمیش رەوایە .

هەزەج لە شیعری کوردیدا :

ئەمیش وەکو زوربەی کیّشەکانی تر ، لە شیعری کوردیدا هەشت هەنگاوەو کەمتریش شەش هەنگاوە . سروشتی زمان وفۆنەتیّکی کوردی ، زیاد لە هەر کیّشیّکی ، لەگەلّ هەزەج‌دا دەگونجیت ، بۆیە پیّی بە پیّی ئەو بەکارهیّنانیشی فراوانەو تا ئەمرۆ هەندیّك لە شاعیرانمان شیعری پیّ‌دەهۆننەوە . ئەم کیّشە لە کوردیدا بە چەند جۆریّك بە کارهیّنراوە ، لە هەندیّك‌دا تا رادەیەك دەستکاریکراوە ، لە ئەسلّە عەرەبی‌یەکە زۆر دوورکەوتۆتەوەو لە شیعری ئەواندا بەدی ناکریّ . تیّکرای جۆرەکانی هەزەجیش لە شیعری کوردیدا بری‌تیە لەمانە :

**(١) هەزەجی هەشت هەنگاو :**

تەفعیلەکانی بەم جۆرەیە :

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

مەلای جزیری دەلیّ :

ب ناریّ فیرقەتیّ صوهتم ژ فەرقیّ سەرحەتا پیّ‌دا
خەدەنگا غەفلەتێ نوهتم ژ بەر قالا میعاتیّدا
خەدەنگا فیرقەتیّ رەعدە دلیّ ئەو غەفلەتیّ لیّ دەت
دبیژم گەر جەبەل بیتن ب کەر بیّت دویّو گاڤیّدا [٢٣]

بەم شیّوەیە کەرت دەکریّت :

ب ناریّ فیر/فەتیّ صوهتم/ژفەرقیّ سەر/حەتا پیّدا
خەدەنگا غەف/لەتیّ نوهتم/ژبەر قالا/میعاتیّدا

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

ب - - - ب - - - ب - - - ب - - -

نالی دەلیّ :

لەدلّدا ئاتەشی عیشقت بلّیسەی میسلی تەندوورە
شەتی ئەشکم نەبیّ مانیع دەسووتیّم دەبمە کۆی نوورە

مەحوی دەلیّ :

بەنووری بادە کەشفی زوّلمەتی تەقوا نەکەم چیبکەم
بەشەمعیّکی وەها چاری شەویّکی وا نەکەم چیبکەم

گۆران دەلیّ :

هیوا ، مەگری ، هەنسکی نیوەشەو بەس هەلّدە ، بەس بگری
لەچاوی بیّ قەرارم بۆچی دەرمانی وەنەوز ئەبری ؟ ..

عەلی عارف ئاغا (شاری) دەلیّ :

لە داویّنی چیای ژینا منی ئاوارە وەستاوم
گەرەکمە سەرکەوم بۆکەل بەلاّم بیّ‌هیّزو داماوم [٢٤]

**(٢) هەزەجی شەش هەنگاوی مەحزوف :**

ئەم کیّشە لەهەر نیوە دیّریّکدا سیّ هەنگاوە ، بەلاّم لە شیعری کوردیدا دوا تەفعیلەی هەمیشە بە مەحزوفی هاتووە . واتە لابردنی سەبەبی سووکی (مفاعیلن) ، کە دەبیّت بە (مفاعی) ، ئەوسا (فعولن)ی دەخریّتە جیّ . واتە کیّشەکە وادەبیّت :

مفاعیلن مفاعیلن فَعولن

نالی دەلیّ :

نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بیّ‌تۆ
نەچم شەرتە هەتا ئەوخوارە بیّ‌تۆ
دەروونم خالّی‌یە وەك نەی دەنالیّ
هەواریّکی چ پڕ هاوارە بیّ تۆ

بەم جۆرە شی دەکریّتەوە :

نەمردم من/ئەگەر ئەمجا/رەبیّ تۆ
نەچم شەرتە/هەتا ئەوخوا/رەبیّ تۆ
مفاعیلن / مفاعیلن / فعولن
ب - - - ب - - - ب - -

کوردی دەلیّ :

شەوی یەلّدایە یا دەیجورە ئەمشەو
کە دیدەم دوور لە تۆیی نوورە ئەمشەو [٢٥]

حاجی قادری کۆیی دەلیّ :

هەموو عومومم لەریّی هات‌و نەهاتی
بەسەرچوو ئەی ئەجەلّ هەرتۆ نەهاتی

**(٣) هەزەجی هەشت هەنگاوی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزوف :**

ئەخرەب ئەو دوو گۆرانەیە بەسەر (مفاعیلن) دادیّت ، لە یەکەمیاندا

پێی (میم)ە کەی لێ دەکرێتەوە . واتە یەکەم پیتی وەتەدی کۆمەڵ ـەسەردتای تەفعیلەکەدا . ئەمەش بە (تشعیث) ناودەبرێت . دووەمیشیان (کف)ی پێ دەووترێت و لابردنی پیتی حەوتەمی نەجوڵاو دەگەیەنێت ، کە (نون)ەکەیە . کەواتە (مفاعیلن) دەبێت بە (فاعیلُ) ، ئەوسا (مفعول دەخرێتە جێ . ئەمە ئەو گۆڕانەبوو کە بەسەر یەکەم هەنگاودادێت . هەرچی دووەمو سێیەمە تەنها مەکفووف دەبن ، بەڵام دوا هەنگاو حەزفی بەسەردادێت و ئەمەش پێشتر باسکرا . کەواتە کێشەکە وادەبێت :

مفعولُ مَفاعیلُ مَفاعیلُ فعولُن

— ب ب — — ب — — ب ب — —

ئەم جۆرەی کێشی هەزەج لەشیعری عەرەبیدا نابینرێت ، بەڵام لە کوردیدا ژمارەیەکی زۆر شیعری پێ هۆنراوەتەو . نالی لەنێوان (١٢٠) شیعردا ، (٣٢) شیعری بەم کێشە ووتووە . بۆ نموونە لە موستەزادەکەیدا دەڵێ :

ئەی تازە/ جەوان پیرمو ئوفتادەوو کەوتووم تاماوە حەیاتم
دەستێ بدەرە دەستی شکستەم کەلەدەست چووم قوربانی وەفاتم

کە بەم جۆرە کەرت دەکرێت :

ئەی تازە/جەوان پیر/مو ئوفتادە/ووکەوتووم تاماوە/حەیاتم
دەستێ ب/ دەرەدەستی/ شکستەم کە/لەدەست چووم قوربانی/وەفاتم
مفعولُ / مفاعیلُ / مفاعیلُ / فعولن / مفعولُ / فعولن
— — ب ب — — ب ب — — ب ب — — — ب ب — —

وەفایی دەڵێ :

- لەورۆژە کە دووربۆتەوە سایەت لەسەری من
سووتاوە لەتاوت هەمووجانو جگەری من[26]

مەلاحەمدون یش قەسیدە درێژەکەی ، کەتیایدا باسی باری ناوچەکەی دەکات لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا[27] ، بەم کێشە ووتووە :

ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە کە عالەم شڵەژاوە
هەرکەس بەجەغاری جگەری قیمەکراوە
دنیا پڕی ئاشووبە خەلایق بەعوموومی
ئاسایشی لێ مەنعە ئەڵێی هێرشی ئاوە[28]

ئەم کێشەش وەنەبێ هەر لەسەدەی پێشوودا بەکارهێنرا بێ ، بەڵکو لای شاعیرانی ئەم سەدەیەش ناو بەناو شیعری پێ هۆنراوەتەوە . بۆ نموونە گۆران دەڵێ :

ئێوارەیە وا ، هەڵگرە ساگۆزەیی تازە
ڕێی کانی قوبان مونتەظیری جیلوەیی نازە
بەردەگەکەتان قیبلەیی ڕووی ئەهلی نیازە

ئێوارەیە وا هەڵگرە ساگۆزەیی تازە .

لەکۆندا ئەم کێشە زیاتر داستانو چیرۆکی پێ هۆنراوەتەوەو ئەحمەدی خانی یش (مەموزین)ی هەر بەم کێشە هۆنیوەتەوە ، بەڵام لای ئەم شەش هەنگاوەو هەنگاوی دووەمیشی لەجێی (مەکفووف) ، (مەقبووضە) ، واتە لابردنی پیتی پێنجەمی نەجوولاو لە (مفاعیلن) ، ئەوکاتە دەبێت بە (مفاعلن) ، هەروەکو مامۆستا بیاریش لە گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)دا باسی کردووە[29] ئێمەش هەر ئەو پارچەیە لەداستانەکە وەردەگرین و شی دەکەینەوە :

سەر نامەیی نامە نامی ئەڵڵاە
بێ نامی وی نا تەمامە وەڵڵاە
ئەی مەتلەعی حوسنی عیشقبازی
مەحبوبی حەقیقی و مەجازی
نامی تە بەلەوحی نامە یاعیشق
ئیسمی تە بە نەقشی خا مەیاعیشق

بەم جۆرە کەرت دەکرێت :

نامی تە / بەلەوحی نا / مەیاعیشق
ئیسمی تە / بە نەقشی خا / مەیاعیشق
مفعولُ / مفاعلن / فعولن
— — ب ب — ب — ب — —

(٤) هەزەجی هەشت هەنگاوی ئەخرەب :

لێرەدا هەنگاوی یەکەم سێیەم (خەرب) یان بەسەردا دێت و دەبن بە (مفعولُ) :

مفعولُ مفاعیلن مفعولُ مفاعیلن

ئەم کێشە ئاهەنگێکی خۆشی هەیەو لە کێشی بڕگەی (٧ – ٧) دەچێت ، چونکە لەکاتی خوێندنەوەدا پشوو دەکەوێتە نێوان هەنگاوی دووەم و سێیەمەوە . نالی دەڵێ :

سەودا سەرەکەی زوڵفت ، ئەزهاری لەکن پەشمە
دوور لەو گوڵە یەعنی ڕووت ، گوڵزاری لەکن پەشمە

شیکردنەوەکەی :

سەوداسە / رەکەی زوڵفت / ئەزهاری / لەکن پەشمە
دوورلەوگو / لەیەعنی ڕووت / گوڵزاری / لەکن پەشمە
مفعولُ / مفاعیلن / مفعولُ / مفاعیلن

ئنجا ئەگەر شاعیر ووشەیەکی هاوبەش کرد لە نێوان هەنگاوی دووەم و سێیەمدا ، ئەوا ئاهەنگی کێشەکە تێك دەچێت ، چونکە ئەو کاتە ووشەکە وەکو (مدەووەر) یێك دەبێت لە نیوە دێرێکدا . (مدوّر) یش ئەوەیە کە ووشەیەك هاوبەش بێت لە هەردوو نیوە دێری دێرە شیعرێکدا ، ئەمەش لە شیعری کوردیدا ڕێکەوتی نەکردووە . بەڵگەش بۆئەوەی شاعیران بایەخێکی زۆریان بەو وەستانو پشووە داوە کە لەنێوان دوو نیوە دێرێکدا هەیە ، هەر ئەم شیعرەی نالی لە دێرێکی تردا شی دەکەینەوە :

سۆفی کە گرانبارە ، بێ مەغزو سەبوبکارە
سووف پۆشی غەمی بارە ، ئەوباری لەکن پەشمە

ئەگەر سەرنج بدەین ، دەبینین هەنگاوی دووەم چوارەم هەم لە نیوە دێری یەکەمداو هەنگاوی دووەم لە نیوە دێری دووەمدا ، هەموو کۆتایی‌یەکانیان یەك قافی‌یە یان هەیە (گرانبارە ، سەبوبکارە ، بارە) ، کە هەمان‌شت لەتێکڕای شیعرەکەدا دووبارە دەبێتەوە . نالی لەچەند شیعرێکی تریشدا ئەم سنعت کاری‌یەی کردووە . ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم وەستانە لەنیوەی هەرنیوە دێرێکدا گرنگە ، بگرە (مفعول مفاعیلن)بەجۆرێك مامەڵەی لەگەڵدا کراوە ، وا دەزانرێت نیوە دێرێکی سەربەخۆیە .

سالم لەبارەی میرزا سلێمانی زین درووەوە ، دەڵێ :

میرزا وەرە لێم لادە ، دەستی منو دامانت
ئەیمەن مەبە لێم نەك بێم ، یەك‌دەفعە بە مەیدانت
تۆقازو ئەمن شاهێن ، مەقرێنە بە دەورەمدا
نەك حەملابەرم گیرکەم ، چنگێ لە چقڵدانت

ئەم کێشەش دیسان وەکو پێشووی ، لە شیعری عەرەبیدا بەرچاو ناکەوێت لەکۆتاییدا دەڵێم (لێکۆڵینەوە) خەرمانێکە ، گێرەو شەنو کەوی گورجی‌و ماندووبوونێکی فرەی دەوێ تاسوور دەبێ ، چ جایێ خەرمانەکە عەرووزیش بێت . منیش سەرەتامەو ئەمە یەکەم‌جارە دەست بدەمە خامەی لێکۆڵینەوە ، وەکو دەڵێن کاملی هەربۆ خوایە ، ئێنجا باسەکە هەچ هەڵەو کەم‌کورتی‌یەکی تێدا بوو ، داوای لێبوردن دەکەم هیوادارم تێڕوانینێکی سنگ فراوانانە لەچاوی سەرنج دەرەوە بڕۆژێتەوە .

**پەراوێزەکان :**

(١) د . کامل حسن البصیر/شێخ نوری شێخ صالح – ل٣٩
(٢) بروانە گۆڤاری (بریەتی) ژمارە (١٠) ١٩٧١
(٣) گۆڤاری (کۆلیجی ئەدەبیات) ژمارە (١٥) ١٩٧١ / ١٩٧٢

(٤) گۆڤاری (ڕۆشنبیری‌نوێ) ژمارە (١١٣) ساڵی ١٩٨٧
(٥) چەند نووسینو کتێبێش کە لەسەر عەرووز نووسراون ، داخەکەم لەبەرئەوەی دەستم نەکەوتن ، باش ئاگاداریان نیم . وەکو نەوبەهاری ئەحمەدی خانی‌و کتێبی (کێش‌و قافیە لەشیعری کوردیدا)ی مارف خزنەدارو (نرخ شناسی)ی عەلادین سەجادی‌و هی تریش .

(٦) بروانە : فن التقطیع الشعري والقافیة د . صفاء الخلوصي – بغداد / ١٩٦٣
(٧) بروانە : علاء الدین سجادی ئەدەبی کوردی‌و لێکۆڵینەوە لەئەدەبی کوردی – بغداد / ١٩٦٨ ل ١٢٩

(٨) السید أحمد الهاشمي میزان الذهب في صناعة شعر العرب – بیروت ١٩٧٩
(٩) دیوانی سالم چاپی هەولێر – ١٩٧٢ . هەموو شیعرەکانی تریشی لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراون .

(١٠) دیوانی مەحوی مەلا عبدولکەریمی مودەریس‌و محمدی مەلا کەریم . هەموو شیعرەکانی تریش لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراون .
(١١) دیوانی بێکەس محمدی مەلا کەریم – چاپی سێیەم – بغداد ١٩٨٦

(١٢) ئەحمەد هەردی ڕازی تەنیایی – چاپی دووەم ١٩٨٤

(١٣) دیوانی حاجی قادری کۆیی سەردار حەمید میرانو کەریم مستەفا شارەزا ١٩٨٦ . هەموو شیعرەکانی تریشی لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراون .

(١٤) سەرجەمی بەرهەمی گۆران – دیوانی گۆران – بەغدا ١٩٨٠ . شیعرەکانی تریش لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراون

١٥) بروانە : د . كامل حسن البصير رەخنە سازی – بەغدا ١٩٨٣ – ل ١٩٥

١٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

(١٧) بروانە هەمان سەرچاوی پێشوو .

(١٨) لە بەیتێكدا دوا تەفعیلەی نیوە دێری یەكەم پێی دەووترێت (عەروز)و بەدووەم دەووترێت (زەرب) هەرچی تەفعیلەكانی ترەلەهەر دوو نیوەكەدا پێیان دەووترێت (حشو) .

(١٩) بروانە گۆڤاری (كولێجی ئەدەبیات) ژمارە (١٥) ل ٨

(٢٠) بروانە : دیداری شیعری كلاسیكی كوردی حەمە سەعید حەمە كەریم – ١٩٨٦ ل ٤٤

(٢١) دیوانی نالی فەرهەنگی نالی د . مارف خەزنەدار . هەموو شیعرەكانی تریشی لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراون

(٢٢) د . صفاء الخلوصي – بروانە هەمان سەرچاوەی پێشوو .

(٢٣) شیعرەكەم لە كتێبی (دیداری شیعری كلاسیكی كورد) یەوە وەرگرت ل ٢١٢ .

(٢٤) عەلی عارف ئاغا (شاری بەرهەمی خاوێن).

(٢٥) شیعرەكە نازانرێ خاوەنەكەی نالی‌یە یان كوردی‌یە ، بەلام زوربەی لێكولەرەوان بۆئەوە دەچن كەهی كوردی بێ . شیعرەكەم لەگوڤاری كوری زانیاری كورد ژمارە (٥) ساڵی ١٩٧٧ وەرگرت .

(٢٦) دیوانی وەفایی محمد عەلی قەرەداخی

(٢٧) بروانە علاء الدين سجادی ئەدەبی كوردی‌و لێكولینەوە لەئەدەبی كوردی

(٢٨) شیعرەكەشم هەر لەو كتێبەی مامۆستا عەلاءالدین‌ەوە وەرگرتووە . ل ٢٢٤

(٢٩) بروانە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە ١١٣ ساڵی ١٩٨٧

# كەلەپوورو دیوانا ل خەلكی تەحلێ ل من شرینێ

حجي جعفر

كەلەپوور هێزەكا نەپەنی‌یە . كارێ هۆزانڤانی . بـكارێ بەری ویڤە گرێدەت [١] . ئانكو فولكلۆر دەنگێ ڤەدانا دەمێ بەرێ‌یە . لـ هەمان دەمدا دەنگێ نهۆیە ژی [٢] . لەوما نڤیسەڤان‌و هۆزانڤانێ نهۆ نەشێت ئەفراندنێ دبەرهەمێ خۆدا بكەت بێ بكارهینانا فولكلوری . بەرهەمێ لـ بەر دەنگێ عەمێ گۆزێ‌و ئەعلیخانا گۆڤەنی‌و میرزا محمد ....نەكەڤتە چەپا . بەرهەمەكێ بێ تامو خرشە . لەو داخوازێ ژ نڤیسەڤان‌و هۆزانڤانێت كورد دكەین بزڤرنە زۆزانا . چاڤێت خۆ بـ ئاڤا كەڤیا بشون . مەبەست بڤێ داخوازێ ئەفراندنە . نەكو زڤرینە بۆ پاشڤە . چونكی مەزن‌ترین نڤیسەڤان‌و هۆزانڤانا ئەفراندن بڤێ رێكی‌ڤە كریە . وەكو (پوشكین . تولستوی) . یێت كو كەڤتینە بن كارتێكرنا كارێت فولكلوری [٣] . هۆزانڤانێ ئەلمانی بناڤـو دەنگێ (گوتە)یی . پویتە دایە چیرۆك‌و چیڤانوكا دهۆزانا خۆدا [٤] .... هۆزانڤانێت عەرەب وەكو . بدر شاكر السياب . بلند الحيدري . حسب الشيخ جعفر . عبد الوهاب البياتي .... فولكلور دهۆزانێت خۆدا حەلاندیە [٥]

نەك هەر چیرۆك‌و هۆزانێ سودو قازانج ژفولكلۆری كریە . بەلكو شانۆ و شانۆگەرێ ژی . ئاڤ ژكانیكێت فولكلوری ڤەخواریە . هەرچەندە لنك مە هێشتا شانوێ لێڤێت خۆ پێ تەر نەكرینە . لێ لـ ئەوروپا . لـ چەرخێ شانزدێ (شكسبیر) . قازانج ژفولكلوری كریە ژبۆ پێش‌ئێخستنا شانوێ [٦]

ژبلی هندێ كو فولكلور هونەرێ هۆزانێ بەرزو بلند دكەت . ملەتێ پرت برتو بەلاڤە ژی دگەهینتە ئێك‌ونێزیكی هەڤ‌دكەت . چونكی فولكلور روحا هەمی ملەتیە ... [٧] بێگومان شاعرێت كورد ژی . (كلاسيكی‌و نوی) . قەدرو بهایێ فولكلوری زانیەو دهۆزانێت خۆدا بكارهینایە . – هەر

ئێکی . لدویڤ شیانو شەهرەزایا خۆ - [٨] مزوری ژوان هوزانڤانایە .یان بێژین سەرکێشێ هۆزانڤانێت کەڤن و هەڤچەرخە . دڤێ بابەتیدا . چونکی (ژهەمی هۆزانڤانێت کەڤن و هەڤچەرخ . پتر خوە نوقم کریە . ددەریا فولکلوری دا [٩] دیوانا لبن دەستێ مە لخەلکی تەحلێ . لمن شرینێ - پری کەلەپووریێ بابو کالایە . ژبیروهزرا بگرە هەتا گەهـ دگەهتە خرومرێت فولکلوری . هەتا بۆ دیوانا خۆ ژی ناڤو نیشانەك فولکلوری دانایە . بۆ خۆشکرنا قەلەمی ئەمێ ڤێ دیوانێ پشکەبنە سەر :

١ مزوریو گوتنێت خەلکی - الفاظ شعبية -
٢ مزوریو پەژن - کنایە -
٣- مزوریو ستران
٤- مزوریو ئەفسانەو بیروباوەر
٥- مزوریو چیرۆك - حكايات وقصص شعبية-
٦- مزوریو مێژوو .
٧- مزوریو رەوشتو تیتال - عادات و تقاليد-
٨- مزوریو خرومرێت فولکلۆری .
٩- مزوریو هۆزانڤانێت کلاسیکی

**١- مزوریو گوتنێت خەلکی :**

مەبەستا مە بگوتنێت خەلکی ئەو گوتنن ، یێت کو دناڤ خەلکیدا دبەلاڤو دژینا خۆ یا رۆژانەدا بکارتینن ، ئەڤ گوتنە نە (پەژن - کنایە - . نە گوتنێت مەزنانن - امثال شعبية) ، بەلکو ئاخفتنێت سادەو ساکارن . چ چیرۆکو سەرهاتی ژبۆ نینن .... هەرچەندە رایا هۆزانڤانەکێ وەکو (رامبوی) ئەوە ، کو هۆزانڤان دڤێت ، خۆ ژگوتنێت خەلکی رزگارکەتو بزمانێ خەلکی هۆزانا نە ڤەهینیت ، بەلکو بزمانەکی ڤەهینیت ، کو بشێت راستیو دروستیێ دیار بکەت ، چونکی ئەڤ زمانێ دوماهیێ . دێ هێزو شیانێت هۆزانڤانی پەقینیتو دەرئێخێت . [١٠] دگەل ڤێ چەندێ ، مزوری وەسا دەرئێخستیە ، کو چەند نێزیکی خەلکی بیت ، دێ خەلك پتر دوی گەهیتو ئەو دێ پتر دخەلکی گەهیت ...

زمانی قالبێ بیروهزرایە ، بیروهزرێت دگەهشتیو ئاشکرا ، دکەڤنە دزمانەکێ پاقژو رووندا ، مرۆڤ دکارین بیروهزرێت هۆزانڤانی ، ژزمانێ وی بزانیت [١١] . دیارە مزوری هۆزانڤانەکێ (ملتزم)ە ، بیروهزرێت وی . خەلکینە . لەو بزمانێ وان ژی هۆزانێت خۆ ڤەهاندینە لەو دڤێت هۆزانێت وی ژی بزمانێ وان بنو بۆ وان بن . بێ رەنگی مزوری (تكلف) دزمانێ هۆزانا خۆدا نەکریەو بارێ وێ قورسو گران نەکریە . بیروهزرەك پاقژ . ئێخستیە قالبەکێ سڤكو قەشەنگ .... بۆ نمونە . دەمێ مزوری لسەرزارێ کچکێ دبێژیت . من بکوژن ئەز مێرا ناکەم

بزمانەکێ خۆشتر دبێژیت :

کورکۆ دینۆ
ڤێ من دخازن
شووا ناکەم
دەستو بەریکتد باڤێ من
پر گوتنو ژڤان بکەن ...
بیاوا ناکەم
پشتی بەژنا تەرو تۆلا .
سیابەندیو مەمێ ئالان ...
(ژەهرەمار بیت)
مێرا ناکەم [١٢]

گوتنا (ئەزبەنی) . گوتنەك مللیەو مشە بەلاڤە دناڤ کرمانجادا . بۆ رێزو قەدرگرتنێ بکارتێت . دوور نینە مزوری ژڤالیێ وی دەراند بیتو بتیڤکل گوت بیت . (ئەزبەنی) . چونکی مالکا هۆزانێ هوسا رادگەهینیت . دەمێ دبێژیت :

ئەز دبینم
ئەڤ چیاکێ هەرو جلکێد وی دسۆتن
دکرنە رەژی ... دکرنە تەنی
وێهە تێتن
چاکێ شوشتیو ڤەشوشتیە
خەملا خو وی .
جارەکا دی ژنێ پیا حەتا سەری
کەسك کریە
وێهە تێتن
تۆ باش بنێرە (ئەزبەنی)
چ سەر بلندە دکەت کەنی [١٣]

مزوری دوژمنا . لسەر خاترا یارێ ژوەلاتی دەرئێخیتو هیڤیا زڤرینێ بو وان ناهێلیت . نابێژیت . زڤرین بۆ وان نینە . بزمانێ خەلکی . کو سڤکترە دبێژیت :

... یێد مایی ژی
هەر ژبەر خاترا بەژنا تەیا شەنگو زراڤ ... من ژوەلاتی (حەتا حەتایێ) .
کۆچکرن [١٤]

## ٢- مزوری‌و پەژن :

پەژن گوتنەکە . یان چەند گوتنن . دوو رامانا ددەت . ئێکا نێزیك . کو مەبەستـد پیٚ ئەو نینە . ئێکا دوور . ئێکا دوور . کو مەبەست پیٚ ئەوە . لـپشت پەردیٚ رامانا خوٚ ددەت .... هەمیٚ ملەتا ئەڤ پەژنە هەنە . لیٚ وەکو پەندا ناهێنە وەرگێران بوٚ سەر زمانێت دی . چونکی مەبەستا خوٚ دگوهورن‌و رامانا خوٚ دشێلن . رەهێت ڤان پەژنا ، دزمانی‌دا دکوورن ، هەکە ب بچووکاتی مروٚڤ دناڤ ملەتەکی‌دا مەزن نە بیت ، بـزەحمەت بکاریت دپەژنێت وان بگەهیت .... ئەڤ پەژنە گەلەك نێزیکی گوتنێت مەزنان‌و رەهێت وان تێکەلی هەڤ دبن ، لیٚ شوینا ئێك ناگرن ..

مزوری ددیوانا دووێی‌دا ئاڤ زکانیکا پەژنا ڤەخواریەو خوٚ ژواریٚ گوتنێت مەزنان بـدوور ئێخستیە ، [١٥] بوٚ نموٚنە دەمیٚ مزوری نیچیرڤانێت کەوا رسوا دکەن ، بیٚ شەرم‌و سنج دکەت بـپەژن دبێژیت :

....ـ سال هەر زڤراند
.. کرە بهار
نێچیرڤانێد مە ڤەگەریان
(رووی رەش‌و سار)
دبێژن بابوٚ :
ژویٚ سالیٚ وەر
نیچرڤانێد مە (درویٚ رەشن) .
(درویٚ تە نینە)[١٦]

دهوٚزانا (لاوك)دا ، مزوری پالەوانیٚ هوٚزانا خوٚ ، کش دکەت دوژمنا ، بـپەژن دبێژیت :

دیٚ رابە دەستێد خو هەلکە ..
هێرشەکا مێرانە کەلکەو ..
بهێلە تو (تەشموکیٚ وان
جارەکا دی ،
بکەڤیت تەشکا)[١٧]

گوتنا (تەشموکیٚ وان ، کەڤتە تەشکا ، یان شەلوالیٚ وان کەڤتە تەشکا .....) پەژنە بـرامانا ئالوٚزی و بن کەڤتن‌و شکەستنا دوژمنی بکارهاتیە ....

## ٣- مزوری‌و سترانا کوردی :

گەلەك تاو چق ، ژدارا سترانا کوردی دچن ، وەکو : سترانا لاوك ، حەیرانوٚك ، پاییزوٚك ، شەڤەروٚك ، سترانا مەشلـکیانی‌و لاندك‌هژینیٚ ، سترانێ دەواتا ، نێچیریٚ ، سترانا بچووکان ..... دیارە مزوری شەهرەزایی ناڤەروٚك‌و رووخسارا سترانا کوردیە . لەو ئەو تاو چقێت وی ڤیای بچنیت ، بـزیرەکی‌و شەهرەزایی چنینەو ڤاڤارتینە . هەر ئێکی ناڤەروٚك‌و رووخسارێت ویٚ داینیٚ ، نەك هەر ئەڤە ، بەلکو ئەز دکارم بێژم مزوری دڤیٚ دیوانیٚ‌دا ، هوٚزانێت سترانکی ڤەهاندینە ، کو رێبازەکاچاك‌و نوییە بوٚ هوٚزانا کوردی ، ئەڤ رێبازا هوٚزان ڤەهاندنا ، لـئنگلترە ، لـچەرخیٚ (ئیلیزابیثی) ، بـمەزنترین کاریٚ ئەدەبی دابە قەلەم [١٨]....

مزوری هوٚزانێت خوٚ دارێتینە قالبیٚ سترانا کوردی ، ئەو هزوروبیرێت دارێتینە قالبیٚ (حەیرانوٚکیٚ) ، ناڤەروٚکەکا نیشتمان پەروەری ، پری ئەڤینەکا دلسوٚز داینیٚ ، پەیڤێت سترانا حەیرانوٚك بوٚ ئاڤاکرنا هوٚزانا خوٚ بکارئانینە ، بەلیٚ وەنەبیت ، وەکو (لێك‌چوون‌و خواستن) وەرگرت بیت ، بەلکو وەکو (رەمز) بکارئانینە ، دەرگەهیٚ هوٚزانا خوژیٚ ، بـکلیلا حەیرانوٚکی ڤەکریە ، بوٚ نموٚنە :

کچیٚ دینیٚ
کەزیێد تە ، زیٚ‌و خابیرن
چاڤێد تە ، دەریا ئورمیٚ‌و ...
وانا کویرن
سالا لـدوڤ سالیٚ دبەزیت
هلم‌و بێنا تەیا پیروز ...
دەم‌و گافیٚ ،
من لەبیرن
کورکوٚ دینوٚ
بەژنا تە ، بەژنا مەمویە
تیرا تە ، ژداریٚ مکومیٚ
چیاکیٚ مەتیناو ..
بەمویە
ما تو نزانی دەرگەهیٚ
دلکیٚ من عەبدالا خودیٚ
بوٚ مێڤانکرنا ڤینا تە ،
هەریٚ ڤەکری‌و ڤەبویە .....؟!

کلیلا مزوری دەرگەهیٚ هوٚزانا خوٚ پیٚ ڤەکری ، (کچیٚ دینیٚ ، کورو دینوٚ)یە ، کو کلیلا حەیرانوٚکی‌یە ناڤەروٚکا حەیرانوٚکیٚ ئەڤینەکا نازك‌و پرسوٚزە ، ناڤەروٚکا هوٚزانا مزوری ژی هەر ئەڤە ، ژبلی هندیٚ ئەڤینا حەیرانوٚکیٚ ، ژناڤبەینا کورو کچا دەرناچیت ، لیٚ ئەڤینا مزوری دەرباز دبیت بوٚ وەلاتی ... پەیڤێت هوٚزانا مزوری ، یڤێت حەیرانوٚکی‌نە ، وەکو

پەیڤا : کورو دینو . کچی دینی . کەزێن تە . چاڤێت تە . بەژنا تە . دنکێ من عەبدلا خودێ .... ب‌کێش‌و سەرواڤە . مزوری کێش و سەروانێیت حەیرانوکی بکارنەئانینە . ب‌تەرازیا خۆ هۆزانێن خۆ کێشاینە

مزوری ناڤەروکا شەری‌و هێزو دژواریێ دایە ناڤەروکا هۆزانا (لاوك) أسم علی مـمی – یاکوێخستیە دناڤ ڤالبێ سترانا لاوك‌دا . دەرگەهێ هۆزانا خۆ ژی . ب‌کلیلا لاوکی ڤەکریە . کو لڤێرە (کەکێ منۆ) یەو جارەکێ ژی (هانێ هانێ) بکارئانیە . کو کلیلا لاوکی‌یە ....

ناڤەروکا لاوکی شەروشورە نە هەمێگا ڤا -- . ناڤەروکا هۆزانا مزوری ژی هەر ئەڤە ....

پەیڤێت هۆزانا مزوری . پەیڤێت لاوکی‌نە . وەکو پەیڤا : خۆ هاڤێمە گەرا مرنێ . خەرزێ خۆ رێتە زەڤیا زەڤیا . دێ رابە کەکێ منۆ روما خو گەرمکە . وەکی خورتە زاڤایەکی ... دژێ چاردە سالیدا ، دێ رابە دەستێد خو هەلکە . هیرشەکا مێرانە کەلکە . . من‌و تەو ئەڤێ ئێشی‌و ... ڤێ بەلاێ ...

لێ ژیرا مە نەچیت . پەیڤو ناڤەروکا هۆزانێ . ئێخستینە دناڤ کراسەکێ چەڤەنگی‌دا .... ئەڤ تیرو کڤانە ، ب‌دەست کێم شەرکەرا دکەڤن . هەکە ب‌دەست بکەڤن ژی ، کێم هۆزانڤان دزانن شەری پێ بکەن ....

**بۆ نمونە ، بنێرە ڤان مالکا :**

**کەکێ منو**
**چەرخا ڤا رۆژان‌و شەڤان ....**
**چەندا خارە**
**نە شلقەك بڤێ گورمێ دکەڤیت**
**نە پێلێد روبارێ زوها ،**
**تێنە خارە**
**ئەڤە سەرێ هندە سالان‌و مەهانە ...**
**دبزڤم**
**خو دهاڤێمە گەرا مرنێ**
**دناڤ ئاگریدادنڤم**
**دا لیسەکی .**
**بو زاروکێد خو بنژم**
**... چو نە دیارە [19] !**

ژلی ڤێ چەندێ ، مزوری ناڤێ سترانەکا دەواتا ژی ، وەکو چەڤەنگ بریە . کو سترانا (شێخانیە) ، دیارە ژبەرهندێ‌یە . چونکی (شێخانی) گۆڤەندی گەرمترو شاربایتر لێ دکەت ، بێ شێخانی بکەت ، دڤێت گەنج‌و تولاز بت ر خورت‌و سڤك بت . دەواتکەرەکێ چەلەنگ بیت .

ئەگینا شێخانی بێ‌ڤان ناهێتە کرن دبێژیت :

.... خەم کچەکا کوردی‌یە
هەرا بکراس‌و کورتەك‌و ....
گوهارێد (حەیدەرانی)یە
سولا دلنگێ وێدا ژی ، ژچێکرنا هۆستایەکێ (بابانی)یە
خوش خوش دچیتە گۆڤەندێ‌و ....
کەیفا وێ لسەر (شێخانی)یە [20]

**٤- مزوری‌و ئەفسانەو بیروباوەر :**

زڤرین بۆ رەمزێت ئەفسانەیی . بویە خاسیە تەکا هۆزانا تازە . [21] هۆزانڤان‌و بلیمەتێت ئەلمانی ، بۆ جارا ئێکێ داخوازا بکارئینانا ئەفسانێ دشیعری‌دا کریە [22] .

ت . س . الیوت ، ئالا ئەفسانێ دهۆزانا ئینگلیزی‌دا هەلگرتیە ، بدر شاکر السیاب سەرکێشیێ ڤێ رێبازێیە دهوزانا عەرەبی‌دا ، ئەز دکارم بێژم دهۆزانا کرمانجی‌دا ، مزوری دێ ڤێ ئالایێ هەلگریت ، چونکی هەتا نهۆ بەریکا ڤ کاروانی کەڤتیەو کەسێ وەکو مزوری خۆ نێزیکی ڤ بابەتێ بەرکەڤتی نەکریە . هەرچەندە مزوری وەکو سیابی‌و ئەدونیسی ، (توظیفا) ئەفسانێت بابلی ، ئەغریق . سومەری ، ئەشوری نەکریە ، ئەڤە ژی نە کێماسی‌یە بۆ مزوری ، چونکی دوور نینە ، بکارئینانا ئەفسانێت بیانیا دناڤ هۆزانا کوردی‌دا ، هۆزانا کوردی شەپرزەو بێ‌سەروبەر بکەت ، یان ژی هێشتا زوویە هۆزانا کوردی ئاڤێ ژکانیکێت بیانیا ڤەخوت ، هەر چەوا بیت . ئەفسانەو چیڤانۆك زمانێ مللەتی بویە دقوناغەکا تایبەتی‌دا ، لەوما گەریان‌و ڤەکۆلین ، لدویڤ چیڤانۆکا ، گەریانە ، لدویڤ بیروهزرێت وی دەمی . [23]

مزوری دڤێ گەریانێ‌دا سوارە . لێ نە وەکو کۆمکەرەك فولکلۆری‌و میثولوچی ، بەلکو وەکو هۆزانڤانەکی دەستهەل دوەرگرتنا ئەفسانەیێت کوردی‌و بکارهینانا وان دهۆزانێ‌دا وەکو چەڤەنگ . بۆ نمۆنە بیروهزرەك هەیە دبێژیت تەیرێ (کوند) ، جهێ مەترسی‌یە . چونکی دکاڤلە گونددادا دژیت . هەتیا نهۆ ژی . هەکە ئێکی گوتە ئێکی ، (هەی کوندی دمالا تەدا خواندیو) ، دێ خۆ ژێ عاجز کەت‌و ژێ سل‌بیت ، چونکی هەر وەکو گوتیێ . هەی کەسێ ب‌روح دمالا بابێ تەدا نە مایو ، ئەڤ بیروهزرا مللی ، مزوری (توظیف) کریە بۆ شینیا خودێ ژێ رازی (صادق بهاء الدین) . ئامێدیێ وەسا تێتە بەرچاڤیت مزوری ، کو کاڤلە بازێرە و کەس لێ نەمایە . بژلی فرڤرا تەیرێ کوند . دبێژیت :

چومە کەلێ ، کەل بلندە

سەر مەریٚ من
چ وڤرا تەیریٚ کوندە ..؟!
هەی فەلەکیٚ
خودان
کیی
گوٚف فەشیٚریٚ ستری چینی[٢٤]

(شەبلەبان) ، گیانەوەرەکی ئەفسانەیە !. زاروٚکا پیٚ دترسینن . مزوری (خەمیٚ) دکەتە ئەڤ (شەبلەبان و هەرتم . لبەر دەرگەهیٚت حەنکیە دبیٚژیت :

.. ئەڤ خەما هە
هەوەك شەڤان (شەبلەبانە) ...
دەرگەهە - دەرگەهە مالان دقوتیت
دچیتە ژور
دەیزیتن
سەزو ئاوازان گەرم دکەت .
... دژەنیت بلور
پسو زاروك ..
ژیٚ دترسن .. خو فەدشیٚرن[٢٥]

(سیمەرخ) ، پەرندەیەك ئەفسانەیە . مشە دچیروٚکو چیڤانوکیٚت کوردیدا هەتیە . هەرتم خیٚرخوازەو هاریکارە بوٚ پالەوانیٚ چیروٚکیٚ . یان چیڤا نوکیٚ . دانتە سەی پەریٚت خوٚ و دگەهینتە دەرپیٚ مرازا....

مزوری ڤ پەرندەی ، وەکو (رەمز) دهوٚزانا خوٚدا بکارئانییە ، خوٚ دکەت سیمەرخو ، ل ئاسمانیٚ حەڤتیٚ لیٚك دزڤریت دبیٚژیت :

.... مانیٚ تە دیت چەوا من خو .
کرە سیمر ... کرە باهوز
فولکانەکا ئاگریو سوٚز
ئەو پوچکرن
هند ژیٚ گورانو لوچکرن
.... هند حوجکرن[٢٦]

٥- مزوریو چیروٚك :

چەوا مزوری چەلەنگ بویە بوەرگرتنا رەمزیٚت ئەفسانەیی ، هوسا چەلەنگترە ، ب (توظیف) کرنا چیروٚکیٚو پالە وانیٚت ویٚ دهوزانیٚدا ، مزوری زیرەکیو چەلەنگیا خوٚ بهندیٚ نا دەرئیٚخیت ، کو ناڤیٚ چیروٚکیٚت کوردی ژبەرەو دکاریت ناڤیٚت پالەوانیٚت چیروٚکا بوٚ خویندەڤانی ریزبکەت . بەلکو بهندیٚ هونەرمەندە . پالەوانیٚ چیروٚکیٚ ژکاریٚ وی پیٚ چیروٚکی بدوور ئیٚخستیەو کارەك دی داییٚ ، ئانکو وەکو ژمارتنو ئیشارەت وەرنەگرتینە . بەلکو برەمز ئیخستینە دناڤ تەڤنو ریسیٚ خوٚدا دبیٚژیت :

کورکو دینو
پەریشانم من خەو نائیٚ
(لەعلیخانا) چل کەزیمە ..
کەڤتیمە بەر .
حنکا تائیٚ[٢٧]

هندە جارا مزوری کارەکی دەتە دوو پالەوانە وەك ئیٚك ، پشتی کاریٚ وان پیٚ بەریٚ ژیٚ دستینیت ، دبیٚژیت :

کورکو دینو
پیٚ من دخازن
شورا ناکەم
دەستو بەریکیٚد باڤیٚ من
پر گوتنو ژڤان بکەن ..
بیاوا ناکەم
پشتی بەژنا تەرو توٚلا
(سیابەندیو مەمیٚ ئالان ...)
ژەهرەمار بیت .
میٚرا ناکەم[٢٨]

هندە جارا ژی مزوری گەلەك باریٚ پالەوانی گران دکەت ، پشتی باریٚ وی پیٚ سڤلك لسەر پشتیٚ دانیت دبیٚژیت :

کەکیٚ منو
(سیابەندیٚ سلیڤی)مە
شەڤا دبرم
لسەر بانیٚد عەورا دفرم[٢٩]

**٦- مزوریو میٚژوو :**

گوتنەك هەیە دبیٚژیت ، پیٚ دڤیت ژپی دریٚژبیت ، بلا میٚژوویٚ دسینگی خودا بپاریٚزیت ، دیارە ژڤیٚ گوتنیٚ ، کو بهاییٚ میٚژوو بە رزو بلندە ، رەوشەنبیریٚ رەسەن نکاریت خوٚ ژیٚ پیٚ بارکەت ... ژبلی هندیٚ کودیوانا مزوری بەلگەیە بوٚ هندیٚ ، کو مزوری دەست بمیٚژووڤەدەت ، وەکو هەڤال ژی ئەم دنیاسینو دزانین چەند مزوری شەهرەزاو شەیداییٚ میٚژووییٚیە

ب‌گشتی‌و میژووا کوردی ب‌تایبه‌تی .....

مزوری دهۆزانه‌کا خۆدا گه‌له‌ك دویر دچیت . دچیته روویدانیت به‌ری عیسایی س . خ ل‌سه‌رین . دیار دکه‌ت . کو مله‌تی کورد . مله‌ته‌کی که‌ڤنه ل‌کوردستانی [۳۰] دبیژیت :

...بیرا ته تیت
دەما منیٰ زارو ره‌به‌ن دده‌ستیٚد ته‌دا ،
که‌ڤرو حه‌لان ....
ل (گه‌لیٰ سپی) . بسه‌ر تاریٚدا گریٚل کرین
ئه‌ڤ تاژیکیٚد (زه‌ینه‌فونی) ...
بن برکرین
یان گیٚژو به نگ‌و گیٚل کرین [۳۱]

هندی مزوری زولم‌و زۆریا (مه‌غول‌و ته‌ته‌را) دمیژوویی‌دا خواندیه . ئه‌شیایه دسه‌را ده‌رباز ببیت‌و چاڤیٚ خۆ ژیٚ وه‌رگیٚریت ، له‌و وینه‌کیٚ ریٚك‌و پیٚك ژیٚ دروست کریه دبیژیت :

کچیٚ دینیٚ
ل‌خه‌لکی ته‌حلیٚ ، ل‌من شرینیٚ
ل(ده‌ریٚ ئالان) ،
ل‌ده‌ریٚ پر هاوارو نالان
جه‌نگز هاتن
ئه‌ڤ ته‌تارو خونمژ هاتن
بیٚ شه‌رم‌و سنج ...
ل‌سه‌ر بیٚده‌را مه له‌یزتن
خه‌ون‌و ئومیٚدیٚد مه بیٚ به‌خت ،
ریٚتن .. گه‌زتن [۳۲]

ئه‌ڤ بزاڤا نیشتمانی ، یاکو ل‌سه‌ر ده‌ستیٚ به‌درخانیاو شیٚخ محمودو قازی محمد ، په‌یدا بی ، جهیٚ هیڤی‌و خه‌ونیٚت کوردا بو ، درندیٚت ئوسمانیاو عه‌جه‌ماو ئینگلیزا ئه‌ڤ خه‌ون‌و هیڤیه ب‌ده‌ستیٚت خۆ ، گاز پیٚداکرو ئاگر به‌ردایٚ ، ئه‌ها مزوری خه‌ونا بڤیٚ بزاڤیٚ‌ڤه دبینت‌و دبیٚژت :

ئه‌ڤ خه‌ما هه
جارنا دڤری
دچو داددا بورجا به‌له‌ك ،
ل‌دیوانا (به‌درخانی)
دناڤ قه‌هوا ویدا دگه‌ریا [۳۳]

ده‌ربه‌ندی بازیان‌و به‌ردی قه‌هره‌مان ، جهیٚ نفیسینا میژووا کوردیه ، جهیٚ سه‌ربلندیا مله‌تیٚ کورده . مه‌یدانا شیٚرانه . مزوری ڤیٚ دیروکیٚ دگه‌ل هۆزانا خۆ هه‌ڤبیردکه‌ت :

کچیٚ دینیٚ
ل‌خه‌لکی ته‌حلیٚ ل‌من شرینیٚ ل(بازیانیٚ) هاتن .. هاتن
فه‌له‌ره‌شك بون
ئه‌ڤ هندوك‌و فه‌له‌ره‌شك بون
دڤیان‌که‌ر بیٚد ته‌ببرن
ته بو به‌رده‌ستیٚ (خانمیٚ)
ژمن بدزن ر یان بکرن [۳٤]

ئه‌وکولا ددلیٚ هه‌می کورداندا مای‌و ده‌رنه‌بی ، پتر ددلیٚ هۆزانڤانی‌دا مه‌زن بوبه‌و دایه‌بن ، ماچ نه ده‌ته بن ، بویکا ده‌ست‌خه‌ناکری ، زاڤاکیٚ سالیٚ ، سالا به‌ر ڤیٚ سالیٚ - ۱۹٤٦ - که‌ڤته به‌ر حنگا چه‌رخیٚ بیٚ به‌خت‌و رووی‌ره‌ش ، هیڤی‌و ئومیٚد سه‌رنشیف کرن ، مزوری ڤیٚ ژیٚ دکه‌ته ئاڤ‌و خوین بۆ هۆزانا خۆ دبیژیت :

ئه‌ڤ خه‌ما هه
سالٚه‌کیٚ ئه‌ڤ چول‌و چیا ...
بتنیٚ برین ،
چو ده‌ڤ (قازی)
هه‌ر وه‌کو تیٚشکا روڤیا ،
... ب‌ڤیٚلبازی
رابو گوپالیٚ وی شکاند ،
ل‌وی ئه‌ڤرازی
(قازی) ژیٚ پیره‌کیٚ کالیٚ بارگران بو
راهه‌ژاو که‌ڤت
هه‌می شادی‌و خۆشییٚد وی ..
بونه‌ڤ تازی ! [۳۵]

**۷- مزوری‌و ره‌وشت‌و تیتال :**

مله‌ت تیٚنه نیاسین ب‌ره‌وشت‌و تیتالیٚت خۆ ، ئه‌ڤ ره‌وشت‌و تیتاله جهیٚ ریٚزو قه‌درگرتنا مله‌تایه ، چونکی ره‌هیٚت ڤان عادات‌و تقالیدا دهه‌ناڤیٚت واندا هاتینه چاندن ، هه‌تا وه‌لیٚ هاتین بوینه یاسه‌کا نه‌نڤیسی ، ئه‌ڤ ره‌وشت‌و تیتاله دکه‌ڤتن ، ب‌که‌ڤنایا مله‌تا ، گه‌له‌ك ژڤان عه‌ده‌تا هاتینه ژبیرکرن‌و نه‌مانه ، چونکی بۆ چاخیٚ خۆ په‌یدابوینه‌و ب‌کیٚر هه‌می ده‌ما نه هاتینه ، هنده‌ك ژیٚ به‌رده‌وام دبن ، چونکی هه‌ر وه‌کو بۆ هه‌می ده‌ما هاتیه دروست‌کرن ، هنده‌ك ژیٚ ژه‌رو جیرانا تیٚنه وه‌رگرتن . . . ئه‌ڤه

بابەتێ مە نینە    بابەتێ مە ئەوە بزانین مزوری چ رەوشتو تیتال دهۆزانێتخۆدا بکارئانینە . چەوا وەرگرتینە .....

هەرچەندە مزوری بکووری نەچوویە دناڤ ڤان رەوشتو تیتالادا . نە هاتیە رەوشتێت خراب سەرلێو بنك بکەتو ڤاژی بکەت . لێ دگەل ڤێ چەندێ مزوری شەهرەزایی درەوشتو تیتالێت کوردیدا هەیە . چونکی ئەو عەدەتو رەوشتێت دگەل هۆزانێت خۆدا هەڤیر کرین . ژکەڤنە رەوشتو تیتالێت کوردان تێنە ژماردن . مزوری ئەڤ رەوشتو تیتالە بۆ مەبەستا خۆ دهۆزانیێدا (توظیف) کرینە بۆ نمۆنە . دەمێ خەمەکا مەزن بۆئێکی چێببا . دا خولیێ بسەرێ خۆ وەرکەن . ئەڤ عەدەتە ببەر چاڤێت گەرۆکێ هێژا . (ویگرام) کەڤتیە دەمێ سەر لکوردستانێ داین [٣٦] . ئەڤ عەدەتە لنك(حەبەشا) ژی هەیە . دەمێ ئێك دمریت پرچا خۆ دبرن وخولیێ بسەرێ خۆ وەردکەن [٣٧] .... مزوری ڤێ خولێی بسەرێ دوژمنادا دکەنو دبێژیت :

... لەورا منێ جارەکا دن
کارێ خوە کر
دارو بەرێد گەلیو چیا ..
راکرنەڤەو ...
کرنەڤ ئاگر
تژی سەر سەرێ وان دیسا .
خولیو هشکر [٣٨]

پرچ برین ، ژکەڤنە رەوشتێت کوردان تێنە ژماردن . دەمێ عەزیزێ ئێکێ بمریت ، دێ کەزێت خۆ بریتو هاڤێتە سەر گۆرێ مری . کوردناسێ هێژا (تومابوا)یی ، ئەڤ عەدەتە دپەرتووکا خۆدا نڤیسیە دبێژیت :

(گەلەك گەرۆکا دیتی‌یە . کو ژنا مری ، یان دەزگرا وی ، پرچا خو یابری‌و هاڤتیە سەر گۆرێ وی .....) [٣٩] مزوری ڤێ عەدەتێ بشەهرەزایەکا هۆنەری زێدە زیرەك دهۆزانا خۆدا بکارئانی‌یە . مزوری کەزێت یارا خۆ نابریت ، ئەوێت هاتینە برین ژی ، دێ جارەکا دی ڤەهینیت . دێ تازی‌و شینێ ، کەتە کەیفو شادی ، دبێژیت :

ئاڤیڤانێ
ڤان درنداو هوڤا دڤێت
نە لناڤبەرا خۆ .
لێك ڤەکەن
روبارێ ڤینا منو تە ئەو ببرن
مە ژێك ڤەکەن
لەورا ئەزێ پەرستڤانێ .
بەژنا تەیا شەنگو شەپالێ ..
سوندێ دخوم
چ ئەڤرو بیت . چ سوباهی
ئەو دڤێتن
هەمو هیڤێد تەیێد ڤری
هەمو (کەزیێد تەیێد بری
جارەکا دی بدارو چوڤێد ئەگیدا ..
ئەو پێکڤەکەن [٤٠]

دیارە مزوری دزانیت . کو رەڤاندن . لنك کوردان شەرم نە بویە [٤١] . لەوما بێ ترسو لەرز گوتیە :

کورکو دینو
کانیكو باپیرێ خەما
هەلگرتنا
بارێ ڤێ دیروکا دێرین ..
هەر بو تەما
دێ وەرە دەستێ یارێکا خو .
بگرەو برەڤینە
ژدەڤێ گورا ..
ژبەنچێد هەما [٤٢]

**٨ - مزوری‌و خرومرێت فولکلوٚری :**

مەبەستا مە بخرومرێت فولکلوری . ئەو هیرومیرن . یێت کوردان ژخوەرا دروست کرین . بۆ رێڤەبرنا ژینا خۆ وەکو . (جوهالی . خراری . هنجاری . مەشکێ . قەلونێ . رەشکوونی . شیرو خەنجەرا . داسو شالۆکا ......)

ئەڤ خرومرە ژی مزوری کرینە هەلاش بۆ ئاڤا کرنا دیوارێ هۆزانێت خۆ . بڤی هەلاشی هۆزانا کوردی چاڤێت خۆ بکلێ خەلکی رەش نەکرینە . براستی بکارئینانا ڤی هەلاشی . بۆ هۆزانا کوردی پێتڤی‌یە . چونکی ژلایەکی‌ڤە . ناڤێت ڤان کەلوپەلا دێ هێنە پاراستن . ژلایەکی دیڤە . دێ ئامیرەتێت هۆزانڤانی پێ زێدە بنو زمانێ وی پێ خۆش بیت . ژبلی هندێ وێنەکێ خومالی‌و خەملەکا خومالی دێ پێشکێشی هۆزانا کوردی کەت ... مزوری لڤێرە ژی تەخسیر نەکریە . خەمێت خۆ ب (خرارا) دپیڤیت . گەرما چاڤێت یارا خۆ . بئاگرێ کوچکێت زڤستانا دپیڤیت . دچیتە بن

ڕەشکوون دروینیت . بتیروکڤان شەری دکەت . کاروانی ئازادیێ بجوهالێت خوەلی تینن . دستار دینامیکا ژنا وی دزڤرینیتن . بگریدانا بەرپێکا بەفرێت دقوتیتن . بکیانا مەشکێ . نڤیشکێ ڕەسەن دیار دبیت .... بۆ نمۆنە . دەمێ مزوری دڤێت بۆ خویندەڤانی دیار بکەت . کو خەمێت وی دزۆرن دبێژیت :

.... ژکیرێ بێژم .. ؟!

کیش خرارێ

خەمێت خو یێد سەنگو گران ..

بو تە ڤالاکەمو برێژم ... ؟! (٤٣)

مزوری پڕیا ئەڤینا خۆ دەتە وارێ خۆ . ئەڤ ئەڤینە دژوارە . بتینە . گەرمە وەك ئاگرێ کوچکێد ژڤستانێ ... دبێژیت :

ئەگەر تو برێکەکێدا چوی

تە جوانەك دیت

گەرمیا هەردوو چاڤێد وێ ژئاگرێ هزار (کوچکێد زڤستانێ ...

گەرمتر بو

تو بخودیکەی .

ژێ نەبورە

ئەو پەری براستو دروستی

وارێ منە (٤٤)

مزوری حەژوان کەسا ناکەت . یێت کو هەرو دچنە سەر دینەکی . هەمی ڕەنگا دبەرخۆ دکەن دبێژیت :

دەنگەکی گوت :

– بوچی دەما هەیڤ دهەلێتن

تو بەرێ خو . ژێ وەردگێری‌و ...

تە نە ڤێتن ؟!

– من نەڤێتن :

چونکی هەرو تێتو (مەشکا) .

دینەکێ تازە دکێتن (٤٥)

٩– مزوری‌و هۆزانڤانێت کلاسیکی :

ئەڤینا مزوری دگەل هۆزانڤانێت کلاسیکی . تامەکا تایبەتی هەیە . دیارە ڤان هۆزانڤانا . بکووری تیرا خۆ لجەرگێ مزوری دایە . لەو نە کاریە پەزێ خۆ لدووری مێرگا وان بچەرینیت . هەرتم ئاڤ ژکانیکا وان ڤەخواریەو پەزێ خۆ لهەڤشیێ وان چەراندیە . جار جار تەڤنێ وان ژێ ڕستی‌یە . ....

ددیوانا ئێکێدا مزوری سەرەدانەك بۆ وارێ (لورکا)و (نیرۆدا) یی‌و (محمود درویش) بریە . مزوری چەپەك لخۆ دایەو هەتا نێزیکی پاوانێ وان ژی نە بویە . بتنێ لزۆزانێت (خانی‌و جزیری‌و جەگەرخوین) کوونێ خۆ دانایە . نزانم ئەڤە گوهورینەکە ژئەستراتیجیا مزوری . یانژیقوناغەك تایبەتیەمزوری تێدا دبەزیت ... هەر چەوا بیتو هەچیا بیت . مزوری بکارهینانا ڤان ناڤا ژی گوکا هۆنەری بریە . چونکی بتنێ ناڤ ڕیز نە کرینەو ئیشارەت کریە ڤان ناڤا . مزوری نەڤێت ناڤا بژمێریت ، هەتا خوێندەڤان بزانیت مزوری ڤا هۆزانڤانا دنیاسیت . بکارهینانا ناڤێت هۆزانڤانێت کورد دهۆزانێدا ژلایێ مزوری‌ڤە . ئەڤە هەمی نینە ، بەلکو بشێوەکێ هۆنەری بەرزو بلند بکارئانینە . بۆ مەبەستا خۆ کرینە پەردەو ڕەمز ، وەلێ کرینە دێ بێژی ئەڤەهندە کەسێت دی‌نە ....

دەمێ مزوری خەمێ دبەتە مالا (جزیری) ، یا ژمرۆڤی‌ڤە ئەڤەمالا هەمی کوردانە – کوردستانە – . پاش دزڤرینتە مالا جەگەرخوونی ، وەسا دیاردکەت ، کو ئەڤ خەمە ، لهەمی چاخو دەما بمەڤەمایە ، هۆسا هۆزانڤان کرینە ڕەمزو پەردە بۆ دەربڕینا هزروبیرێت خۆ دبێژیت :

ئەڤ خەما هە

لمالا (جزیری) دنڤست ..

هەڤگورا وی‌و (سەلما)یێ بو

نەژوێرێ دچو .. نە ژی دمر ! (٤٦)

دەمێ زڤراندیە مالا جەگەرخوونی دبێژیت :

ئەڤ خەما هە

ڤێ ئێڤارێ لمالا (شێخ‌موسی) .

دستری

گوومێد جوشا وی شلقاندن ... (٤٧)

هندە جارا مزوری گەرم دبیت ملێ خۆ دەتە ملێ جزیری‌و خانی‌و جەگەرخوون . خۆ و هەڤالێت خۆ . ژکارێ ڤەهاندنا هۆزانا بدوور تێخیتو دبنە چوار سوارێت ئەڤینا وەلاتی‌و بدوڤ دکەڤن . دبێژیت :

کچکێ دینێ

ئەڤروکە عاشق نە ئێکە .

ئەو ئژینە

ئەزم . جزیری‌و خانی‌یەو ...

جەگەر خوینە

باوەر بکە جوانا منێ
پەیڤا ژێبرکرنا ناڤێ تە
ددەفتەرکێد مەدا نینە
ددەفتەرکێد
مەدا نینە ! (٤٨)

هەتا شینیو تازیا نفیسەڤانێ هێژا ، خودێ ژێ رازی ، (صادق بهاء الدين) بۆ رەمزێت خۆ کریە دەلیڤە ، سروشتو مرن پێکڤە گرێدایە ، (ئەڤە ژی پێنگاڤەکا باشە ، کو هندە رەمزا بکەتە تێدا (٤٩) ، دبێژیت :

ڤێ ئێڤارێ
دنێرم روبارێ گوندێ مە
وێ دلەیزیتن بـمەستێ پێلێ دهاڤێتە سەر پێلێ دبەزیتن
وەکی گورگێ ژدەستێ شڤانی ،
ڤەرەستی
- ما تو نزانی روبارۆ
نەمە دلمایە ئەڤروکە
نە هیڤیەك بچینە دەستێ ؟!
ئەڤرو بەژنا قەلەمەکێ شەنگو بلند
یا دنیڤیرا ،
شکەستی (٥٠)

ژێدەرو پەراوێز

١ الرمز والرمزية في الشعر المعاصر . ط[٢] . ١٩٧٨ . مصر . د. محمد فتوح احمد . ل ٣٢٥ .
٢- الفولكلور قضاياه وتاريخه . يوري سوكولوف . ترجمة حلمي شعراوي وعبد الحميد حواس .... راجعه وقدم له : د. عبد الحميد يونس . مصر . ١٩٧١ . ل ٢٧ .
٣ ژێدەرا بەرێ ....ل ٢٦ .
٤ الاساطير . ط[١] . مصر . د. احمد كمال زكي . ١٩٧٥ . ل٦٩ .
٥ مجلة التراث الشعبي . ژمارە (٦) . سالا هەشتێ . ١٩٧٧ غاح هادی کبه . ل ٤١ -- ٧٠ . بناڤـو نیشانێت - تحديث الفلولكلور في الشعر العراقي المعاصر .
٦- دراسات في النقد الادبي . مصر . ١٩٨٠ . د. احمد كمال زكي . ل ١٤٤
٧ هەمان ژێدەر .... ل ١٤٦ .
٨ گوتنێت مەزنان . لدەڤەرا بەهدینان . بەغدا . ١٩٨٦ . ل ١٢٩ ١٦٧ .
٩- ژێدەرا بەرێ ..... ل ١٥٧ .
١٠- مقالة في اللغة الشعرية . بيروت . ١٩٨٠ . محمد الاسعد . ل ١٨
١١ الاديب والالتزام . بەغدا ١٩٨٠ . محمود الجومرد . ل ١٣ .
١٢- لخەلكی تەحلێ . لمن شرینێ . بەغدا . ١٩٨٧ . عبد الرحمن مزوری . ل ١٧ .
١٣- هەمان ژێدەر ........ ل ٥٢ .
١٤ هەمان ژێدەر ...... ل ٥٩ .
١٥ ددیوانا (ئەڤینا چراێن کەڤن)دا . مزوری مشە گوتنێت مەزنان حەلاندینە ناڤ هۆزانێت خۆدا . بنێرە . پەرتووکا (گوتنێت مەزنان . لدەڤەرا بەهدینان) . ..... ل ١٥٧ ...
١٦- لخەلکی تەحلی ...... ل ٤٤ .
١٧ - هەمان ژێدەر ...... ل ٧١ .
١٨ فائدة الشعر وفائدة النقد . بيروت . ١٩٨٢ . ت . س . اليوت . ترجمة د. يوسف نور عوض . ٤٦ .
١٩- لخەلکی تەحلێ ......ل ٦٥ .
٢٠- لخەلکی تەحلێ ..... ٧٩ .
٢١ بدر شاكر السياب . ريتا عوض . ط[٢] . بەغدا . ١٩٨٤ . ل[٥]
٢٢ - هەمان ژێدەر .... ل[٥] .
٢٣ الاساطير والخرافات عند العرب . لبنان . ١٩٨١ . د. محمد المعيدان خان . ل ١٦.
٢٤- لخەلکی تەحلێ .... ل ٣٧ .
٢٥- لخەلکی تەحلێ .... ٨٧ .
٢٦ لخەلکی تەحلێ .... ل ٥٨ .
٢٧ لخەلکی تەحلێ .... ل ١٥ .
٢٨- لخەلکی تەحلێ .... ل ١٧ .
٢٩- لخەلکی تەحلێ .... ل ٧٤ .
٣٠- بۆ ڤێ چەندێ بنێرە . مسيرة العشرة آلاف عبر كردستان . زينفون . ترجمة صلاح سعدالله . بەغدا . ١٩٧٣ .
٣١- لخەلکی تەحلێ ..... ل ٥٦ .
٣٢- لخەلکی تەحلێ ..... ل ٥٨ .
٣٣ لخەلکی تەحلێ ..... ل ٨٣ .
٣٤ لخەلکی تەحلێ ..... ل ٦١ .
٣٥- لخەلکی تەحلێ ..... ل ٨٤ .
٣٦- مهد البشرية . ديليو . أي . ويگرام . ادگار . ئی . ای . ويگرام . بەغدا . ١٩٧١ . ترجمة جرجيس فتح الله . ل ٢٥٣ .
٣٧- الفلكلور في العهد القديم . ج[٢] . تاليف جيمس فريزر . ترجمة د. نبيلة ابراهيم . مراجعة د. حسن زازا . مصر ١٩٧٣ . ل ١٨٠ .
٣٨ لخەلکی تەحلێ ..... ل ٦٢ .
٣٩- الاكراد . توما بوا . ترجمة آواز زەنگنە . بەغدا . ١٩٧٥ . ل ٩٩ .
٤٠- لخەلکی تەحلێ ...... ل ٢٥-٢٦ .
٤١- دابو نەریتێ کوردەکان . نووسینی (مەلا مەحمودێ بایزیدی . د. شوکریە رەسول . ژرووسی وەرگێرایە .... ١٩٨٣ . ل ٣٢ .
٤٢- لخەلکی تەحلێ ..... ل ١١ .
٤٣- لخەلکی تەحلێ ..... ل ٥٦ .
٤٤- لخەلکی تەحلێ .... ل ٥ .
٤٥- لخەلکی تەحلێ ..... ل ٣٠
٤٦- لخەلکی تەحلێ ..... ل ٤٢ .
٤٧- لخەلکی تەحلێ ٨٦ .
٤٨- لخەلکی تەحلێ .... ل ١٨ .
٤٩- چەند گوتارەکێد رەخنەیی . انورمحمد محمد طاهر . اربیل . ١٩٨٨ . ٧٦ - ٧٨ .
٥٠ لخەلکی تەحلێ ..... ل ٣٣ .

# كچی بێ زەل

● دوكتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ ●

سەرەتای ساڵی «١٩٦٦» لە گەشتێكی تایبەتیدا، دێ بەدێ، بەپێ‌و بەسواری، هەندێ ناوچەی ووڵات دەگەرام، لەناوچەی بادینان رێمان كەوتە گوندێك «بێ زەل»ی ناوبوو، براینە ماڵێك، كچێكی شۆخی باڵابەرز هات بەخێرهاتنی كردین، من دەم و دەست نەهاتمە وەلام، ئەویش وایزانی كوردی نازانم ـ لە هاوەڵەكانمی پرسی:ـ تێناگها...؟.

نازانم چی پاش بیست و دوو ساڵ ئەو دیمەنەی هێنایەوە یادم و بوو بەم چەند دێرە كە لە شیعر دەچن..

«ع . م . ر»

كچی بێ زەل..
تێدەگەهم ...
بەخوا كوردم
بەلام بەژن و باڵای جوانت
وا كتوپڕ ...
لاڵی كردم .
ئەو زمانەی وەك چەرخ وابوو،
بڵندگۆ بوو،
بەرامبەر بە چاوی گێژت،
یەكسەر چووەتە كلیلە .
ئەز كرمانجم،
ئەز كۆهیمە،
باوەڕ بكە
چاوو دڵم بۆت دەلیلە
تاقە نیگاو دوو لێوی ئاڵ،
وایان هەست و هۆشم مەست كرد،
تێڕوانین و یەكدگیریی چاوو دڵ و بیریان
خەست كرد .
تا وام لێهات،
ووشەی كوردی لەسەر زارم
چەشنێ تەزی
حازر جوابیم، گورجو گۆڵیی جارانی ڕووم
ئێستا بەزی
ـ خێراندار بێ ...
بەخوا كوردم، زۆر هوشیارم
واق ورماویم،
با وەلام بێ،
كۆهیش نەبم
خەڵكی شارم
شەرتە رۆژان، ڕۆژی خۆشیان بەدووادابێ
بێمەوە لات
ئەوسا بڵێم، ئەم بینینی یەك نیگایە
پێمەوە هات...

●

# دوو پارچە شیعر

• علی فتاح دزەیی •

## ١- غەزەل (١)

چاوەکەم تۆ مەیلی دڵداری دەکەی
یان دڵی من فێری غەمخواری دەکەی

گیانی پەروانەم دەکێشی، روومەتت
عاشقی خۆ تەو گرفتاری دەکەی

تووتی‌یە تەبعم شەکەر خۆراکی‌یە
بۆ حەواڵەی خاڵی ڕوخساری دەکەی

نایەوێ بێجگە لە ماچی لێوەکەت
چونکە بەم لێوە شەکەرباری دەکەی

وەک دەمت شیرین دەبێ شیعری (عەلی)
گەر بە هیوای وەسڵ و دیداری دەکەی

-١٩٧٥-

## ٢- پرشنگی چاوێک

هێشتا بەهرەی شعری ناسک
لێم نەتۆراوە یەکجاری
جار جارە بەیادی چاوێک
هەڵبەستێک دەکەم بەدیاری

جارجارە، شێوەی نازدارێک
لە پێش چاوما، خۆی دەنوێنێ
ئاگر بەردەداتە گیانم
بیرەوەریم دەوروژێنێ

لەتاقی عومری لاویمدا
نیگای چاوی ئەو نازدارە
ئەوەندە کاری لێکردووم
ئێستاش پرشنگی لێم دیارە

لەتەمەنی شەست ساڵیشدا
هەر ئەوەندەم لەبۆ ماوە
نێرگزێ بدەم لەیاخەم
بەیادگاری ئەو چاوە

١٩٨٩

---

(١) ئەم غەزەلەم لەدوای چاپکردنی دیوانی (خرۆشان و رامان)م بەدەست کەوتەوە.

بە هۆی کون بوونی چینەکانی ئۆزۆنەوە ..!

# سپرای

محمدامین پێنجوێنی
١٧/٣/١٩٨٩

ئارایشتی قژت مەکە
مەیکە بە «مێش»..
ئەی کچ تۆ، شیلەی ئارەزوو
ئەی نگینی بەختی ونبوو ...!
هەنگی مێشکم مەووروژێنە
پەردەی ئۆزۆنی دڵ ئەدرێ!
مەیگلۆفێنە مەیهێنە ئێش ..
لەسەر زەمینی گیانم دا
کارەساتێ بەرپامەکە ..؟!
تۆوی توخمی بەشەر ئەبرێ!!
بزەوی ئەگری ئەڵێ بەرگی تەنم درا!
بە سپرای زەرکەفتینی پرچی کچێ...
سپرای خەست گرتنەوە
ژوانی مەرگە، هەرزەکاران!
رۆحی بێ نرخی! مرۆڤە وەکەمێش
بە دڵۆپێ بارانی زەرد
خەفە ئەکاو بۆ (نەبوونی) ئەقۆزنەوە

* * *

رۆژێ مەلی گیانتان ئەفرێ!
کاڵای تەلای لە یاداشتا
لەبەر مەکەن ... !

* * *

هەتاکو کیژ پتر بسکی «نگرۆ» بکا
بە تاقی پەلکەزێرینە ..!
درزی ئۆزۆنی گەردوونمان
زلتر دەبێ..
تیشکی «وەنەوشەیی» کوژەر!
گزنگی «ئێکسی» ئاسمانی.
شەوقی سێکسی ئەرزی چڵێس ..!
باڵی شوومی پەخش دەکاو
بۆ کێشانی گیانی کوڵۆل
چەشتر دەبێ..
ئەوسا کە گوڵ و گیا نەما !
بوونەوەر گشت بوون بە خەڵوز
مرۆی بەهاترین کولور بەخۆڵەمێش!!
خاوەن پارەی سپرای زەرکەفت (دڵۆپی زەرد)!
رزین لە گێژاوی تەما
کێ سەیری پرچی زێرینی
بەرهەتاوی کچان دەکا؟
کێ ئەشقی قژی (مێشاوی)!
پرووزاوی کیژان دەبێ!؟

# کوڕنوش

امین نقشبندی

پاشی نیوەی شەو کە دنیا وا دیلی ژێر باڵی شەوە
چەندە خۆشە من لەبەر دەرگا کەتا بتلێمەوە

سەر لە کوڕنوشا، بەدەم پارانەوە و لالانەوە
تۆ دەرم کەیت و منیش هەر بێمەوەو هەر بێمەوە

بەرلەوەی رووناک ببێ ئاسۆی جیهانی نوستوان
مەستی کوڕنوش و نەبێ هۆشم بەلا ڕێو جێمەوە

سەر لە کوڕنوشا دڵیش شەیدای جەماڵی ڕومەتت
چیمە ئیتر من بە تاج و تەخت و بەخت و خێمەوە

بارەگا کەت جێی ئومێدم ناوی تۆ قووتی دڵم
من گرفتارم بەدەستی کردەوەی بێ جێمەوە

خاوەنی گیان و دەروونی خاوەنی لاشەی زەبون
مەر بە لوطفی تۆ نەمێنێ ئەو گڵەی[1] وا پێمەوە

دڵ خودا بیدا چرایە مەرکەزی نوری خودا[2]
من پەرێشانم بە دەستی ئەو دڵەی بێ ڕێمەوە

ئەو کەسەی ڕێگای بڕی، بێشک ئەگاتە لوتی کێو
چیبکەم من، کۆت و زەنجیرە بە دەست و پێمەوە

من جگە کوڕنوش و گریان و هەنسکی گەرم و گوڕ
هیچ ئومێدێکم نیە نەبڕێمەوەو[3] نەبڕێمەوە

شەرتە شەرتی عاشقی یەك ڕەنگی بەندەی بارەگات
ئەو سەرەی هانیومە دایئەنێم ڕۆشتمەو نایێمەوە

تا دەروون ڕۆشن نەکەی بەو چلچرایەی ڕومەتت
ئاگرێکم تێچوە پاش مردنیش ناکوژێمەوە

١ـ مەبەست لەگڵ .. گوناه وکردەوەی چەوتە لە ڕوانگەی دینەوە.
٢ـ (قلب المؤمن عرش الرحمن) حەدیثە.
٣ـ ئومێدی ئەوەم نیە دواییم نەیێ.. واتە نابمە ئەوانەی ئەبنە (خالیدین) وەناویان لەم جیهانەدا هەر ئەمێنێ و لەو جیهانیشدا لە خۆشبەختانن، نەبڕێمەوە..، واتە نەیدۆڕێنم لەم گۆڕەپانەدا.. گۆڕەپانی تاقیکردنەوە لەم جیهانەدا.

# قادر کەرەم

د. سەعدی بەرزنجی

**سەرچاوەی دەروون**
**زولالی هەمیشە پاکم**
**دەریای هەست و هۆش**
**مایەی بیرو باکم**
**قادر کەرەم....**
**ئەی مەڵبەندی خۆشیو شادی دڵ**
**ئەی سەرچاوەی ژینی چاکم**
**هەموو دونیایەك فەلەك بێت**
**تۆ ی بە تەنها گشت ئەفلاکم**

●●●

ئێتە بیرم ...
کاتی کە هێشتا ساوا بووم
ئەوسا جارێ ماڵ ئاوا بووم!
باوکم لە کۆشی تۆدا بوو
منیش لە کۆشی ئەودا بووم
لە عەشقی تۆ بچێتە دەر
بێ داوا بووم

●●●

نانی جۆت بەمزرە دۆوە
گری برسێتی کپ ئەکردەوە
راکەراکەی ناو کۆلانی پڕ لە خۆڵت
بێ تاقەتی ئەبردەوە
مەلەی «باسەرە»[1]ی دڵ بزوێنت
دەرگای ئازادی بۆ
باسکەی باڵمان ئەکردەوە

«گەنم گەنم»[2] «کلاو-فینجان»[3]
«ئایشە تەنوور»[4] «بەرزان بەرزان»[5]
وازیی باو بوون لای منداڵان
یان دۆزەو منەی بەهاران
بەلاویتەو[6] و، بە بێڵەکان[7]
لەلای «زیخاڵ»[8] یان لای «بێلان»[9]
راوە سووچەر راوە سوێسك
راوی ماسی یان کەروێشك
لەگەڵ «باوە»[10] و «مام بندیلك»[11]
وەکو تریاق بوون بۆ مێشك

●●●

**من نازانم کام یادگارت**
**فەراموش کەم**
**لەدوای کۆچم ساتێ دڵم**
**بە کوێ خۆش کەم**
**ماڵ ئاوایی بۆ کام بنچگ**
**بۆ کام دارو بۆ کام درەخت**
**ببروسکێنم**
**ماچی حەوایی بۆ گۆنای**
**کام گوڵاڵە،**
**کام هەردە، کام بەرزیو**
**سوورك بوەشێنم**

●●●

چۆن دەتوانم

یادی هەڵکەندراوی وا
لەمێشکمدا بسڕەوە
لەکوێنم بوو
دڵی قایمی وا
تا پەیوەندی
لەگەڵ خۆما ببڕەوە

●●●

دەنگی دووزەلەیان سۆزی شمشاڵ
«مام نەزەر»[١٢] لێی دات
یاخود «حەمە شوان»[١٣]
هاژەی «رووخانە»[١٤] و هۆزەی دەروێشان
هەر یەك لەمانە خۆشترە لامان
لە هی «بیتهوڤن»[١٥] یان لە هی «شوپان»[١٦]

من نازانم
کام یادگارت فەرامۆش کەم
بەزمزەمی
کام کەڵبەزت خۆم سەرخۆش کەم

●●●

**«خاوکەر»[١٧] خۆشە یان «خورشیدی»[١٨]**
**«بەرزەقەتار»[١٩] «ئەڵڵەومیسی»[٢٠]**
**کامیانت بۆ بخەمە سەر**
**سەر سور مەبە!**
**ژوور بۆتە دەر**
**قاعیدە وا**
**بۆتە ریزپەر**
**یادی تۆیە**
**رای دەژێنم**
**وەکو کۆرپە**
**لە بێشکەی سەر**

●●●

تۆ بێشکەمیو یادەکانت

دەسرازە من
بەقووڵایی شیوەکانتا
ئەمبەستنەوە
بۆ باوشی سروشتی تۆ
ئەزووی بیرم ئەگێرنەوە
بۆ ناو کۆشی پڕ لە رەحمت
سەودای دڵم ئەهێننەوە

تۆ بەڵگەمی بە هۆی تۆوە
ماف هەتیو دەسێنمەوە
تۆ ڕێگەمی.. ملت ئەگرم
هەتا هیوام دەبینمەوە
کەرەستەمی
بە بێڵی تۆ
داری ئاوات
دەچێنمەوە

پەراوێزەکان

(١)و (١٤) هەردوو ناوی ئەو رووبارەن
کە بەقادرکەرەمدا تێدەپەڕن
(٢)و (٣)و (٤)و (٥) ناوی ئەو یارییانەن
لە ناوچەی قادرکەرەمدا باو بوون.
(٦)و (٧) ئامێرن بۆ قنگرو هەپلۆك
هەڵکەندن دەیان لە ئاسن و کلکیان
لە دار درووست دەکرێت، دەمی
(لاویتە) درێژکۆلەو هی (بێڵەکان) پانکۆلەیە.
(٨)و (٩) ناوی دوو زەوییەن نزیکی
قادر کەرەم
(١٠)و (١١) مەبەستمان خوا لێخۆشبوان
«عەلی باوە» و «مام صالەح بندیلك» •
کە مەراق و خولیای راویان زۆر بوو.
(١٢) شمشال ژەنێکی بەناوبانگی بێهاوتایە.
(١٣) دووزەلەژەنێکی ناسراوە لێزانە.
(١٥)و (١٦) دوو مۆسیقادانەری بەناوبانگن.
(١٧)و (١٨)و (١٩)و (٢٠) هەر چوار بابەتەکەی
گۆرانیی «قەتار»ن کە لە گەرمیاندا و
بەتایبەتی لەناوچەی قادرکەرەمدا باوە.

# سێ کورتە شیعر

مدحت بێخەو

## «پیت .....»

خەرمانی پەنگری پیتە دێوانەکان
بێ ئارام بێوچان ...
پیشەیهەر سووتانەو لرفەیدێ بێجمان
رۆڵەی رۆڵەی دەوێ تێنوێتی بشکێنێ
لەو دیوی کێوی قاف مزگێنی بۆ بێنێ
هەر بۆیێ پیتەکان وەك بورکان هەڵ دەچن
بۆ پەنجەی نەترساو بەکرنۆش
ریز دەبن ..
لەپەنجەی نارەسەن رادەکەن
زیز دەبن....!

★ ★ ★

## «کام بەرزی»

لەو کاتەی تەمی (زۆر) پێش دیدەی
رێ دەگرێ..
ئاوازی ناوسینەو بزەی سەر
لێو دەمرێ..
کام بەرزی و نەمری دەگاتە
رابەرێ..
بروسکی رێگابێو تارمایی
هەڵبرێ ..
کام نزمیو ریسوابوون دەگاتە
پووچەڵێ..
بێ ورەو نیهاد بێو لە نیوەی رێ هەڵێ..!

★ ★ ★

## «ئەنجام ..»

قۆمەتی بەفری سەر ترۆپکی گردو کێو
کە دیدەی دەبڕێتە بنارو لای نشێو
ئەبینێ قشوونی پەی بەهەرد بردووە
مەلانی ئاوارەو شپرزە کردووە
سینەی کەس نەماوە ژانی لێ نەدیبێ
لانەو کونج نەماوە کەپێی نەتەپیبێ
بەم کارە بەفری گەوج بایی‌بوون دەیگرێ
شالآوە دژمکەی «سی» داماو دەبرێ
نازانی کە تیشکی نەوبەهار هاتە روو
قەوارەی پفی چۆن زوو نوقمی ناو هەش بوو..!

★ ★ ★

غریب پشدەری
١٩٦٦/١٠/١ـ کۆیە

# پێنج خشتەکی «غەریب پشدەری» لەسەر شیعرە بەناوبانگەکەی «کوردی»

لەبەر جەور و جەفای دووری پەنام بردە هەموو شارێ
لەدەست زنجیرەکەی زولفی ، ڕەشی کەوتوومە هاوارێ
دەڵێی کافردەبێ ڕەحمێ بەحاڵی من بکا جارێ
«ئەمان مردم عیلاجێ سا ، لەرێی پێغەمبەرا چارێ
وصال یا قەتڵ یا تەسکین ، لەهەرسێ بۆم بکەن کارێ»

★ ★ ★

لەسەر سینگ بەبێ ڕەحمانە تا دەمرم چەپۆك دادەی
بەسە بۆمن ئەگەر جارێ ، بەناز پەرچەم لەڕوو لادەی
منەتبارم بەمەرگی خۆم ، کەچی تۆ دڵ بەمن نادەی
«وەها سووتاوم ئەصلا تابی فریادم نەما سادەی
ڕەفیقان نیوە سوتوون ئێوە نامەرد عەرزە هاوارێ»

★ ★ ★

دەپرسن بۆچ وەها کەوتووی لەرێگای هاتن و چوونی
بەخوێنی زامی جەرگی خۆت ، وەها سەر تاپە گوڵگوونی
دەڵێم چ بکەم بەدەستی خۆم نیە شەیدایی و مەفتوونی
«لەکونجی سینە دەنگی ئای و ئۆی دڵ دێ بە مەحزوونی
وێران بێ ئەمدی ساتێ لێی نەیە ناڵەی برینداری»

★ ★ ★

لەبەر دەستی پزیشکان تۆ منت بۆچی بەرەڵڵا کرد
لەجیاتی چاری دەردم کەن ، کەچی دەستیان بە هەڵلاکرد
ئەوانیش هەریەکەی مشتێ ، قوڕی هێنا وەسەرما کرد
«وەلای هەرکەس دەچم مەنعم دەکا خۆت بۆچی ڕیسوا کرد
خوا کوا حاڵ زانێ ڕەبی تووشم بێنی بیمارێ»

★ ★ ★

قوڕی کوێ کەم بەسەر خۆما لەدەست ئەم چەرخە بێ باکە
لەچارەی خۆم گەرام دیتم ، لەناو بەدبەختیا تاکە
لەقاپی بارەگای یەزدان خەلاتی مەرگ تەمەنناکە
«لەژێر باری غەما واشانی سەبرم چاکە ئێستاکە
فیراقی یار لەبەر ئاخرشەری لێم بۆتە سەر بارێ»

★ ★ ★

لە دونیادا نیە عاشق وەکو من بێکەس ونادر
خەریکە ئاگرم تێبەر دەبێ بەو عیشقی وەك ئاگر
بەگریان و بەسووتان و بە ناڵینم نیە خاتر
«لەنەزعا پێی دەڵێم قوربان جەفا بەسیە دەڵێ کافر
هەمان چیت دیکە تۆ سەگ مەرگە کام ماکە پێت جارێ»

★ ★ ★

بەبێ بادەی دەس و پەنجەی ، دڵم ئاسوودە قەت نابێت
ئەگەر بەزمی هەموو دونیا لەبەر من بێت و پەر پا بێت
لەبەر ئاخرشەری خۆمە ، کە دەست لەو شوخە بەر نابێت
«سەبا یارانی مەجلیس گەر هەواڵی من دەپرسن لێت
بڵێ کێشایە مەیخانە دوو چاوی بێچووە عەییارێ»

★ ★ ★

کەبای وادەی ئەجەل هات و بە ناکامی ئەتۆ مردی
لەسەر مەرگی جوان مەرگیت ، ئەوەندەم گریە بۆ کردی
بەتەنیا «پژدەری» ماوە لەدونیادا بە ڕووی زەردی
«دوڕو یاقوت دەبارێ لەو کەلامە شیرینەت کوردی
درێغا کوا لە دونیادا قەدر زان و خەریداری»

★ ★ ★

---

تێبینی : شەوی ١٩٦٦/١٠/١ ، کە چارەکە سەدەیەکە ، لەکۆیە کەلاوێژێکی کۆنم دەخوێندەوە ، پێنج خشتەکی «بێکەس» ی ئەمرم لەسەر ئەو شیعرەی «کوردی» ئەمر وەبەرچاوان هات ، وای لێکردم منیش بەم کارە هەستم ـ غەریب ـ

# شەهید

● ئازاد دڵزار ●

ئێوارەیەو، زەردەجێ بەخۆی ناگرێ!
سپینداری بەژن زراف،
وا پایز ئەنگاوتوویەتی
خەریکە رووت دەبێتەوە.
وا پایز ئەنگاوتوویەتی:
هەروەك شۆخێکی وەرەم دار
خەریکە خوێن دەرشێتەوە
نا، نامرێ؛
مریەمی ئێمە نامرێ
ئەو رۆژە دێ
بەبای وادە ئاوس دەبێ
ئەگەر خوای خۆشەویستیمان
هێنایەوە
ئیتر هەرگیز،
عیسامان لە خاچ نادرێ !
ئێوارەیەو زەردە جێ بەخۆی ناگرێ!
لە دوورەوە،
چیاکانمان سپی دەکرێن.
دەڵێن ئەمشەو بەفرێکی تازە کەوتووە؟!
چۆن بەفر لەچیا دەبێ؟!
ئای شیرینە مەلوولەکەم،
گەردنی سپی لوتکەکانت
زەردە پەری ئیوارانیان
چەند جوان لێدێ.

● ● ●

ئێوارەیەو زەردە جێ بەخۆی ناگرێ !
لەپێچی کۆڵانەکەمان
ئافرەتێکی بەرگ خمی،
دەچریکێنێو سەرتاپا یەخەی دادەدڕێ
چەند چاوێکی بە قووڵاچوو
چەند دەستێکی شەقار شەقار
وا دارە بەستێك دادەگرن
لە بانی جێبێکی شینکار.
من دەزانم دایکە کلۆڵەکەی دەمرێ،
من دەزانم،
ژنە بێ دەرەتانەکەی
تازە بەرگی تازیەداری داناکەنێ.
بەڵام ئەگەر کاتی خۆی هات
دارچواڵە لەناو بەفریش دەپشکوێ.
ئەگەر خوای خۆشەویستیمان هێنایەوە
ئیتر هەرگیز
عیسامان لەخاچ نادرێ

● ● ●

# لێم ببووره

عبدالرزاق شێراوەیی
هەولێر

شیرینەکەم ،
لە نامەکەی ئەمجارەتا
داوای شیعرێکت کردبوو،
باسی جوانی تۆی تیابێ..
بە قەدو بالآت هەڵبدا .
هەر لەوساوە، ئەی کچی جوان!
هەموو شەوێك تاکو بەیان
لەگەڵ پێنووس ئێشك گربووین
چاوەروانی ووشەیەکی کت وپر بووین
بیکەین بەسەر مەشقی شیعرێ
باسی جوانی تۆی پێ بکرێ.

بەلام گیانە:
بە درێژایی ئەو شەوانە
ووشەیە نەبووە میوانم
بیکەم بەدیاریو گەردانە
وەلامێ بێ بۆ نامەکەی
ئەو کیژە شۆخ و جوانە
بۆیە دەبێ، لێم ببووری
ئەگەر بڵێم باسی جوانیت!
هەرگیز شیعر بۆی ناکرێ
کالای بە بالا بدووری

★●★

# ڤیرونیکا توشنوڤا

هوزانڤانا ب ناڤ و دەنگ «ڤیرونیکا توشنوڤا» چاڤێت خوییت ڤەکرین ل سالا ١٩١٥ ز ، ل «کازان» ناڤبری کچا زانیارەکێ زیندەوارابو «عالم احیاء» هوزانڤانامە کارکریە د نەخوشخانێت سەربازیڤە ل موسکوو کازان ل سەر دەمێ جەنگا نشتیمانی مەزن (١٩٤١ ـ ١٩٤٥) .

برەنگەکێ سەرەکی ئەو تشتێت «توشنوڤا» ی نڤیسین هوزانێت سترانابون ل سەر هەستانێت مروڤایەتیێ دهاتنە گوتن ، ل سەر عشق و ئەڤینێ و خوشی و شادیێ بون وەك ئەڤـــان هوزانـــا [کـومـەك هەلبەستا «پەرتوکا ئێکێ» ، «بیرهاتنێت دلی» «رێکا کولوخو» «بێهنەکا دی» ، «هەلبەستێت سترانا»] ناڤبری ل سالا ١٩٦٥ ز چاڤێت خو دانانە سەر ئێك و چو جیهانا دوێ پشتی سامانەکێ ئێك جار پیروز ل دویف خو هیلای بو مروڤایەتیی و عاشق و ئەڤیندارا .... ئەڤەژی هوزانەکە ژ هوزانێت «توشنوڤا» یێ .

### هیڤیا خوشییێ بو تە دکەم

دگرنژم ، بەلێ دلێ دگریت
د شەڤێت بتنێدا .
من تودڤێی
ئەو ژی راڤە
هیڤیا خوشییێ بو تە دکەم
ئەو ژی راڤە ، ئەی خوشیامن
نەپێتڤی‌یە ببت پەیڤو
نەگرنگە ببت چاڤپێکەفتن ،
نەپێویستە ئاهو فیغانێت من ،
نە پێویستە مەترسییێت تە ،
نەپێتڤی‌یە چاڤپێکەفتنەکێ
دگەل هەوە بکەم ل





گەل ئەلندێ دکولان و رێچکادا .
ها ئەواهە پیریاتی دویر کەتیە ،
فەلەکێ ژبیر کربو گەلەك
من تو دڤیی
ئەو ژی راڤە
هیڤیا خوشیی بو تە دکەم
ئەو ژی راڤە وەك هێلانامن بو تە ،

وەك من بیرهاتن ژ دلی
ئینایینە دەر ،
وەك نە گەرم کرنا دەستێت
تەبیێت سارو تەزی ،
ئەوێن بارێ گران هەلگرتی
ئەو کی‌یە ، دێ بێژیت ئەی خوشیامن

چ پێتڤی‌یە ل سەر مەو ،
چ نەپێتڤی ،
شیرەت دکەت ، چ دێ بیت ،
کەس نینە بومە بپەیڤیت
کەس نینە بومە رێکێ دیارکەت ،
کەس ل وێرێ نینە
گرێ بومە ڤەکەت ،
ڤێجا :
کێ گوتیە ، عەشق و ئەڤین تشتەکێ ساناهی‌یە ؟؟
کێ گوتیە ، عەشق و ئەڤین تشتەکێ ساناهی‌یە ؟؟

ژیدەر : دیوانا شعرێت روسی و سوڤیێت ـ موسکو ـ ١٩٨٣ پەرێت [321 - 324]

# ئەڤین بهارا دلانە

ئیسماعیل تاها شاهین

بێژن ئەڤین مشتو مانە . رووت و رەڤوان و بێ مالم
بێژن ئەڤین ئێش و نالە . ژ بوینا سەرادم . زالم !
مێژ و ژڤانە گەر ئەڤین ، سال و زەمانە ب ژڤان
حەنك مری ڤ زێرو زیڤە . ژڤانە ئەز بۆ دنالم
ئەڤین گەوهەر خوانی بت خەملا من رەش رەشكن . كتێب
چەند ب ژی لاو و تولاز بم ژ رۆژا من فامكری كالم
بێژن ئەڤین هەر گۆتنە . گۆتنێ نە سەرە و نە بەر
مەگەر ئەوجە ئەڤیندارین . یا من ب خوە هەری لالم
بێژن ئەڤین گولێ ! گولە . ژ گولان من گول گولێ گولی
جارەك دخوازم لاڤلاڤ بم دا ل دۆر بەژنا تە بئالم
هەكە ئەڤین ژ خوە ڤیانە . ژ ڤیانێ ڤە بێ منەتم
ئێنا ئەڤینێ گەر دلە . هێژ ب دلساخی تئالم
بێژن دلە تەنگ ب ئاستەنگ خێل و خوار تێدە ناچن
ب رەنگ و رووبار چو نەبم ب دل ئەز رۆستەمێ زالم
ژ جان مە دل بێ گومانە . هەبی و نەبی مە هەر ئەوە
دێ ب ئەڤین دفرۆشم . سەر وەرنێ بەقالم

# كاڤێ رابن

ریكار مزویری

هنجنین گهێن پشتامە گهـ گهـ
رستن ئەڤ رهێن دلێ ،مە رهـ رهـ
ل ڤێناتە دگەرێن ئەی وەلات
ئەو نزانن كیش خانەیە جهـ جهـ
رابە رابە كازیا جەگەر خوینی
ژمەو گولێرا تومان و ژینی
تاكەنگی بڤی رەنگی دلبیت ژەنگی
بۆ خامەی نەكەین تڤەنگ بۆ جەنگی؟
خانمێ دارە داری دبریت
تۆش مرۆڤی خودان هەست و چەنگی
رابە رابە كازیا جەگەرخوینی
ژمەو گولێرا تومان و ژینی
بمێژە، برێژە جوان ببێژە
لێژە خارنا مە هەر برێژە ـ١ـ
هوڤەتیا وان جهێ شێرا یاگێژە
ب فندا مە دخاپینن لێژە
رابە رابە كازیا جگەرخوینی
ژمەو گولێرا تومان و ژینی
رابە كەرەكێ ژ كەری ڤەكە
هێدی كەزیێن دلبەرێ تو شەكە
دەستێ كەری ل سەر سینگی پارچەكە
زانینێ بگرە بهێزترین چەكە
رابە رابە كازیا جەگەرخوینی
ژمەو گولێرا تو مان و ژینی
دەنگ ڤەدە ل جیهانێ مینا عەڤری
تەڤێ كاوەی دەست پاڤێ وی تەڤری
بەیارە زەڤی دخازیت تولاز
تو پیرس و هەلگوردی گران كەڤری

ـ١ـ برێژ: گوپكا دارایە بزوری ل زڤستانا پەز دخوت.

# سێبەری ترس

ڕۆشنا ئەحمەد ڕەسوڵ

خۆر لە نێوەندی ئاسماندا کەوتبووە پەلەقاژێو خۆی لە دەست پەڵە هەورەکان قوتار دەکرد . دوو چرکەی نەدەخایاند پەڵە هەورەکان لەگەڵیدا ساز دەبوونو دڵی ئاسمانیان بۆ جێ‌دەهێشت .. ئەو تیشکەی تێدەسرەواندیتو بە کاوەخۆ گیانێ دەئاژنی ترسی گەورەی ئەمشەو بوو لەسەرخۆ شاڵاوی دەهێنا بۆ جەستەتو کاسەی سەرێ بەکرێ دەگرت . ئەوەی بیرت لێ نەدەکردەوە بە سانایی بووە ڕوداوێکی ناوەختو لەو چەشنە خۆرەی توورهەڵدا .. کات چی‌یە بەدی ناکەیت .. وا دەزانی خەونەو مۆتەکە دەستێ ناوەتە بیناقاقات . ساتیش لە ژێر هەناسە تەنگیدا گومڕا بووە .. ئەوان پێ‌ی دەڵێن کارەساتێکی ناوەختە .. لە پڕو لە ناکاو .. بگرە بە چارەنووسیش لە قەڵەمی دەدەن . هەر دەنگی ئەوانیشە پەمپ دەدات لە پەرەمێزی سەرتو ئاگری ساتەکانی دەروونت زیاتر خۆش دەکات ..

– ئەو سووتانی‌یە لی‌ێ پیس نەکات باشە !

– لەو بڕوایەدانیم جارێکیتر توانای هەبێ‌و بجوڵێت ..

– دایکە پیرەکەی بەرگە ناگرێت .. چەند گوناحە !

– هەرچی خوا بڕیاریدا ناگەڕێتەوە ..

بەیادی قەزاو قەدەرەوە نقوومی خەو دەبن ، چ سەراسیمەیەکیانە ! ماوەیەکی کەم ئاسان و پاشان هاتنەوە سەر باری خۆیان . مێش میوانیان نی‌یە . لە کوێوە دەرکی پێ بکەن جێگەی سربووت خەمی تۆ ناپێچێتەوە .. تۆ بڵێی تاریکی ئەو ژوورە بێت کەوا بنیادەم کوێر دەکات ! یان ئەنجامی بێ‌دەنگیەکەی خۆت بوو لە ترسەکەت ! هەرچیەك بێ .. تێ‌ناگەیت . شتەکان لە بەردەمتدا وڕو مەستن .. لە نێو بێداری شەوی نوتەكو هەناسە ساردی ڕۆژێکی دووابڕاودا دۆش داماویت ..

ئەگەرچی ئەو وەیشوومە لەم دەمەدا هەموو شتێك دەتاسێنێت . توانای لە تاریکی ئەو ژوورە دەبڕێت وەك قاڵبێك بیخوسێنێتەوە . تەنانەت کاتیش ئیفلیج دەکات . نە دەی گەڕێنێتەوەو نە هەنگاوی پێ‌دەنێ .. بەڵام زەنگوڵەو هوڕەی ئەو ساتە نەخۆشانە بەگژیەکدا دەچن‌و توونەکیت لێ دەکەنە ڕۆژی ڕووناك . ڕەشکەو پێشکە بە چاوت دەهێنن‌و سات بەسات دووبارە دەبنەوە .. خۆت دەشاریتەوە لێیان . کەڵکی نی‌یە .. لەژێر دەستیان دەرباز نابیت . کونە مشکیان لێ کردوویتەنە قەیسەری . سەرتیان قۆرخ کردووە و لەپێش چاوتدا تەراتێنیانە .. ساتەکان لە ژوور سەرتەوە یەك لە دوای یەك چەپۆڵەت لێ دەنێن .. بڕوا ناکەیت ئەو ترسە بێ‌ئەندازەیە چۆن لە ئاسمانەوە داباریو ڕۆژەکەی بەرجەستە کرد ! لەژێر باری خەمدا بووی . دەتووت ئەمشەو وەك مریشکی سەربڕاو بە سەرانسەری حەوشەکەدا بۆ مەرگی خۆت دەکەویتە سەما . ئەمشەو باران وەك شەوانی تر بەرۆکی ئاسمان ناگرێت (بلە) شێتیش ناخزێتە نێو جێ . با لە سبەینێ‌وە تا ئێوارە بە کۆڵانەکاندا هەڵتیزینێ‌و بە بەردەوە مناڵە قۆشمەچی‌یەکانی گەڕەك ڕاو نێت . ئەو نازانێ ماندوویتی چی‌یە .. خۆی مات دەداتو داری حەوشەکە دەکاتە پەناگای . هێندەی چاو تروکانێ لە ژوورەکەتان دێتە دەرەوە وەك خێو دەستت لێ دەوە شێنێ‌و پرمت دەداتێ .. دەبوو ئەمشەو بیبیتە تاکە نێچیری .. کەچی .. ناچێتە مێشکتەوە . وەڕس بوویت .. دەنگی جریوەکان ئەوەندەی تر دەمارەکانی سەرتیان دەوروژاند . بە گڕو مۆنی‌یەوە لێیانت ڕوانی ولەوانیشەوە ئاراستەی ئەو پەڵە هەورانەت دەکرد کە بە هێمنی بەرەو گۆیژە ملیان دەنا .. چەندە ئامەزرۆ بووی بیانکردایە گەلەکۆمەکی پڕ بە دەرووی ئاسمان ! چاوی خۆر بگرنو دەروازەی ترسە بێ شومارەکەت بێنەوەیەك . بەڵام تەبایی خەمەکانت نەبوون . لەوە دەچوو بەرامبەرت خووی چرۆ هێوای ووشك هەڵاتوو و بێ نازی تەمەنتیان هەڵگرتێ .. هێزیان تێدا

نەمابوو ! سەرکز دەرۆیشتن لە ترپە ترپی ئەو دڵەش بێ ئاگابوون کەوات دەزانی تەنها دەنگێکەو سەرتاپا ئەو ناوچەیەی داگرتبۆوە .. بە یەکجاری ئارامت لێ هەڵگیرا . هێشتا بلە نەهاتبۆوە وا دڵتی ڕاو دەکرد ئەگەر شەویش دابهاتایە ئەوا بە ئاسانی دەیتوانی لەو تاکە خانووە شڕەی بەریەوە نەمابوو هەڵت‌لووشێ . بۆکوێ دەچی ! ئەمشەو نا شەوێکی تر، نۆ مانگی دوورو درێژەو شەوێکی هەر بەر دەکەوێ .. ئەو شەوەش خەیاڵێکی تاڵ بوو بەر چاوتی بە چەشنێ قەتمەر کردبوو تیایدا لە ڕاکە ڕاکی خۆت ڕادەمایت .. زۆری نەخایاند قیژەی (ئامە)ی خاوەن ماڵ لەگەڵ (خونچە)ی ژوور دراوسێتان لە هەیوانەکەدا ڕایتەکاندی و گەڕی خستە حەوشەکەوە .. هات‌و هوتی ناوازیان بە ئاستەم ترس‌و لەرزەکەتی دەحمی و نقوومی چاڵە سەرنجی تەنکی دەکردی .. لەسەر پلیکانەی دەم ژوورە گڵێنەکەیدا فەقیانەکانی لە قۆڵی سەڵتەکەی دەئاڵاند ، بە موو دەتگرت بۆڵە بۆڵ لە زاری دوور نەدەکەوتەوە ، وورد هاتە خوارێ ، لە بەردەم ژێرخانەکەی ماڵی بلەدا دەستی هەڕەشەی لە خونچە بەرز کردەوەو خێرا ڕووی دەمە هەراشەکەی بۆ دەرکەی حەوشە چەرخاند ، شلان شلان وەدەردەکەوت‌و گلێنەی چاوەکانتی ڕەدووی خۆی دەخست .. سەرو بەستەکەی عەشاماتێکەو سەرتی لێ دەرناکەیت . سەبەتەیەك بوو بە تەپڵی سەریەوە دەلەرییەووە (ئەو خەڵکە لە خۆوە ناوی نانێن ئامە سەرەگا . کەچی ئەمشەو سەری هەر بە مازوویەك دەچوو !) پیرەژنێکی ناشرین‌و دەم بەهاوارە . چاوە بەقووڵا چووەکانی دوو بورکانن‌و دایم‌و وەخت بەسەر پەیکەرە ئێسکی ڕوخساریەوە گریان لێ دەبێتەوە .. تا لە چاوەکانت بزر بوو جیقە جیقی پێڵاوە لاستیکەکانی لەژێر پاژنەی ئاسنینیدا بۆری جریوەکانی دابوو لەبەر گوێتدا . هەر دیار نەما خونچە لێرەوە بە دەم شتنی چیمەنتوێ سەکۆکەوە کەوتە سکاڵا ڕشتن .. ووشەکانی سێبەری باڵندەیەك بوو گورج بە ژوور سەرتەوە تێ پەڕی‌و ڕمکی خەمتی لەژێر باری بیرچوونەوە دەرکێشا . ئاگات لێ‌نەبوو چۆن ژانی دەروونت کەوتە کینگڵ دان‌و لە جووڵەی خستیت .. لەشە داهێزراوەکەت بۆ هەڵنەگیرا وەك جارانی پێشوو سۆندەکەی لێ بفرێنی‌و خۆت بشۆیت ! نقەت لێ برابوو . چەندە قسەکانی پێچیان تێ دەکەوت خەمەکانت ڕەنگی تابلۆیەکی شێواویان دەگرت‌و لەپێش چاوتدا دەکەوتنەوە شەپۆل .. پیسکەو چاو برسی .. پارەو پول .. ژیان‌و گۆڕ .. ڕاستیشی دەکرد پیسکەو چاو برسی وەك خۆی وێنەی نی‌یە . دەنا بۆ کارەبای ڕانەکێشاوەتە خانووەکەوە ! بەدەردی باوکت دەیووت ئەگەر مەسەلەکە پارەی تێدا نەبووایە ئەو دارانەشی بە بنمیچەکەوە نەدەنا ! لەگەڵ قسەکردنی خونچە تا وەکو لێ‌بۆوە هەڵکوتایە سەر باوکت بۆ خۆی‌و قسەکەی ، ئەویش ئەو دیوی ڕستەکەی هەڵنەدایەوە ! پارە .. ناوێکی چەند سانایە ! بچووك ! نەگەیشتە ئەوەی لەگەڵ باکەدا یەکانگیربێت .. ئەی کەواتە بۆچی لێت بۆتە کوتەکێکی گەورەو شەوو ڕۆژ لە هەناسەکانتدا ژێنت دەکوتێتەوە ؟! پێشت سەیر دەبوو باوکت ساڵ دوانزەی مانگ ڕادەکات بە دویداو هەر ناشیگاتێ ! ئەو کاتانە لە تواناتدا نەبوو دەرکی پێ بکەیت .. دەمێك پێت زانی کە کردیە لێشاوێك و بە جەستەی ماندوویەوە بێ‌دەنگی ژوورەکەتانی هەراسان دەکرد ، هەر دەبوو بگوێزنەوە .. دەنا دەست کورتی ئەو کەرووی لە تەمەنی تۆو دایکت دەهێنا ، لەوانە بوو ئێستا قەرزەکانی دار عەموودی شەقامەکانی پێ بژماردنایە .. بۆ هۆدەیەکی کرێ ئاسایی‌و لە قەدەر دەست‌و زەمانە دەوەن بە ئاشێکی تەنیا دەخستەگەڕ ، وەختی شێوان شەکەتی گیانی بوو دەڕژایە سەر سفرەی نان خواردنەکە .. ژوور دەستەمۆی ئەو قسانەبوو بوو .. سفرەکەش لە تۆ دەبووە شارێك وبیناو خانووت تێدا دەبینی ، ڕاهاتبوویت .. هەفتەیەکی ڕەبەق چێژی خواردن بۆنی گڵ‌و چیمەنتۆی لێ بەرز دەبۆوە .. ئەو شینەی گێڕای بۆ ژووری خەمت باوەکو شەمشەمەکوێرەش کردبێتیە هێلانە دەبوو لە نێو چوار دیواری گڵێندا بکەویتە چینە کردن هەتا بۆرانی ماندوویێتی ئەو ڕەوی بێتەوە . نزیکیش لە مزگەوت‌و دوو هەنگاو بۆ بازاڕ ئەوە پەتای دەخستە ئازارەکانیەوە .. ئەو ڕۆژەت لا ڕەش بوو ، دونیات بە زۆردار دادەنا کە بەزەیی لە ژێندا هەڵ دەگرتەوەو پەژارەی دەخستە جێ‌ی .. هەناسەی ژیان گۆڕا .. ساتەکان لەنگەری ڕۆژیان تێك دەداو لە وێنەی شەوە خەمی پاییزانێك خۆیان دەنواند مانگی تێدا گیرابێت ..

ڕوو خۆشی‌یەکەی خونچە دەیتوانی شیرازەی ئارام لە دڵتدا دابڕێژێ . بەڵام ئامە سەرەگا بایەقووشێ بوو لە بانەکەی ئەوبەرتان هەردەم دەیخوێند . دەمەو عەسرانێکی نیشتەجێ هێشتا ئۆقرەتان نەگرتبوو خۆی کوتایە سەرتان . بە دەنگە شڕەکەی یەخەی هێمنی ژوورەکەتانی دادەدڕی و سەرو گوێلاکی بلەو (ئافتاو)ی دایکە پیری دادەگرتەوە ، ئەو باسەی لەوانی دەکرد تاوێری گەورە بوو دیسانەوە هاویشتیە کاسە ی سەرت‌و ترس‌و خەمەکانی دەروونتی ڕاچڵەکاند .. (هەر بە شێتی لەدایك بووە ، ئەو ڕەحمانە سەرخۆشی باوکی لە مێژەوە کەس نازانێ چووە بۆ کوێ ! سەرەونگوون .. ئەم ژنەی بە جووتێ منالەوە داوەتە دەست سەرماو سۆڵەو بۆ دەردی ژیانی جێ‌هێشتوون ، ئەمیش بە دەرۆزەیی‌و دەست پان کردنەوە لەم‌و لەو مرێمی کچی‌وا لێ کرد تا مێردێکی تێکسمراوو مل پان بردی هەرزە کوڕانی گەڕەك سەرە تاتکێ لێ بکەن‌و بلەش بکاتە دارێکی

حەیزەرانو کۆڵان بە کۆڵان راویان نێت .. هەرچەندە مرێمیش رۆیشت بەڵام ئەم هەتیوە لەو کاتەوە تا ئێستا چاوی بە هیچ کوڕو کچێ هەڵنایەت ..) ئای لەو رۆژە نالەبارەی چاوە دەرپۆقیوەکانی بلەت بینی! تۆوی ترس لە دڵتدا چەکەرەی کرد .. گەورە بوو .. بووە درەختێك و لە خۆوە وەك رەشەبا و رۆژمی بۆ هێنایت .. دەنگی هاواری ئەو ساتەت دەیان موچرکی ئاشنای گیانت دەکردەوە ، پیرە دایکی زوو فریا نەکەوتایە لەژێر چرنوکەکانی چاوی مەرگ دەیقۆستیەوە . لیکە رژاوەکەی لەسەر سنگت چۆڕاوگەی بەستبوو .. لەوەش دەترسای روحی پاکت لە قورەکەدا بنێژیٚ ..

تونێ ئەو دۆخە ئاگرینە گومانی لیٚکردیتە هاوریٚیەکی دڵسۆزی شەوو رۆژگار دەست لە ملت ، هەرچ کاتیٚ بلە لە حەوشەکەدا قیت ببوایەوە بروسکەی کوشندە زەقی چاوەکانی وەژووری دەنای .. ژووریش زیندانێکەو ژانەکان لە نێویدا یەکتر دەبیننەوە . کە تێکەڵاو دەبوون بە رقەوە سەرو قژی ئالۆزکاوتیان رادەژەنی .. لەودیو پەنجەرەوە خۆرو مانگ بەریٚ دەکران ، سۆزی خامۆشت جارس بوو بوو ، ئاوێکی روون لە گلێنەی چاوەکانت دەووروکاو بە فرمێسکێکی سوێر دەچۆڕایە سەر روومەتەکانت . بیٚ چارە لە ژوورەکەدا خەمەکانت کاملٚ دەبوون .. لە خۆت توورە دەبوویت .. لەگەلٚ ساتەکاندا بە شەر دەهاتی ، چ کاتێك تۆ ئارەزووت لە باران بووە تاوەکو لە پەڵە هەورەکانیش بپارێیتەوە بۆت بێنە شینو هاوار کردن .. مەداری ژیانت لەیاد چوو بوو چۆن دەسوریٚ ، سکاڵای تۆشی نەدەویست ، پەڵە هەورەکان دەروونیان گەرم بوو بوو .. لەگەلٚ رەش بوونەوەی دڵیشیاندا تریشقەیان بۆ لوتکە بەرزەکان نازلٚ دەکرد .. هەر لە هەوەلٚ پرووشەوە لە خۆشیاندا باڵت گرت ، وات دەزانی ئاهی تۆیە لای خوا گیرە بووەو حەوشەی سروشتی دەبەست ، بە هانات گەیشت .. سیٚ مانگەی زستان کلوە بەفرو شەستە باران بلەی کوتایە ژووریٚو سەبوری بە دڵە خەمگینەکەت دا .. کەچی ئەمرۆ خۆر بەرامبەرت مەیلی لە چاوەکانت دەبری ، بیٚ پەروا لە دەروونی ئاسماندا مەلەی دەکرد .. هەستت دەکرد خەمی بیٚ ئامانت قەبارەی ئەویان گرتووەو وەکو ئەویش بیٚ باك هەرەسیان بە دڵت دەهێنا . تاوەکو زیاتر سەیرت بکردایە ترسەکەت گەورەتر دەبوو ، وای لیٚ دەهات سیمای ئەویشیان دەشاردەوە .. چیت لە دەست دەهات .. ! لە بیٚ ئارامیدا قسەت بەو پەلکە زێرینە دەووت کە دەردەکەویٚو شەختە ریسوا دەکات ، رقت لە بەهاری گوڵاڵە سوورە دەبۆوە .. چونکە دەبووە مەلۆتکەی ئەو ترسەی درێژە خەوی ئازارەکانتی راو دەنا .. چاوت بەرایی نەهات چیتر بە تیٚروانینی گوژمی خەم لە ریٚگەی تیشکی ئەوەوە سەرت هەڵپاچیٚ ، بەزمی خۆرت جیٚهێشتو وەژوور کەوتی .. ژانو ئازار خربوو بوونەوە . حەزت دەکرد وەك دایکت لەژێر سێبەری خەودا راکشایتایەو بۆ جیهانێکی تر بارت بکردایە .. توانای ئەوەت نەبوو . دڵنیا بوویت ئەگەر بە دەگمەنیش خەوت لیٚ بکەوتایە خەوت بە ئەوە دەبینی کە گیانت هەلٚ دەمالیٚ ..

دانیشتن جلەوی لەشتی تێك دەدا ، دادەهێزرایت .. خووی رۆژگارتە لە کۆلٚ هەنگاو بیت بۆ هاتو چۆ بە ژوورەکەدا . دەخولایتەوەو بالۆرەی ژینت دووبارە دەکردەوە ، ژووانی دوانەهاتووی دڵە راوکێت بوو .. نێو چوار دیوارەکەش بازاری ئاڵووێرتە . بیٚدەنگ ژوورەکە خەمەکانی هەڵدەگرتیتو تۆش ژانەکەیت دەخواردەوە ، بیٚ سەنگتو دوور لە ژاوەژاو .. وێنەی بازاری راستەقینە لە سەری خۆتدا دایکوتا بوو هێشتا ئەوەشت پیٚ باشتر بوو وەك لەوەی جارێکی دی بۆ دایكو باوکت قسە بکەیتەوە ، دەتزانی سەرەرای ئەوەی بە ترسنۆکی سۆزانیت دەکەن ترسەکەشیان لیٚ گەورە دەکردی ، ئەو ئارامەی تێشتا مابوو بنەبریان دەکرد .. ئیتر پریاسکەی خەم بۆ کیٚ هەڵرژیت ! خونچە هەفتەی دوو شەو لە مالٚ دەکەوێتەوە ، دراوسێش تا ئێستا یەکێك لای نەکردۆتەوە بۆ ئەم ناوچەیە . نازانی لەبەر دەمیاندا خانوویەکی داتەپیوەو بۆتە کەلاوەی گەرەکەکە ، یان لەبەر ئەو گازینۆیەی کورانی گەرەك لە دوکانەکەی ئەوبەرتان دایان مەزراندووەو ناوێرن توخنی دەرکەی حەوشەتان کەون ! بەڵام کیٚ وەك تۆیە لە ژوورەوەش بخنکێت وێنجا ئارەزووی چوونە دەرەوەشی نەبیٚ ؟ بیٚ هاودەمیت .. مەگەر بۆ دارو دیوار .. قاپو گسك بدوێیت .. بیٚ دەنگیەکە دەی گرتیتەوەو خۆپەستاندن لە ژوورەکەدا چارە بوو ، بێداری لە دوای بێداری سەنگتو سوژنت دەکرد ، لە ئەنجامدا دووبارەو سەد بارە پەیت بە تیمارێك دەبردئازار دەمکوت بکات دەرمانەکەی وا لە حەوت تەبەقەی ئاسمان . بە دوعای دایكو باوکت دەبیٚ بباریٚو دڵی پەك کەوتووت بحەوێنێتەوە .. چیت بۆ دەمایەوە لە چاوەروانی زیاتر ! پیشەی خۆتە .. بۆتە هەناسەتو بیٚ ئەو ناژیت .. هەر لەو رۆژەی لە منالٚدانی دایکت جویٚ بوویتەوە خوا لە چارەی نووسیت بۆ ئەوەی ئەرکی دایكو باوکت بدەیتەوە دەبیٚ تەمەن بە چاوەروانییەوە بەسەر بەری ، ئەگەر ئاگری دۆزەخیش بیٚو پێتەوە بدات گرنگ ئەودیە ئەوان دڵخۆش بن .. خۆشترین کاتی ئەوانیش ئەو دەمەیە کە تۆ باسی ئیش کردنیان لا ناکەیت ، توورە دەبوون لێت کە بیری ئیش کردن وا فریوی داوی ! چۆن باوکت زێندو بیٚو تۆش ئیش بکەیت ؟ یان منالٚ کارەیتو لە دنیا نەگەیشتوو ناگاتە دوو رۆژگوزگی دەرەوە قووتی داویت ! ئاوا بە دوو قسە هەرەسیان پیٚ دەهێنایت ، ووشەی یارمەتیو هەنگاو نان لەو

ناوەدا گۆڕ بە گۆڕ کرابوو دەنا باوکت هەستی بە بێ دەستەلاتی خۆی دەکرد ! وازت لەو باسە هێنا بۆ ڕازی بوونیانو بە دڵی پڕ لە گومانو توورەیی‌یەوە لە خۆت دەپرسی (بۆ تۆ هەیت تاوەکو ئیشێکیش بەدەست بێنی !) ژیان مل کەچی چاوەڕوانی بوو . رقت لەو ڕۆژەش دەبۆون کە تۆ چاوەڕوانی دەکەیتو بەم ڕۆژگارانە دەیگاتێ ، ترس ئابلۆقەی داونو قاتو قڕی دەخەنە بەهاری ساڵتەوە ، ژوورەکەتیان لێ دەکردیە زەڕیایە فرمێسکی پەنگ خواردوو و قەوزەی لە گیانت دەڕواند .. پیری دەکردیو خەمەکانیش هەر بە گەنجی دەمانەوە .. زەمانە هەڵ گەڕابۆوە لێت .. دەنا نەبوونی تاکە خەمێك بوو کە خوینەنیان پێ تەرك دای کەوتە زۆرانی گرتنت ، ئەویش لەگەڵ فراوان بوونی دەروونت بە ئەندێشەوە وردە وردە بوونی نەدەما ، خەیاڵ لە دوای خەیاڵ ڕیزیان دەبەست ، یەك بە یەك گەرووی سەرتیان خاڵی دەکردو شورەیان هەڵ دەدا ، خەون لە ئاسمانەوە ڕوویان تێ دەکردیت و جمەیان دەهات .. قاڵبێ ئەندێشە بوویتو دانرابوویت .. لە کوێوە بیرت لە بلەی، ژیان کۆست کەوتوو دەکردەوە بە پاشە ڕۆژت هەڵشاخێ ! ببێتە مرۆڤێك هاوڕەنگی سۆزو بیرت بێ‌و لە باخچەی ژیندا هەنگاوت لە تەك بنێت .. یان بکەوێتە نێو ئەو دەورو بەرەی تێ نەدەگەیشتی لێ‌یو بە بازنەیەکی بۆشت دادەنا ، خۆشت لە چەقەکەیدا هەر جارەو بە ڕە نگێك هەڵسو کەوتت دەکرد .. وات نیشان دەدا هەموو خەڵکەکە دەناسیو دەتناسن .. خۆشیان دەوێ‌و خۆشت دەوێن ..

هەناسەی ژیان وابوو ، ئەگەر کاروانی دنیاشت لا سەختو گران بوایە نەی دەتوانی ئەو ساتانە وەرگەڕێنی‌و بەسەر وێنەی بیرە تەڵخەکانتدا بیچۆڕێنیتە خوارەوە ، بەڵام کە دەرکت بە ساتەکان کرد زانیت ئارەزووی تۆشی ناوێت کۆشکی خەونەکانت بە ساتێك برمێت .. گاڵتەت بە خۆت دەکرد کە لە قیژە نەزۆکەکانی ئەو لاشە شێتەوە دەنگی ژینی ڕاستەقینە دەبیستی ، ترسو ناخۆشی‌و گشت ڕۆژێکی سندانێکە .. بلە ڕۆژو شەو بوو .. سات بوو .. ئاوێنەیەکی ترسناك بوو خۆتت بە لاوازی تێدا بینییەوە ، بێزت لە خۆت دەبۆوە بێ هوودە دەژی‌و توانای هیچت نی‌یە ، ئیتر بیر لە چی بکەیتەوە ! خۆ هیچ خەونێ نەی‌دەتوانی لە پێش چاوتدا بسرەوێت ، لە لایەکیشەوە چارەنووست بە گرژو مۆنی دەمو چاوی ئامە دەشوبهاندو توورەیی لێ دەباری ، ئەوەندەت پێ دەکرا بیخەیتە بەر ڕێژنە جوێن ، چارەنووس .. ! گاڵتەت پێ دەهات ، ژیان بریتی بوو لە قەوانەی ڕۆژێك‌و بە درێژایی تەمەن بێ کەمو زیاد لێ دەدرایەوە .. ڕۆژگار دەهاتو دەڕۆیشت .. چەپۆکی دەکێشا بە تەمەنتداو کاسەی سەرتی بە خەم دەتەنیت . گێژ دەبوویت ، لە حەسرەتدا هانات دەبرد بۆ خەونەکان . شل دەبوویتو خۆت دەدا بە دەستیانەوە .. هەر ئێوارەش دەهاتو پێڵوی چاوت لێك جیا دەکردەوە خەمەکان دەیان کردە کێشمە کێشو زمانی ترسەکەتیان دەهێنایە گۆ ، توورە دەبوویت .. دیسانەوە لە ڕاستی ژیانی باخی دەبیتو تقوومی خەونێ دەبێ هەرگیز نایەتە دی ، ئازار یاری بە مێشکت دەکردەوە .. ساتەکانیش وردو لەسەر خۆ نامۆیی‌و کەساسیان پێ دەناساندی .. بە دەست خۆت نەبوو هەناوت بۆن پرسەی ڕازە بێ ئاوانەکانی لێ بەرز دەبۆوە ، هەستت دەکرد دوو گیانیتو لە جەستەیەکدا هەناسە دەدەن . یەکێك بە پێی خەون دڵ گەورەیە .. سڵ لە هیچ ناکاتەوەو هەنگاو دەنێ ، ئەویدیشیان خەفەتبارە .. ڕق لە ژین دەبێتەوەو شەق لە سێبەری خۆی هەڵ‌دەدا ، لە نێوانیاندا دامابوویت ، ئەم دوو کەڵە گایە بەرامبەر یەکتر دانیشتوون ،و شیرو تیر لە یەك دەسوون . جگەرت دەبرنو هاکا ڕۆژێك لە ناویان بردی ...

ئێوارە دوژمنت بوو ، تەڵەزمی ترسی تەواو لەبەر پێتدا هەڵ دەهێنا . ئێستا نا ئێستا زرم بە تەوق سەردا دەکەوتی‌گرنگە ئەوە بوو هەموو شتێك ئامادە بکەیتو بۆ جامێ ئاو نەچیتە دەرەوە ، ئەمشەوت بە ئەوانی پێشوو نەدەچوو گوێ نەدەیتێ بە دیار ئیشەکانتەوە، سەرما رەقت بکاتەوە.. هەرچەندە باوکت لەبەر باران کەپرێکی شێوە چوخمی بۆ دروست کردبوویت ئەگەر تەڕیش بوویتایە کە دەتروانی‌یە دەرگای ژێرخانەکەیان پێوەدراوەو خنیونەتە ژووری باکت نەبوو ، بەڵکو دوای ڕیچکەی ژیانیشان دەکەوتی‌و بارانو سەرمات لەبیر دەچۆوە.. وەك مێروولە دەژین ، بەهارو هاوینان دایکی ئازووقە دەخاتو بۆ زستان دەخزێتە ژووری... کپ دەبوون ، تەنیا دوو سێ جار نەبێ گوێت لە دەنگی دایکی بوو دەینالاند بە دەستیەوە.. ناحەقیشی نەبوو ، خەڵك منال بەخێو دەکات لە ئەنجامدا گەورە بێ بەلام بلە تەمەنی نەك لە بیست ساڵ تێپەڕێت لە پەنجا ساڵیش وێجا هەر منالێکی ساوایە بۆ دایکی ، بیشواتو پاکی بکاتەوە .. قور بەسەرە مەقاشیان لێ بدایە گۆشتی نەدەگرت ، دەتووت بۆ دوو ساڵیتر سەری لە گوێی قەبر دەلەرزێ .. بۆ ئەو منالەو بۆ تۆش پیاوێکی سمێڵ بابرەو چاوەڕوانی ڕۆژێ دەکات پەلامارت بدات ..

بە دیار لۆکزەکەوە سەرنجی خەمت هەڵ‌دەچنی لە خافڵانێکدا شەقەی باڵی دەرگاکەو قیژەو هاواری بلە پرژایە حەوشەکەوە ، وات زانی لۆکزەکە بە سەر تدا تەقییەوەو بە تیشکە ئاگرینەکانی گازی لە پارچەکانی لەشت دەگرت ، سەرت گران بوو ، بە لۆژە لۆژ گیانی پەشۆکاوت بە دامێنی پەنجەرەکەوە هەڵواسی‌و چاوەکانت تێبڕی ..لەژێر دەستی دایکیدا گوڕووی

گرتبوو . به لوورەی دەنگی نیمچە تاریکی حەوشەکەی پەنگانبۆوە . سواری کۆڵی خۆی دەبووو لە ناو قورەکەدا تلی دەدا .. شەیتان لە کەلەی دابوو ..گڵی دیوارەکەی لەنێو چنگیدا دەهاڕیو بەسەر چرچو لۆچی دەمو چاوی دایکیدا تۆوی دەکرد . ئەویش بەسەر خۆیدا نەهێناو تەکانیدا هەڵیسبێنێتەوە .. هێزی خۆی هێندە بەکاردەهێنا لنگەکانی کەوتنە ئەرزین ..ماندوویێتیت لە ئەو ناوەدا دەبینی چۆن پڕیشکی هاویشتبوو .. باوکت لەولاوە دەرکەوتو کێلونی دەرگاکەی نایەوە یەك . لەگەڵیدا بلەیان بەرز کردەوە . دار عەموودێك بوو . لە وێنەی پاچو تەور بە قاچەکانی وورگی ئەرزەکەی هەڵ دەدری . چرنووکە ئەفسونیەکانیشی وا لە بینی دارەکە گیرکردبوو دەتووت لە ڕەگو ڕیشەوە دەری‌دەکێشێت . دووریان خستەوە . دوای ئەو ڕۆژی حەشرەی کردیە بەر ئێوارەکە وەك گۆلکێکی بزێو وەدووی دایکی دەکەوتو قۆچەکانی لە پشتی دەسوو .. شلپو هوڕی ئەو ڕەهێڵەی تی‌پەڕی نقەی لێ بڕی‌بوویت . تروسکەی چراکەیان بە کزی دری بە تاریکی کولانەکەیان دەداو سێبەری ژاکاویانی لێ دەکردیتە دیمەنێکی ترسناك تر .. ئەژنۆت دەلەرزیو دڵەکوتێکەت لەنگەری لەشتی پێ نەدەگرتی . قەیری لە خۆت ڕامایتو خۆت توند دەگرت هەستت پێ نەکەن بەو حاڵەوە خواردنیان بۆ ئامادە دەکەیت ..جگە لەوەش خۆت لە دواندنیان دەدزییەوە .. دەستپێشکەریت لە پرسیاریان دەکردو وا تێت گەیاندن کە لەوەوپێش نانت خواردووەو برسیت نی‌یە . خوت بە چا لێنانەوە دەخڵافاندو ورتەت لێوە نەدەهات ..

هەڵمی لیپوزی کتریەکە وەك تەمێکی لێ دەهات ئەستێرەی مرکی زایەڵەی دەنگیان بخاتە پرتە پرت .. کوندە پەپووی ئەشکەنجەی شەویش لە گومەزی سەرتدا دەکەوتە وەنەوز (تۆ بلێ‌ی شەوم لێ بڕوات ! خۆزگە ئێستا هەموو شتێك تەواو دەبووو زوو بچووینایە نێوجێ . بەڵام ئەمانە ..! تا نانەکەیان دەخۆنو هەر بە سەعاتێك چایەك دەخۆنەوە .. خۆ ئەمشەو دڵم دەتەقێ . چی بکەم ! خۆم بە چیەوە خەریك بکەم ! ئارەزووی چنینیشم نی‌یە ..وەکو زۆر بچمە دەرەوەو لەبەریان بکەم ئاوا خۆم گێژ کردووە بە دەستیانەوە . قوتابخانەکە بوو .. کاشکای چوار ساڵ لەمەوپێش عەقلی ئێستام هەبووایە .. لێشیان بدامایە دەستم لێ هەڵ نەدەگرت ! چیان لە من نەکرد ؟ جی‌ی سەیرانو هەموو خۆشی‌یەك خانوویەکی سەد ساڵ لەمەوپێش دایانناموو بلەیان خستە بەر لووتم .. سەیر ئەوەیە تا ئێستاش هەر باسی ماندوویێتی خۆی دەکات ..! نازانم ئەی ئەم حاڵەی من چی پێ دەووترێت ؟ ڕاستە تۆ هیلاك دەبیت .. بەڵام ئەگەر بی‌پێوون ئێستا سەری ئاوساوم زۆر لە تۆ شەکەت ترە .. دەشڵێ خەمی دنیا ! دەتۆ وەرە ڕۆژێك لە ژیانی مندا هەناسە بدە .. ئای کە ترس چۆن ماندوویێتی گشت جیهانت پیشان دەدات ..!) لەگەڵ خورتەو بۆڵەی دەروونت هەڵ دەسوڕایتو چات لەبەردەمیان دادەنا ..

دەستی لەسەر دوگمەی ڕادێکو دانا بوو بەجیهاندا گلۆر دەبۆوە . هەر ئێزگەیەو لە نهێنی سەرنجێکدا بە ڕەنگێك جمەی دەهات ..سەرنجی تۆش بە دەنکەکانی تەزبیحەکەی دایکتدا هەڵ‌دەگەڕاو بە دوای پاشە ساتدا هەناسەکانت دەژمارد .. پاش ماوەیەك کەوتنەوە قسە . تێ نەدەگەیشتی باسی چیان دەکردو سبەینێ بۆ کوێ دەچن . ئەوەندە نەبێ کەشەوی هەینی‌یەو دایکت هەڵ دەستێ بەلای نوێژی ووردو دوعاوە .. حەزت نەکرد لەوەش گەیشتی . وەك فیشەکە شێتە بەسەریاندا تەقیتەوە ! دوو چرکە بوو . کە زانیت بێ سوودەو قسەکانت با دەیبات پشووت خواردەوەو بێ دەنگ بوویت . قسەت بۆ کێ بکردایە ! ئەو بەرماڵی خەمتی ڕادەخستو باوکیشت پاڵی دابووە پشتی‌یەکەو ئانیشکی بۆ سەریو ڕادێوکە کردبووە سەرین . ئەو قەتارۆڵاوەیسی‌یەی لەبن گوێشیدا هارەی دەهات ئەوی بەلای خەو دەبردەوەو پەستیشی بە سیمای تۆدا هەڵ دەخست . ڕووت بەم لاولادا دەگێڕا هیچ شتێك تاوی نەدەدایە خۆیو نیگات بگرێتەوە .. وات دادەنا گشت نەگبەتی‌یەکانی جیهان لەم شەودا گردبوونەتەوەو سواری سەرت دەبن . بە یەکجاریش لە کۆڵت نەدەبوونەوەو دڵت بوەستێنن بەڵکو بێ گومان بوویت کە لە شێوەی ئەو.. چاوەڕوانی‌یەی هۆگرت بووە نمنم ئاورشێنیان دەکردی ..

بەر لەوەی توورەیت لە ورێنەیەکی سەرەڕۆدا کزربێتەوەو ساتەکانی پی‌مەستو وورکەیت چۆن وێنە بیرت کردبوو بە تاڵێ دەزوو لای نەدەدا ..لە هەمووی گەورەتر پێچی سکت بوو دونیای خەونە ئاڵۆزەکەتی دەژاکاند .. لاربوونەوەی باوکتو هەڵبەز و دابەزی دایکت سەغڵەت تریان دەکردی . گرمۆڵە دەبوویتەوەو وورەت وەبەر خۆت دەنا .. کەڵکی نەبوو . ئەو سەرکەشە هەر دەی بردیتە دەرەوە ، چیدی توانای خۆگرتنت نەبوو ئارامی لەرادە دەرچووت تەکانی پێ دایت بۆ هەیوانەکە .. ئەنگوستە چاوی حەوشەکە و کزە چرای ژێرخانە کەیان وەك تونێلێك بوون شاخی سەرنجەکانتی دەبڕیو بە شێوەی تەزووو موچڕك بەردەبوونە گیانت ، ئەو ترسەو ئەم بەڵایە هەر یەکەو ئەوی دیکەیانی دەبەزاند لە دەروونتدا بەڵام ژانی سکت لە مەزنیدا سێبەری بە گورچیلەکانت دابوو . لە عەزرەتدا خۆت بە دیوارەکەوە هەڵ دەپەستێرا .. وات زانی پاڵێکی توندی پێوە نایت لی‌ی جویێ بوویتەوە بە هەردوو لای حەوشە خوارو خێچەکەدا ملت دەگێڕاو بەتاریکی دەتپشکنی ، دەتوویست بڕۆی کەچی هەنگاوت لە

دوو نەدەهاتن‌و بە زرم‌و هوری دڵە لە پەل‌و پۆ کەوتووەکەت دەستەوەستاند بوو بوون . داری ترسەکەت بەری گرتبوو .. چاوی پڕکێی فرمێسکاویشت بۆ تۆڵە کردنەوە مەشخەڵی دادەگیرساند ! پێت نا بە دڵی خۆتداو قاچە سڕبووەکانت کەوتنە سەما .. هەموو لەشت بوو بووە چاوو گوێ .. ئەگەرچی بەردەمی خۆشت تەواو نەدەبینی ! تا گەیشتی‌ یا ساردەکەی یاری بە قژت دەکرد لێت دەبووە مشتی چرنووکاوی ئەووپشت ملتی دەگرت .. هەر ئەوەندەی گران بوو .. بەڵام بۆ دوایی‌یەکەی .. چونکە جیّ سمی چاوە بزەکانی بلە لە خۆت چەقی بوو تۆش فێر بووبوویت لەم سەرەوە وەك ڕم دەرچیت‌و بە هەیوانەکەوە گیربی .. دەتووت کێوت بڕی‌بوو سەرتاپای لەشت ئارەقی لیّ دەچۆڕایەوەو کەوتبوویتە هەناسە بڕکیّ ! خۆ پرمیشی پێدا بکردیتایە هەر ئەوەندە نیوە مردوو دەبووی ! گەرووت کردەوەو ناخی گەرمت بە شنە با ساردەکە لیّ پڕکرد . بە تیلی چاویش دەمەلاسکەی کەمەربەندە زەردو لاوازەکەی تاریکی حەوشەکە کردو هەڵنیشتیتە ژووریّ .. هەموو شتێك وەك خۆی مابوو ..پڕ خەپرخی باوکت‌و سورەتەکانی دایکت سەرچۆپیان گرتبوو . لە ئاستی خۆتدا بە نوێنەکاندا هەڵت دەبوویراو دەستت دەکردە گەردنی فریشتەی خەونەکانت ..

جێگەت ڕاخست‌و چاوی خەم‌و پەژارەت دەرەنجاند . دەت‌وویست خەو ماندووێتیت ڕاپێچ بکات‌و تۆش لەسەر خۆ سەرتی بۆ بکەیتە هێلانە بەڵام پسکە پسکی دایکت‌و گرە گڕی لۆکزەکە شەپۆلێکی بە خوڕ بوو لەبەر گوێتدا بەرزو نزم دەبۆوە . ڕووت سووراندو سەرنجت لە باڵایدا نقووم‌بوو .. کۆمەڵیّ پرسیاری بێ‌سەروبەرە دەستەویەخەت بوون‌و کۆشتیان بۆ تارمایی‌یەکەی کردەوە (چەند سورەت دەخوێنیّ ؟ خۆ خوێندەواریشی نی‌یە ! لە کوێوە فێربووە ! جاران کەی وابوو ! کەچی ئێستا .. چەند جار دەڵیّ (بسم‌الله) ؟ ئەوەیەك ...)

چریکەو دەنگی پڕ هاواری دەرەوە چەکوشێك بوو بەر زنجیرەی مێشکت کەوت‌و لە جێگەکەدا ڕاپچەنیت .. ئاوڕێکی چوستت دایەوە بۆ پەنجەرەکە دەنگی زەلام بوو لە وێنەی خەزاندا بێ‌دەنگی حەوشەکەی لوول‌دەدا .. وەك شتێکت لیّ‌وون بووبێت بە چاوی لە دووگەڕانت گۆشە نیگات دەگرتە دایکت بەپەلە سەلامی دادەیایەوەو سەرسامی‌یەکەی دەپچڕاندی ..

– ئەوەچی قەوماوە ؟!
– نازانم .. !
– ئاسەیربکە .. بزانە ..

باوکت ڕاپەڕی‌وبەدەم‌و چاوە خەواڵووە کەیەوە ئەوەندەی‌تر دەی تۆقاندن . تەپەتەپی هەنگاوێك لە ژوورەکە نزیك بۆوەو باوکتی نەبیّ وەڵامیدا خستە سەرپیّ . مێردەکەی خونچە بەهەڵەداوان خۆی کرد بە ژووردا ..

– کاك غەریب هاتووم ئەو لۆکزە بەرم ..
– بۆ؟ چی بووە ؟!
کوڕە بلە بەسەر زۆپاکەیاندا کەوتووەو خۆی سووتاندووە ..
– چی ؟! دەها .. با لۆکزەکە بەرین ..

دایکت خێرا شوێن پێیانی هەڵگرت . لەشت کەوتە لەرزین . لەو چۆڵی و تاریکی‌یە دەترسای ئالوودەی گیانت بێ‌و جزە لە دڵت هەڵسێنێت .. دوویان کەوتی .. لە دوورەوە ڕووناکی ژێرخانەکە بە هەتاوی هاوینان دەچوو سەروگوێلاکت شەکەت بکات . وەلیّ دەنگە تێك هەڵچووە مەنگەکەیان وەك نەوایەك دەهاتە بەرگوێت تەریکی دڵی ماتەمت ژەنیّ .. دەنگی هەنگاوەکانیشت واهەستیان پیّ‌دەکردی بێچووە باڵندەیەکی ڕەوەکیت تەڵەی ئەو وەیشوومە گرتویتی‌و لەناچاریدا بەرەو کولانەی دوژمنەکەت مل‌دەنیّ‌ی . بۆکڕوز لەگەڵ باکەدا دەستیان لە یەخەی یەکدابوو .. لەبەر دەرگاکەیاندا سووك بەرامبەر ئەو گەڕەلاوژەیە چەقیت .. دایکت‌و خونچە بەسەر سەری ئەفتاوەوە چۆکیان دابوو . دەستیان ڕادەوەشاندو زلەیان بە ڕوومەتەکانیدا دەکوتی تابێتەوە هۆش خۆی .. دەنگی مێردەکەی خونچە وێنەی ئەمانی لا دەژاکاندی‌و خۆشیت نەدەبینی . بەجووت پلیکانەکەدا چوویتە خواریّ . خۆت بەکەلێنی دیوارە گڵینەکەی دەم دەرگاکەیاندا شۆڕکردەوەو لە نهێنی ناودەوە وورد دەبوویتەوە .. لەبەر پشتی باوکت دەم‌و چاوی بلەت نەبینی کە بە ناڵەناڵ ژوورەکەی پڕکردبوو . بەتانی‌یەکی بۆزی قەراخ سووتاویشیان دابوو بەقاچە بزێوە درێژەکانیدا .. لە پشت باوکتەوە زۆپاکەیان یەکالا کردبۆوە سەتڵەکەی تەنشتی دەمەو نخوون .. ئەو ئاوەی پیاشیاندا کردبوو چۆڕاوگەی بەستبوو و لەژێر دایکیدا بوو بووە زۆنگاو . لەولاشەوە لۆکزەکەیان لەسەر دوو سندوق دانابوو لەبەر تۆز نەت دەزانی چ ڕەنگێکن‌و خستویاننەتە بان یەك ..

قسە بۆن تانە‌یی‌یەکانی ئامەت ناسیەوە . توانجی لە خونچە دەگرت‌و ئەو کارەساتەی دەکردە بیانو . لە سووچی ئەمسەری ژێرخانەکە دەستەکانی خستبووە کەلەکەیی‌و چاوەکانی بە شێوەیەك لە خونچە بڕی‌بوو دەتووت سەرەتای مانگی تازەیەو کریّ وەرگرتنی دوور کەوتۆتەوە و مۆن دەبۆوە لیّ‌ی .. تەنها سەرپۆشێکی تەنکی دابوو بە سەریدا . ئاگرێجە

سپی یەکانی لەگەڵ چەناگە دێژەکەیدا شۆڕ بووبوونەوەو بۆ سەرەوە پێچیان دابوو . لات سەیربوو وا بە بچووکی سەریت دەبینی ..ئەو دەستە نوشتەو دوعایەشی بە پەتیدا کردبووو بە دەرزی سنجاق دایکوتابووە سەر هێلەکەکەی سەرنجی چاوەکانتی دەفڕاندو بە نەرمە هەنگاو لوتکەی خەمێکی نوێی لە دڵتدا بنیاد دەنا ..

بەو نالەبارییەوە دەت‌بینی . هەر لە دەمو چاوی بلەش نەدەچوو ! نێوچەوان ئاوساو . ڕوومەتەکانی ڕەش دەچوونەوە . ملە هوڕەکەی کەچ دەکردو بەرز دەکردەوە . دەست‌و قامکەکانی بە نینۆکە چڵکن‌و درێژەکانی‌یەوە هەڵ دەبری‌و ئازارە خەستەکەی بۆ ئێوە گەڵاڵە دەکرد . گلێنەکانیشی دوو دڵۆپە خوێن بوون لە چاوە سوور هەڵگەڕاوەکانیدا ئارامیان نەدەگرت .. نێوەندی بەتانی‌یەکەی سەر ڕانی گرت‌و لەرزە لەرز بەرزی دەکردەوەو ڕای‌دەکێشا . قاچە ڕووتەڵەکانی تا ئەژنۆی دەرکەوتن . پێستکە ی داماڵرابوو . کۆمەڵە تلۆق سەر گۆشتە سوورەکەی یەکێ ئاوو ئەوی دی خوێنی تێزابوو .. هێلنجت دەهات . نەرەی ئامەو نوکەی دایکی‌و دەنگەکان نەبووایە چیتر خۆت پێ نەدەگیراو بۆ حەوشەکە تەرە دەبوویت ..

– ئافتاو بێ قەزابیت چۆن پێش ئەوەی بنوویت زۆپا بە داگیرساوی جێ دەهێڵی ! نازانی ئەم کوڕە شێت‌و لاڵە هەست بە هیچ ناکات !

– دەستم بشکێت .. خۆ تۆ نووستبووی .. لە کوێوە هەستایەوە بۆ ئەم ئاگرە ؟!

– زۆ پا دانەگیرسێنی جارێکی تر ، ئەوە زستان تەواو .. ئیتر چی ! ئێوە دایم ڕەق بوونەتەوە ..

– خۆزگە ژوورە سەرسڕەکە ڕەق دەکردینەوە بەڵام تۆ وات لێ نەهاتایە .. بمرم یاخوا ..

– ئافتاو گیان خەفەت مەخۆ ، دوعا بکە هەموو گیانی هەپروون نەبووەو تەنیا قاچیەتی ، ئەویش خوا گەورەیە .. هەر چاك دەبێتەوە ..

سەرت نزم کردبۆوەو لە ژێرەوە بە تیلی چاو دەمو چاوی بلەو دایکیت بەراورد دەکرد ، نوزە نوزو هەنسك بە گشت جێ‌یەکدا بڵاو بوو بووەو بە تەوژمە لافاوی فرمێسك دەڕژایە دەروونتەوە ، لە چاوە سوور بووەکانیدا بێ دەستەڵاتی‌یەکت بەدی دەکرد بۆ چەقاوەسوو ییەکەی تۆبەی دەکردو بۆ پارانەوەش نەی‌دەزانی چۆن دەری‌ببڕێت ! لە کاتێکدا نەزانی هەست بە چی دەکات‌و ناکات .. دڵی لاوازی دایکە مات و مەلوولەکەشی لەتەك سەریەوە وەك مۆم دەتوایەوە .. ڕووداوەکەت لێ دەبووە کۆتەرەیەك ڕاستەو خۆ لە گەڵا ڕێزانی دڵتدا سەقام گیر دەبوو . ورێنە دەیگرتی (لەمەولا ناچیتە دەرەوە . هەر ناتوانی بشجوڵێیت .. دوعام لێ کردی .. ئ .. زۆریش .. تۆبڵێی ئەوە بێ‌و خوا پێی نواندبێ ! چەند ساڵە بۆ وات لێ نەهاتوو؟! ئەمڕۆش بە تایبەتی ! دوعای من بوو .. ئەگەر دایکت پێی دەزانێ هەموو سەرو قژم دەڕنێتەوە ..بەڵام تۆ بۆ هەستایت ؟ بۆ کوێ دەچوویت ؟..)

تاریکی وەك شووشەبەنی تابلۆیەکی تەڵخەو شەق بردووە . ساتەکانیش درز و هێڵە باریکەکانی نێو وێنەکەن ..کە هەناسە دەدەی بە شێوەی زەردەواڵە وروژم بۆ شانەی سەرت دێنن (ژوورەکەیان زۆر سارد بوو ! ئەمانیش وا هەڵ دەسووڕان وەك بۆ بەیانی جەژن بێت .. لێفەو بەتانی‌یان بۆ ڕادەکێشانە ژووری . ژوورە تەرەکەیان ووشك کردەوە . ئەم شەو بە کەماڵی ئیسراحەت دەنووێ .. ئەی ئازارەکەی ! خەوی لێ دەکەوێ ؟ ئەوە بلەیەو من دەیناسم .. چۆن لە ژوورەوە ئۆقرە دەگرێت ! هەر دێتە دەرەوە . چی دەکات ؟ دادەنیشێ ! دێتە بەر دەرگەکەیان . ئانیشکیش دەخاتە سەر بەردەکە .. چۆلەکەکان بە ڕیقنە خۆی‌و بەردەکە سپی دەکەنەوە ! منیش دەبێ هەر تەماشای بکەم .. خەفەت دەمکوژێ . هەر سەیرکردنێکی مردنێکە .. ئەم حەووە ڕزگارمان نابێت . چی بکەم ؟ خۆزگە ڕازی دەبوون ئیشم بکردایەو ئەمژینەم لە کۆڵ ببوایەوە .. تا ئێستا ترس‌و ئەوەی تریش بە خەفەتی ئەمەوە .. بەردێ پێداهاتنەوەی دڵم نە تێدان دەخەت .. توانای چیم ماوە جە ئەوەش ! من کەی توانیومە هیچ بکەم لە چاوەڕوانی زیاتر .. بەڵام ئەمە زیاتر دەی‌وەستێنم ، خوای دەکرد دەریشیان دەکردم . بۆ دەرم دەکەن ؟ خۆ منیان خۆش دەوێت .. ناتوانن .. هەر ڕازیان دەکەم .. خۆزگە وا بووبە .. ئەو کاتە بۆ خۆم دەحەسامەوە . یا ماندووش بم .. ئەمە باشترە . گرنگ ئەوەیە هەوڵ دەدەم ..کێ فریوم دەدات ئەگەر من ئاگام لە خۆم بێ ! لە شوێنێکی باشدا .. یارمەتیام دەدەم . ئەو دەمە بێتاقەتی نازانم چی‌یە .. ئەگەر لێرە بڕۆیشتینایە چیم دەویست ! ئای .. دڵیان خۆش دەکەم ....) ئەو هەناسانەی خەمیان قووت داوە لە وێنەی پەڵە هەورەکانی ئەمڕۆ بێ هێزن .. تاریکی ژوورەکە دەیان کوژێ . لەسەرخۆ خەویش دەکاتە میوانت ..هێندێکی تر پێش ئازانی چۆن خەونەکان دەتگرنە باوەش‌و بە هێمنی سەری گەرمت ڕادەژەنن ..!



# پەردە شینە

چیرۆکی : ئۆلیس گۆنشار
بدران احمد حبیب وەریگێڕاوە

-1-

بەچاکی دەتبینم، لە زنجە بەرزەکەی سەر تەپۆلکە کێوەکان وەدەردەکەوێت و بەرەو ژێر دەروانی. دایکت بانگت دەکا: (تێریزا) بەڵام تۆ هەست و خوستت لە خۆت بریوەو ورتەت لە زاری دەرنایە.

(کچێ تێریزا !)

بەڵام تۆ هێشتا وەستاویت و بەدەم یەکێکەوە دەگرژێیتەوە.

رەشەبایەکی توند بەنێو گەلیو دەربەندی کێوکانی (ئۆرا)دا ورشەی دێت. بەهار لە ئاسمان و زەویدا بە ئارایشت کەوتووەو سەوزە بەروو لە نشێوەکاندا لەرزانە دەکات.

تاوێرە بەردە ئاوەسووەکان بەدەم تیشکی هەتاوەوە دەچریسکێنەوە.

دایکت دەپرسێ :

(تێریزا، ئەمە بەدوای چیدا دەگەرێیت ؟)

تۆش دەستت بەرەو ئاسمان بەرز دەکەیتەوە:

(دایکی شیرینم، تەنیا خوای گەورە لە ژووری سەردا دەزانێ بەدوای چیدا دەگەرێم،) ئاسمانی شین و بێ‌سەرو سنووری بەهار لە ژوور سەرتەوە پاك و بێگەردو بڵند دەڵێی زرینگەی زەنگۆڵێکی شینە لە هەوادا زایەڵەی دێت و دەنگ دەداتەوە.

-2-

بەدوای چیدا دەگەرێی ؟ گوێت لە چی گرتووە؟

چتۆ باوبۆرانێك هەڵی کردبوو ! ئەو کاتەی من پێتێکم بە میناى پەنجەرەکەدا کێشا وا پێ‌دەچوو کەس بە دەرەوە نەبێ. هەستم کرد دانیشتووی ناو زنجەکە هێشتا نەنووستوون بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەس وەڵامی نەدامەوە. دیارە بریاریان داوە چۆن هەڵسوکەوت بکەن. بەفری سەر گوێسوانەکە هەڵوەریو پرژایە سەر چاوم.

رەشەباو بۆرانەکە بەنێو زوورگ و هەڵەتی چیاکاندا دەمیرکاند، گرم و هۆری بوو.

جارێکی تریش زۆر بە پارێزەوە پێتێکم بە پەنجەرەکەدا کێشا لەترسی ئەوەی نەبادا کەسانێك لە ژێری ژێرەوە هەبن و سۆسەی ئەم لە پەنجەرەدانەی من بکەن.

(کێن ئێوە ؟)

چی بڵێم ؟ ئێمە کێین ؟

(خۆمانین،) گوتم. بەڵام دەنگم واکەوتبوو تەنانەت خۆمیش هەستم بە دەنگی خۆم نەکرد.

سێ رۆژی خشتە بەم کەژو کۆسارەدا هەرادەکەین، لە جیاتی ئاو بە بەفر تێنوێتیمان شکاندووە.

(خۆمانین ،) ئەمجارە بە دەنگی بەرز گوتم.

چۆن تیرۆژە رووناکییەك وەبەر مینای پەنجەرە دەکەوێو تیشك دادەتەوە وشەکانی منیش ئاوها بەرەو دواگەرانەوەو دەنگیان دایەوە.

(دایە، رووسیایین !)

دەرگاکە بە شێنەیی کرایەوە. منیش بە خۆم و تفەنگە تەماتیکەکەی دەستم، پەنجە لەسەر پەلەپیتکە وەژوور کەوتم، پیلە تیشکدەرەکەی نێو دەستم داگیرساند.

تیشکێکی بازنەیی دایکتی رووناك کردەوە، ئەو کاتە شانی دابووە پاڵ مێزێکەوە، لەترسان هیشك هەڵاتبوو. تۆش لەتەك جێو بالینگانێکی بەرز بە پێوە وەستابووی. برچە درێژو پەریشانەکەت رژابووە سەر سنگ و بەرۆکت. پیلەکەم کوژاندەوەو پێم گوتیت پەردەی پەنجەرەکان دادەیتەوە. دایکت وەرسووڕا چرایەك دابگیرسێنێ. شەمچەیەك لە ناو دەستیدا بریسکەی لێ‌هەستا، تۆش بەپێی پەتیچوویە سەر مێزەکە بۆ ئەوەی پەردەکان دابدەیتەوە.

نیگام بەسەر پووزو بەلەکە سپیو تەرو برەکانتەوە لەنگەریان گرت، تەنانەت کاتێك سەریشم بەردایەوە، هێشتا بە تیلایی چاو هەرلێمەوە دیاربوون.

بازێکت هەڵداو لە مێزەکە هاتیە خوارەوە، لێك نزیك کەوتیەوە. سەرنجێکی جل و جینگورە سپیە شەپرێوەکەی خۆمدا. تۆش کراسێکی سپیت لە بەردابوو دەسبێنێکی رەشت لە مەچەك بەستابوو.

(کەواتە رووسیایی ئاوهان !)

(بۆ پێت وابوو چۆنن ؟)

(هەروا ...)

دەستت بەرزکردەوە. بەڵام دەستی من سووروو لەسەرما

ڕچیوو بوون، دەسرۆکێکی پیسی چڵکنی تێوە پێچرابوو. دەسرۆکە تا سەر پەنجەکانیشم هاتبوو و جێی دەسکێشیشی گرتبۆوە. چونکە لە کێشمەکێش و ڕکەی ئەو چیاو هەڵەمووتە ڕژدو تووشانەدا دەسکێشەکانم بزرکردبوون.

(کێ هاتوچۆی ئێرە دەکا ؟)

(ئەمڕۆ کەس نەهاتووە .) دایکت گوتی. ئێستا لەتەك ئاگردانە بەردینەکەوە وەستاوە، چاوی بریوومەتێو بە داماوییەوە سەیرم دەکا.

(بۆ کێ ڕەشت پۆشیووە ؟)

(بۆ فرانتشیك .) دایکت گوتی.

(بۆ کۆماری چیکۆسلۆفاکیا .) تۆ گوتت.

چوومە دەرەوەو نەناو دالانەکەدا ڕۆیشتم. بە پێش هۆڵی مەڕاندا سووڕامەوە. گوێم لێبوو مەڕەکان ڕەوینەوەو باراندیان. فیکەیەکم کێشا.

(چۆنە ؟) ئیلیا گوتیو، وەك شەبەنگێکی سپی لەو دیوو کۆمەڵە پووشەکانەوە هەستایەوە.

(زۆر باشە .)

(سندووقەکەش بێنم ؟)

(بەڵێ .)

چووینە ژوورەوە. ئیلیا کە ئاگردانەکەی بینی، بزەی هاتێ. سندووقەکەی لەتەك دەرگاکە دانا. کلووە بەفری سەرو پۆتەلاکێ تەکاندو، بەلەزەوە گوێیبۆ ئاخاوتنی سلۆواکی هەڵخست.

(بۆ؟ هەردەڵێی ماڵەوەیە .) ئلیا گوتی. (هەموو شتێك تێدەگەم .)

(ئێمەش لەتۆ دەگەین، ئێمە سلۆواکین .)

(ئیدی ـ تێناگەم ـ نەما .) ئیلیا گوتی. (هەر دەڵێی لە وڵاتی خۆمانین .)

دایە، ئاماژەی بۆ سندووقەکەی نزیك دەرگاکە کردو گوتی:

(ئەوە چی‌یە ؟)

(ڕادیۆی کۆڵەپشتە .) تۆ هەڵتدایە.

(ڕادیۆ !) دایە، بەترسێکەوە دەستی هەڵبڕی. (هیزە لای بەن، ئەم سەرەسوڕدەرییە مەهێننە ژوورەوە. ئێوە دەتوانن لێرەبن بەلام ڕادیۆکە نا... هەموو دەردەسەریمان لە سەرینی ئەمەوەیە. بەهۆی ڕادیۆوە فرانتشیکیان گرت .)

فرانتشیکی کوری تا دەرەنگانی شەو بەدیار ڕادیۆوە دادەنیشت، بە دوای لەندەن و مۆسکۆدا دەگەڕا تا ماندوو دەبووو خەو دەیبردەوە. ڕۆژێکیان پیاوانی (تیسۆ) هاتن، ڕادیۆکەیان وردو هەراکردو فرانتشیکیان وەپێش دا. پێنج شەمووی ڕابردوو فرانتشیکیان لە نزیکی سەربازگەکە گوللەباران کرد. فۆهرەری مەزن گوتی فرانتشیك چەتەیە. بەلای ئەوانەوە هەموو سلۆواکێك چەتەو ئەشقیایە. تۆ بڕوانێو بیری لێبکەوە، بابایەکی هەژارو بێ دەرەتان بەدرێژایی ژیانی خۆی دارستانوان بووبێ، داخۆ کابرایەکی ئاوها چتۆ چەتەو ئەشقیایەکی لێ هەڵبکەوێ. بەڵێ باوکەشیان لوولداو ڕاپێچیان کرد، بردیان بۆ ئەوەی سەنگەر بۆ جەرمانان هەڵبکەنێ. (کەواتە جەرمە سەرەی ترم بۆ مەهێنە !)

ئیلیا ویستی هێوری بکاتەوە:

(دایە، ئیش ناکا !)

(نا، تکایە لای‌بە .)

ئیلیا لە ڕادیۆکە نەویو بردیە دەرەوە.

گەرمیو تینێکی خۆش لە ئاگردانەکەوە ئەو ناوەی تەنیەوەو دەتگوت ئەلکهولە دەچۆڕایە گیانمانەوە. موچرکەو تەزووی گەرم بە سەرتاپامدا تەشەنەی کرد. هەستم کرد سەرماو ڕچینی چیا گیانم بەجێ دێڵێ. فەرمانمان پێدرابوو دەبووایە زۆر وریا بین.

سەری سێ ڕۆژان بوو ئاگرمان هەڵنەکردبوو. وەك ماری سپی گینگڵمان دەداو بە نێو هەڵەت و تەمتەکانی سەر شارێیەکە لەسەر زگ دەخشین و بە چنگە کرکێو گاگۆڵکێ سەردەکەوتینە سەر لووتکەی چیاکان بۆ ئەوەی لە نزیکەوە مۆڵگاکانی دوژمن سۆسە بکەین. ناو بەناو گوێمان لە سەمفۆنیایەك دەگرت یان زانیاریی پێویستمان بەهۆی دەزگاکەمانەوە وەردەگرت. هەمیشەش دەبووایە رووکارمان بگۆڕین. ئەگەر پیاو ڕێ بە چیایان نەباو شارەزا نەبێ، ئاسان نی‌یە بە هەڵدێراندا

هەڵبگەرێ بە تایبەتیش ئەگەر شەو بێو بەڵەدیشی لەگەڵ نەبێ. ساتمەمان دەکردو هەڵدەدێراین. ئەگەر ئەو بەفرە ئەستوورە نەبووایە هەر ملمان دەشکا. پێستی دەست و پێمان دادەماڵکان، چۆکمان دەئاوساو جل و بەرگمان تیتۆڵ بەتیتۆڵ دەبوون، تەنانەت دەزگاکەشمان دەشکا.

ئیلیا ویستی پێی بسەلمێنێ کە رادیۆکە ئیدی کارناکات:

(بەڵێ سەرەنگرێ بوونی ئەو هەڵەتانە ئاوهایە،) بە پەژارەوە گوتی.

ئێمە تەواوی ئەرکەکانی خۆمان راپەراندبوو. دەبووایە ئەو شەوە هێلی پێشەوەی شەر ببڕین و بگەڕێینەوە ناو هێزەکانی خۆمان.

ئاوێکی گەرمت رژانـدە ناو تەشتێکەوە. ویستم پەڕۆی دەستە پێچراوەکەم هەڵوەشێنمەوە، بەڵام پەنجەکانم لەسەرما رەجی‌بوون و لەکۆ کەوتبوون.

(با من بیکەمەوە.)

پەنجەکانت شووش باریکان بوون. کاتێ پەڕۆ خویناوی‌یەکەت هەڵوەشاندەوە هەستم بە هیچ ئێشێك نەکرد. پەڕۆیەکەت فڕێدایە سووچێکەوەو دەستە تەڕەکانی منت بە پەڕۆیەکی نەرم و نوێ پێچایەوە.

دایکت گوتی:

(تکایە میوانە رووسیایی‌یەکان فەرموون وەرنە لای مێزەکەو قاوە بخۆنەوە.) تۆش بەردەستیت دەکردین.

دوای ئەوەی سەرو فنجانمان خواردەوە، تۆ خولکت کردین:

(تکایە فنجانێکی تریش بخۆنەوە، لەمێژە چاوەرێی ئێوە بووین، هاوڕێینە.) چاوت لە دوور چاوم بڕی. وام هەست دەکرد تۆ دەخزێیە ناو دڵ و هەناومەوە.

3

جگەرەمان دەکێشاو وەنەوزمان دەدا. هێند ماندوو و کەشەنگ بووین لاکەی سەرمان دەهات، بەملاو بەولادا لاردەبووینەوە. شەست سەعاتی تەواو بوو نەنووستبووین.

گوتت :

(بنوون، تاوێ بنوێژن، من لەدەرەوە دەوەستم و ئێشکتان لێ دەگرم.)

•

پێکەنینو بەرزەپێ هەستاین. گوتت (بۆ ؟) بە پارانەیەکەوە سەیرت کردین.

دایکت داماوو رەنگ پەڕیوو، وەك رەبەنێك دەستەونەزەر وەستابوو وابزانم نزای دەخوێند.

(دایە،) ئیلیا گوتی. (ئەمجارە بە تفەنگ و هاوەنەوە دەگەڕێینەوە. مەرج بێ منیش رادیۆیەکی نرت و نوێت بۆ بێنم، بۆ ئەوەی گوێت لە هەموو دنیا بێ.)

(خوا دەس بە باڵتانەوە بگرێ،) بە نەرمێکەوە گوتی.

(تێرێزا هەرۆ میوانەکان بەرێکە.)

ملمان لە تۆف و زریانەکە نا، بایەکی ساردی دەست و پێ‌رچێن بەردەم و لووتمان کەوت وسۆمای چاوی بردین. گەرمی‌و رووناکی‌و هەست و سۆزی مرۆیانمان لە دواوە بەجێهێشت. لەبنی‌بنەوە، لەشوێنێکی نەدیوو، وەك بڵێی لە تەپانی بنی بیرێك بێ، شەرێك دامەزرابوو دەیگرماند. پەیتا پەیتا برووسکەو تیشکی نێو تەمتومان و تاریك و لێڵە لەودیوو بەردەشینەوە بە ئاسماندا دەپرژا. بەردەشینە- ناوی سەر نەخشەی ئەو گوندە چیایی‌یە بوو، بەڵام ئێمە ناومان نابوو (بەردەفیلْ) چونکە ماوەیەکی زۆری تێدا نەدەمایەوە. کەپکە چیا لە هەردوو لاوە بەرەو ئاسمان هەڵکشابوون هەر دەتگوت (گرتووخانە)یە.

• شاڵێکی سپی وەك بلوورت لە بەردابوو. پێشمان کەوتبوویو لەم تاوێرەوە بۆ ئەو تاوێر کەڵەمبازت دەدا. لەسەر لێواری کەندالە بەرینەکەی سەرووی شارێیەکەوە وەستاین. تارمایی لۆری‌و ترانکی جەرمانەکانمان لەژێرەوە لێ دیار بوون. شوفێرەکان لە چوار دەوری ئاگرەکان هەڵدەپەڕین و دەستیان هەڵدەوەشاند. هەورو هەڵی بەفری تواوە لەسەر ئاگرەکانەوە هەڵدەکشا.

چاترین رێگای گەیشتنە ئاشەبایەکت پێ نیشانداین. دەستت بۆ درێژکردم وپرسیت:

(ناوت چی‌یە ؟)

پەنجە باریك و بلوورینەکانت خزانە نێو دەستم. هەستم کرد گەرم و گوڕی‌یەك دەچۆڕێتە نێوگیانمەوە. سەرنجم بۆ چیا هەڵەت و تیشە بەردی نێو تەمتەمەکان وەرگێرا، ئیدی بیانەتی‌و

ئامۆیی‌یان لەبەر چاوم ڕەوینەوە.

(پێك دەگەینەوە تێریزا،)

تاوێك بێدەنگ بوویت .

(بەڵێ، واهەست دەکەم چارەنووس وای هێناو یەکانگیری کردین.)

(چاوەڕێم دەکەیت ؟)

(بەڵێ، خوا یاربێ،)

4

گەڕامەوە،

ئەمجارە بەردەشینەو، شارێو، چیایەکان کەوتبوونە بەری ئێمەوە.

لەدوورەوە شوێنە لە دڵ ئاشنایەکەم ناسیەوە. چۆڵ و هۆڵ بوو. لە تەپۆلکەمشکی‌یەکی ڕەش بترازێ چیتر دیار نەبوو. دارو پەردووەیەکی بەسەر یەکدا ڕووخاو سووتاو. دووکێشی ئاگردانەکە، تاك و تەنیا لەو ناوەندە وەستا بوو.

کاتێ نزیکتر کەوتمەوە دایەم بینی، نووشتابۆوە، گاڵۆکێکی بەدەستەوە بوو، لە ئاگرو پەردووەکەی دەژەند . شتێکی دەرهێناو تاوێك تێوەی ڕاما پاشان فڕێی دایەوە. وا پێ‌دەچوو بە دوای شتێکی تایبەتدا نەگەڕێ، کاتی دەکوشت.

(ئێوارەت باش.)

*(ئێوارەت باش.) وەڵامی دامەوە. بەڵام جارێکی تریش بەسەر ئاگرو پەردووەکەدا نووشتایەوە. نەیدەناسیمەوە. کاتێ وەبیریم هێنایەوە من کێم زەینی دامێو تاوێك تێوەم ڕاما. لێوە کرژ هەڵاتووەکانی وەتەتڵە کەوتن. برێك هێور بۆوە پاشان هەموو شتێکی لەنووکەوە بۆ گێڕامەوە.

★ ★ ★

بەیانیی ڕۆژی دوایی هاتن بەدوای مێردەکەیدا.

(لە کارەوە هەڵاتووە،) پۆلیسە جەرمانەکە نەڕاندی.

(شەو لێرە ماوەتەوە،)

(نەهاتۆتەوە ئێرە،)تێریزا وەڵامی دانەوە.

(درۆیـان دەکـەی،) نەڕاندیان. (شوێن پێمان لەسەر بەفرەکە هەڵگرتن. تۆش وەکەڵیان کەوتوویو لەگەڵ کەسێکی تر بەرێت کردووین. شوێن پێ بچووکەکانی تۆمان ناسیەوە.)

هەموو شوێنێکی سەربان و بن بانیان پشکنی. شمەکیان هەڵاوگێڕ کرد. شتیان وردو هەراکرد. دواجار پەرۆکە بە خوێنەکەیان دۆزیەوە.

(ئەمە خوێنی کێیە.) پرسیاریان کرد.

(خوێنی منە،) تێریزا گوتی.

(چۆن ؟)

(دەستی خۆمم بری،)

(درۆمـان لەگـەڵ مەکـە. ئەمـە خوێنی تەرە، کەواتـە ئەشقیایان دادەکەن وانی‌یە !)

که جەرمانەکەی تر ئەمەی بیست بە تێریزای گوت:

(پێشمان کەوە !)

گەڕیان لێ ئاڵاندو بەرەو میکۆلۆفیان ڕاپێچ کرد. دایە بەدوای واندا هەیهێی لێکرد بەڵام نەیدەتوانی بەپێی وان ڕابگا. تێریزا لە بەراییەوە دەڕۆیشت. نەدەگریا تەنیا ناو بەناوێك ئاوڕی دواوەی دەدایەوە.

(بگەڕێوە دایە.) گوتی. (تۆ ناتوانی بەسەر گردان بکەوی.)

کاتێ لە گەلی‌یەکە نزیك کەوتنەوە زوو زوو ئاوڕی دەدایەوە.

(سەیری چی دەکەی ؟) جەرمانەکان نەڕاندیانە سەری.

(دەمەوێ بەردەشینە ببینم .)

(دڵدارەکەت لەوێیە ؟)

(بەڵێ .)

گەشتنـە سەر گردەکـەی کە شارێیـەکەلەوێوە بەرەو میکۆلۆف پێچ دەکاتەوە.

ئیدی چەند هەنگاوێکی تر دەڕۆیو بەردەشینە لەچاوان ون دەبێ. تێریزا وەستا ڕەنگی مردووانی لێ نیشتبوو. ئاوڕێکی دوور و درێژی دایەوە، بەڵام جەرمانەکان دەنگیان دایێ بڕوا.

(تکایە، لێم گەڕێن باشتر سەیری بەردەشینە بکەم و وێنەکەی لە دڵدا هەڵگرم !)

گوتیان :

(تۆ سەیری بەردەشینە ناکەی، سەیری شتێکی تر دەکەی. دڵدارەکەت لە کوێیە)

دایەش هەستی کرد کە تێریزا سەیری لایەکی تر دەکا.

دایانە بەر قامچی‌یان. تێریزا دەستی هەڵبری بەرگری لە خۆی بکاو هەر سەیری دواوەشی دەکرد. تیشك و بریسکەی ئاگری چەکی رووسیایی‌یەکان بە ئاشکرا لە ئاسۆوە دیار بوو. پۆلیسەکان تێریزایان پەلکێش کردو وەپێش خۆیان دا، دابوویانە بەر سەرسالدرەو راپێچیان دەکرد. دەیان نەراندێ کە ئیدی ئاوڕ نەداتەوە. خوێنی لە دەم وچاو دەچوڕایەوە بەلام هەر ئاوڕیشی دەدایەوەو قسەی نەدەکرد. پۆلیسەکان درندانەتر تێیان هەڵدەدا و خێراتریان هەڵدەهێچا. دایە بە دوایاندا رایکرد. پاشان ساتمەی لە بەردێك کردو سەرەنگرێ بوو، تا شەو داهات لەوێ کەوت.

_5_

بیرەوەری کاڵ دەبێتەوەو هەموو شتێك لەنێو دەچێ، تەنیا یەکەمین ئەوین نەبێ. ئەرێ بۆ ئەو دیمەنە بەرێکەوتەو ئەو تاکە سەرنجەم لەبیر ناچنەوە؟

تۆ بۆ من ژیای. کەژوکێوە دوورە دەستەکانی ئۆرا لەهەموو شوێنێك بەدوامەوەن. تادێت لێم نزیکتر دەبنەوە، بەئاشکرایی لێمەوە دیارن. تەپۆلکەکانیان هێشتا بە بەفر داپۆشراون، بەلام لەژێرەوە سەوزە چیمەنێکە لەبەر تیشکی گەرمی هەتاوی بەهار سەرتاپا سەوز دەچێتەوە. زەنوێرەکان دەڵێی گۆماوی شینن، یەکپارچە بەو گڵۆکە بەهارییە رەنگاون کە ئێوە پێی دەڵێن (ئاسمان بارانە).

چاوم دادەخەم ، تۆش بەتۆی شاڵێکی داوێن کورتی سپی‌ودەسبێنە رەشەکەی مەچەکتەوە سەردەکەویە سەر بانیژە دارینەکە. سەیری ژێرەوە دەکەی، سەیری ئەودیووی بەردەشینە، ئەو شوێنەی کە جاران هێلی بەرگری ئێمەی تێدا بوو.

ئێستا ئەوێ بە زەمەندێکی چڕ داپۆشراوەو جوتیارانی سلۆواك شادان و خەندان بەسواری تراکتۆر هاتوچۆی تێدا دەکەن. سەیری ئەو دارمێوانە دەکەن کە لەسەر زەوی ڕووان و لك و پۆپیان بەرەو ئاسمان هەڵداوە.

لەوکاتەدا گەلێك جار پێك دەگەین، لەسەر تاوێرە بەردەکانی بەر تیشکی هەتاو دادەنیشین و وتوێژ دەکەین:

تێریزا : ئەوە تۆ ئەم هەموو ماوەیە لەکوێ بووی؟

من : ئیدی تەواو جارێکی تر لێك جودا نابینەوە.

تێریزا : هیچ ؟

من : هیچ .

تێریزا : شتێکی چاکە ئێستا پێکەوەین. لەمێژە، لەشەوەکەی ئەوێ زستانێوە چاوەڕێتم، هەر دەڵێی هەزار ساڵ بەسەرچووە.

من : منیش وا هەست دەکەم زۆر لەمێژە چاوەڕێتم.

تێریزا : دەستت بێنە. پێت وایە ئەم هەزار ساڵە هیچ شتێکی گۆڕیوە؟

ئێستا وا رابورد. پێویستە تا ئەو ڕۆژەی گژوگیا لەم چیایانە دەڕوێن و هەتاو تیشك داوێ، ئێمەش هەر بژین و بژین. سەیرکە چەند دەوڵەمەندین !

من : نابێ وەك شەوەکەی ئەوێ زستانێ بەپەلە بین. ئەو کاتە هیچمان پێ نەدەگوترا. رەشەباو بۆران لەگەڵیو دەربەندی چیایەکاندا هاروشێت ببوو، نەیدەهێشت هیچ بڵێین.

تێریزا : ئێستا هەموو کاتێکی دنیا هی ئێمەیە. ئێستا هەموو شتێکت پێ‌دەڵێم کە هەنگینێ بوار نەبوو پێتی رابگەینم. گوێت لێمە؟

تەلانە سەوز هەڵگەراوەکەی چیایەکان نیشتبووە نێو تیشکی زەردەپەڕ، بە ئارایشت کەتبوو هاشەی دەهات. ئاسمانی بەهار بەسەر سەرمانەوە بڵندو لووس دەتکوت زەنگوڵێکی گەورەی شینە لەناو لوورەی رەشەبادا زایەڵەی دەهات.

The Blue stone – OLES GONCHAR

Soviet Literature

No 5 (470) 1982

●

# هەرگیز ئەو دەم و چاوەم لە یاد ناچێت

وەرگێڕانی
عبدالخالق احمد قرداغی



شتێکی سەیرت بۆ ئەگێڕمەوە دەربارەی خۆم ئەویش ئەوەیە ـ کە هەرگیز ئەو دەم و چاوەم لەیاد ناچێت . تەنها گیروگرفتی من ئەوەیە کە ناتوانم ناوەکەیەت پێ بڵێم . ئەزانم ئەتەوێ بڵێی چی‌تۆش ئەناڵێنێ بە هەمان دەردی خۆتەوە . بەڵام من وەکو ئەونیم من مەبەستم ئەوەیە کە بڵێم هەرگیز ئەو دەم و چاوەم لە یاد ناچێت .

ئەتوانم زۆر جار لەگەڵ برادەراندا پیاسە بکەم وەئەگەر مانگێکیش بڕوا بە سەریدا ئەیان ناسمەوە لەگەڵ ئەوەش دا هەرگیز نایان دوێنم .

خێزانەکەم هەندێ جار پێم ئەڵێ .. ئەمەوێ ببی بە نوێنەر ..

لە ڕۆژنامەکان دا و چاوەنواری یەکەم شەوی سینەماکان بکەیت و سەیری خەڵکە بەناوبانگەکان بکەیت کە دێن بۆ بینینی فلیمەکان . بەڵام من ناتوانم ئەو ئیشانە بە تەواوی ڕاپەڕێنم . پیاو و ژنە بەناوبانگەکانم بینی بەڵام نەمتوانی پێی بڵێم کامەیان . ئەمە گیروگرفتەکەی منە وەك ووتم ناوەکەی .

هەندێ جار گیروگرفتی ناوەکەی ئەم خاتە هەڵوێستێکی قورس و گرانەوە بەڵام پیاو ئەتوانێ لەم هەڵوێستە قورس و گرانە دەربازی بێ بەیەك ڕێگە یان چەند ڕێگەیەك ئەگەر تۆزێ شارەزای هەبێ .

بە دەوری شارەکەدا ئەسوڕامەوە بۆ هەندێ ئیش کە پەیوەندی بە ئیشەکەی خۆمەوە هەبوو من زۆر زیرەك بووم کە نەمهێشت پیاوەکە بزانێ من ناوەکەیم لە بیرچوّتەوە ناوەکەی «Smith یان Moses»ە ، بەم شێوەیە زۆر کەسم بێزار کردووە بە تەواوی وام هەست ئەکرد کە هەندێ جار ئەیبەمەوەو هەندێ جاریش ئەیدۆڕێنم لە ئەنجامی ئەو یادە سەیرەی کەلە مێشکم دا بوو .

بەبێ دەنگی سەرکەوتمە سەرەوە بۆلای ئەو پیاوەی کە منی نە ئەناسی پێم ووت : وابزانم لەوەو پێش بەیەکتر گەیشتووین ویەکترمان دیووە» .

وەئەتوانم هەندێ شتیشتان پێ بڵێم دەربارەی ئەو پیاوە زۆر جار ئەو دەم و چاوەم لە هەندێ شوێن پێ‌ئەگات . وەکو ووتم سەر ئەکەومە سەرەوە بۆ لای برادەرەکەم وە بیریان ئەخەمەوە لە نان خواردنێکی گەورەدا یان لە یارییەکی تۆپی پێدا یان لە هەر شوێنێکی‌تردا بێت ، کە ئەو دەم و چاوەم لە یاد ناچێت لەوانەشە پێنج دەقەش باسی ئیشەکە بکەین ئەتوانم لە کۆتایدا ناوەکەی بزانم ، بیرم بۆ ئەو دەم و چاوە زۆر جار هانم ئەدات لە ئیشکردندا .

من ئەو پیاوەم لە «Bardfield» دیوەو ئەیناسم . من بە درێژای جەنگ لە Bardfield ئەژیام ، حەزم لەو شوێنەیە هەیە تەنها ٤٠ دەقە دورە لە لەندەنەوە دێیەکی زۆری لێیە کە تەنها چەند میلێك لە ئیستگەکەوە دورە ئەمەش شتێکی گران و بێزارکەرە .

زۆربەی ڕۆژ قەرەباڵغی‌یەکی زۆر لە پیاوان دێن و دەڕۆن بۆ شار .

وەپێویستە کە پێت بڵێم ناوی زۆر بەیان نازانم وە زۆریش بە

خۆشی‌یەوە قسە لەگەڵ یەکتردا ئەکەین . خێزانەکەم سەرزەنشتی ئەوەم ئەکات کە ناوی زۆربەی دراوسێکانمان نازانم ، ئەمەش شتێکی راستەو نکولی لێناکرێت .
ئێوارەیەکی درەنگ بوو تۆزێ درەنگ لە کارگە گەرامەوە، وەشتێکی ناخۆشی‌و گرانە لەم کاتە درەنگانەدا لێرەوە برۆم بۆ ئیستگەکە تا شەمەندەفەرەکە دێت چاوەنواربم .

لە سەرەتادا قەرەباڵغی‌یەکی زۆر لە ناو شەمەندەفەرەکەدا هەبوو ، بەڵام بەرەبەرە ئەو قەرەباڵغی‌یە نەما ماوەیەکی پێچوو گەیشتینە Ellingham کە دوو ئیستگەی مابوو بگاتە شوێنی مەبەستم تەنها دوو کەس بووین لە فارغۆنەکەدا کە مابووینەوە . برادەرەکەی ترم کە تەنها من و ئەو لە فارغۆنەکەدا مابووینەوە یەکێك نەبوو لە برادەرە هەمیشەیی‌یەکان ، بەڵام ئەمزانی کە خەڵکی Bardfield ە ، کە یەکسەر بینیم ناسیمەوە ، من بۆی پێکەنیم کاتێ کە بینیم بەرەو لەندەن ئەڕۆیشت ئەویش پێکەنی بەڵام ناوەکەی پێ‌نەووتم .
ناخۆشترین و گرانترین شت ئەوە بوو کە من نەمئەتوانی باوەڕ بەم برادەرەم بکەم . دەم و چاوی بە ئاشکرا پێی ئەوتم کە ئەم پیاوە خەڵکی «Bardfield» ە وە بیرم لەوە نەئەکردەوە کە لە چ شوێنێکی Bardfield دا بینیومە .
وام هەست ئەکرد کە یەکێکە لەو برادەرانەی کە لە ئیطالیا ئەژیا لە خانوویەکی بچووکی تەنیشت شوێنی وەستانی پاسەکان بەڵام زۆریش دڵنیا نەبووم .

کاتێ کە سەیری خۆمانم کرد تەنها دوو کەس ماوینەتەوە لەناوفارغۆنەکەدا .
دەستم کرد بە قسەکردن وەك دو برادەری کۆن . بەڵام ناتوانم بڵێم کە هەموو شتێك ئەزانم دەربارەی . پیاوەکە زۆر لەسەر خۆو بە هێواشی قسەی ئەکرد بەڵام زوو بڕی‌یەوە . ئەتوانم لە ماوەی (دە) دەقیقەدا بزانم ئیشی چی‌یە . ئەم هەموو کاتە لەم شەمەندەفەرەدا بووین هیچم بە هیچ نەکرد . پیاوەکە دیار بوو هیلاك بوو دیارە زۆری ئیش کردووە لەوانەیە ئەو ئیشە وای لێکردبێ کە نەتوانێ قسە بکات . پێم ووت :
تۆ هەموو جارێ بە شەمەندەفەر هاتۆچۆ ئەکەیت ؟ ئەمە سەرەتای گفت و گۆکەمان بوو ، لەوانەیە زۆر جار بەشتی تر هاتوچۆ بکات ! ، نۆ دەقەی تر بێت ئەڵێ بۆچی‌و چەند کات ژمێر ئیش ئەکات و چ جۆرە ئیشێك ؟ ئەم پیاوە پیاوێکی ئاسایی بوو تەنها خەندەیەك ئەیگرتوو سەری ئەلەقاندو ئەیووت «زۆرنا» بەبێ هیچ ووشەیەکی تر . دەستم کرد بە قسەکردن دەربارەی رادەی خزمەت کردن لە ناو شەمەندەفەرەکەدا ، بەراوردم ئەکردن لەگەڵ شەمەندەفەرەکانی تردا بەڵام دیسانەوە هیچی نەوت تەنها رازی بوو لەگەڵ ئەو قسانەی کە من ئەمکردو تێکەڵاوی قسەکانمی نەئەکرد .
بۆ ئەوەی بە کورتی بیبڕمەوە هەستام دەستم کرد بە قسەکردن دەربارەی ژیانی خۆم . شا نازیم ئەکرد بەو تۆزە ئیشەی کە ئەو بەیانی‌یە تەواوم کردبوو ، یەکسەر کەبینیم دۆزیمەوە هیچ شتێك وەك ئەوە خۆش نی‌یە کە خۆت هەڵکێشی کاتێ کە لەگەڵ برادەران دا ئەکەویتە گفت و گۆوە . دیار بوو ئەمیش حەزی لەم هەڵس و کەوتانە هەبوو ، بەڵام ئەمەش هەر هانی نەدا بۆ قسەکردن . لەبەر ئەوە دەستم کرد بە رۆژنامە خوێندنەوە ، سەرم هەڵبڕی بینیم پیاوەکە سەری بۆ دواوە شۆربۆتەوەو خەوی لێکەوتووە !گەیشتینە ئیستگەکەو شەمەندەفەرەکە لە پڕ وەستا . بەڵام پیاوەکە بە ئاگا نەهات . من برادەرێکی دڵسۆز بووم کە نەمهێشت پیاوەکە بگاتە ئیستگەیەکی تر لەبەر ئەوە بە توندی دەستم خستە سەرڕانی‌وپێم ووت : هەڵسە برادەرە کۆنەکەم ! ئێمە لە کوێین ؛ ، یەکسەر هەڵساو بە خەندەیەکەوە سەیری کردم و لە پێش منەوە دابەزی ، کاتێ کە لە شەمەندەفەرەکە دابەزین شەوێك ی تاریك و باران بە لێزمە ئەباری‌و بایەکی ساردیش هەڵی‌کردبوو .
ووتم باشە ئێستا چی‌بکەین ؟ ئاوڕم دایەوە بۆ دوواوەو بە برادەرەکەم ووت :
«گوێ بگرە تا چارەکێ نیو کات ژمێری تر پاسەکە نایەت ، ئۆتۆمبیلەکەم لە گەراج داناوە ، ئەگەر تۆش ئەندامێکی لەو ماڵە بچوکانە ئەتوانم بت گەیەنم ، لە سەر رێگەکەوە » . ووتی «زۆر سوپاست ئەکەم» . بەیەکەوە بە ژێر ئەو رەهێڵەو بارانەدا چووین بۆ لای ئۆتۆمبیلە کۆنەکەم . ووتی «ئەمە رێزێکە بۆ

تۆ» . ئەمــە دوا ووتــەی قســەکانی بوو کە نیوەی ڕێگەکەمان بڕیبــوو . ئاوڕێکی دایــەوە بۆ لام و ووتی «ئـەتـوانی لێرەدا مبەزێنی» ووتم چی . لێرە ؟ دیارە شێت بووە ، لە بەر ئەوەی تا ...ڕە٥ یار دیش هیچ خانویەك نابیزێ وەکو وتیشم باران بە لێزمە ئەبــاری لەگەڵ ڕەشــەبایەك وەك دنیا کۆتای بێ ، بە هێواشی وەستــام ، دوا شت کە ڕوی‌دا شتێـك لە دوواوە کێشای بە سەرم دا ، هەموو شتێ لەبەر چاووم ڕەش بوو ، تۆزێك لە بیرم دێ کەلە ئوتومبیلەکە فرێی دامە خوارەوە کاتێ هۆشم هاتەوە خۆم بینی کەوتبــوومــە ناو جۆبــارێکــەوەو بارانیش بە لێــزمە ئەباریو ئەکەوتە سەر لەشم لەگەڵ سەر ئێشەیەکی زۆر قورس، ئوتومبیلەکەشم لەوێ نەمابوو ، وە گیرفانەکانم وەك سەیرم کرد هیچی تیا نەمابوو ، هەستام و ڕۆشتم بەرەو Bardfield ڕێك بەرەو «مەڵبەندی پۆلیس» وڵم نا یەکەم خانووە ئەگەر ڕێت کەوتبێتــە ئەوێ . ووتم «زەلامێـك ئوتومبیلەکەی لێ فڕاندوم ، چەتــرە تازەکەم ، کات ژمێرە ئاڵتونەکەم ، ١٥٢ پاوەندو ، ١٠ شنیلین ی لێ دزیوم .

کاتێ کە گەیشتمە «مەڵبەندی پۆلیس» بیرم کەوتەوە و زانیم ئەو پیاوە کێ‌بوو . وێنەکەی لە دەرەوەد هەڵواسرابوو . هەر کاتێ ئەم وێنەیە ببینم «Bardfield » بیر ئەکەوێتەوە . لە ژێر وێنەکەدا ئەم چەنــد دێــرە نوسرابــوون " ئەم پیــاوە داواکــراوە «لە لایــەن کاربەدەستانی پۆلیسەوە بە هۆی دزی توندو تیژی و هەلدانی کوشتن» .

جۆن «John » .... دیسانەوە ناوەکەیم لە بیرچووەوە .

ناتوانم هەرگیز ناوەکەی لە مێشکی خۆم دا هەڵگرم .

بەڵام ئەو پیاوە بوو کە پێم وتبن «هەرگیز ئەو دەم و چاوەم لەیاد ناچێت » .

ئەم چیرۆکە لە کتێبی

« A Book of shorter»

stories وەرگیراوە

لەنووسینی «Cyril Hare» ە





چیرۆکی : عبدالمجید لطفي

منیە بهاء الدین وەریگێڕاوە

ئامێری تەلەفۆن چەند سوود بەخشە کە بە کەسانێکت دەگەیەنێت خۆشت‌دەوێن‌و بە کەسانێکیش کە خۆشت‌ناوێن ، جاری وەهاش هەیە دەبێتە کارەسات ، بە تایبەتی کاتێك کە مرۆڤ تەنیا دەبێت‌و ژمارەی تەلەفۆن بەسەهوو لێ دەردێت‌و پرۆژەی خەوی لێ تێك دەدات .

من لەو حاڵەدابووم کاتێك زەنگی تەلەفۆنەکەی ماڵەوە لە پاش سێ سەهوویوا کە بە لێبوردنێکی بێ تام‌و بۆ پشت گوێم‌خستن ، بەبێ هوچان لێیدا .... لەو کاتەی کە تەلەفۆن هەر لە زریکە لێدانی خۆی‌دابوو ، دەستم بۆ درێژکردو هەوڵیشم‌دا کە بە ئەدەبەوە وەڵام بدەمەوە هەر چەندێکیش بێت تووڕەبوونم ! دەنگێکی ئافرەتانەی ناسکم بۆ هات ، تێیدا دەرکم بە دەزوولەیەکی غەم کرد .

— ئایا لەسەر دووەم قەناتی تەلەفزیۆنی ؟ ئەگەر قەناتەت نەکردووەتەوە ، ئێستا زوو بیخەرە سەری .

وەکو کە دەنگە هێمن و خامۆشەکە بە دوودڵی و غەمەوە دەستی پێکرد ، ئامێرەکەش بە غەم و دوو دڵییەوە قەپات کرایەوە . کاتێکیش ڕێنمایی یە نەناسراوەکە بەسەرمدا زاڵ بوو هەستام تەلەفزیۆنەکەم داگیرساندو خستمە سەر قەناتی دوو . فلیمێکی پیشان دەدا کە دەمێك – بوو نیوەی ڕەت دابوو ، یەکسەر ڕووداوانی فلیمەکەم هاتەوە یاد چونکە فلیمێك بوو زۆر چاکم دەناسی یەوە ، لەبەر ئەوەی بۆ ماوەی هەفتەیێك لە کاتی پیشاندانی دا یەکێ لە سنیەماکاندا بینیم ، ناویشی (بەفری کلیمەنجارۆ) بوو .

لە چرکەیێکی شێواوی دا بیرگەی پڕ لە وەفام بەرەو دوای بردمەوە ، هەمنگوای و ڕۆمانە ناسکەکەیەم هاتەوە یاد هەروەها (ئافا کاردنەر)ی باڵاو نەونەمام و ڕەنگ و ڕووی درەوشاوەی ، جاپشتی ماندووم دایەپاڵ کورسی یەکەو بەشوێن یادگارەکانمدا وێڵ بووم ...

لە کۆتایی تەمەنی کاملیمدا بووم ، کاتێك ڕیزێکی دوورو درێژی چاوەڕوانکەرانم دیت لەبەر دەمی پەنجەرەی بلیت فرۆشتنی یەکێك لە سینەما هاوینی یەکاندا ، لەگەڵ ڕیزەکەدا دەڕۆیشتم کە هەر ئەوەتا بەئاستەم دەجووڵایەوە ، لەوەدابوو کە بگەمە پەنجەرەکە کاتێك دەستێك زۆر بە نەرمی شانی ڕاوەشاندم و وتی :

–گەر بتوانی لەگەڵ خۆتدا بلیتێکم بۆبکری .

پارەکەم لێ وەرگرت و تەماشام کرد ، ئەسمەرێکی شۆخ بوو بە دوو چاوی ڕەش و گەش چەشنی ئەبەنۆسی ساف و لووس ، پرچێکی خاوو تێر ڕەنگی هەبوو کە لەژێر چمکی عەباکەوە دەرچوو بوو ئەو عەبایەی چەشنی زونناری ئاوریشمین لە دەوری دەموچاوێکی هێلکەیی و ناسك و گەشەوە دەسوورایەوە ، لە تەماشاکردنی نەکەوتم تا ئەوەی لە دواوەم بوو نوقورچێکی لێدام بۆ ئەوەی بەرەو پەنجەرەکە بکەومە تەکان . کاتێکیش لە ڕیزەکە دەرچووم و بەرەو دەرگای چوونژوور کەوتمە ڕێ ، بلیتەکەیم نەدایێ و ئەویش هیچی نەوت بە دوای یەکدا چوینە ژوورەوەو لە دوو کورسی تەنیشت یەکدا دانیشتین ، لە تاریکی شەودا هەر دووپێکەوە بەفری کلیمەنجارۆمان دیت .

لە ماوەی پشووەکەدا دوو شووشە ساردمان نۆشکردو بە بێدەنگی گەلێ سەرنجی یەکمان دا ، فلیمەکەش گەیشتە کۆتایی وەکو کە هەموو شتێك کۆتایی دێت ، پێم وت :

- ئنجا بۆ کوێ کچی شۆخ ؟

وتی :– من ژنم و بێ گومان بەرەو ماڵ دەچمەوە .

وتم :– دەتوانم هیچ یارمەتی یێکت بدەم ؟

پرسی : ناوت چی یە ؟

وتم : ئەحمەد جبوورم و لە وەزارەتی دارایی دا کاردەکەم.

بڕێك لەڕۆیشتن کەوت و چەشنی کەسێك کە شتێکی کەو تبێتەوەبیر وتی :

شیعر لە نێو ڕۆژنامەکاندا دەنووسی ؟

– جاروبار .. ئەدی تۆ ؟

وتی : ژنی پیاوێکم و زۆریشم خۆش دەوێت .

پرسیم : ئەدی بۆ لەگەڵت نەهاتووە ؟

تۆزێك بێ دەنگ بوو ، دیسان وتم : داوای لێ بوردن دەکەم حەز ناکەم چەشنی بڕێ کەسان خۆئاخن بم .

وتی : گرفت نی یە وامنیش ڕاستیت بۆ دەڵێم ، لەبەر شتێکی بچووك بووە مشت و مڕمان ، هەر لە سەرەتای ژیانی ژن و مێردایەتیمان دا وارێك کەوتووین کە ئەگەر هەر قەپ وقڕێك لە نێوانمان ڕوو بدات ، کە لەوانە بێت گەورە ببێت ، یەکمان گورج ماڵ بەجێ دەهێڵێت ، جا منیش ئێستا بایی ئەوەندە لەماڵ دوورکەوتوومەتەوە کە هەر ڕقێ هەیەتی نیشتبێتەوە .. ئێستاش بە دووعا بۆ شەوێکی شاد لەگەڵ خێزانەکەتدا .

زەنگی تەلەفۆن دووبارە لێی دایەوە ، سەرنجمدا فلیمەکە تەواو بووە ، هەمان دەنگەو پڕ بە گەرمیی یادگارەکان لێشاوی بۆم دێت و دەڵێ : شەوشاد ، هاتەوە بیرت ؟ بە دەنگێکی وا کە بیرەوەری ونجڕ ونجڕە کردبێت وتم : سوپاس بۆ میهرەکەت .

ئەو شتەشی دووبارە کردەوە کە بەر لە سی ساڵ لەسەر سەکۆی سینەماکە پێمی وت :

– بەخوات دەسپێرم بۆ شەوێکی شاد لەگەڵ خێزانەکەتدا .

چراکانم کوژاندەوە بۆ ئەوەی لە تاریکی دا ڕێ بەگەڕانەوەی ئەو شتانەبدەم کە لەنێو بیرەوەرییەکاندا بزر بووبوون .

تێبینی : ئەم چیرۆکە بەناوی (اللوح)ەوە لە ژمارە (٦٨٣٦)ی ٥/٦/١٩٨٨ی ڕۆژنامەی (الجمهورية)دا بڵاوکراوەتەوە .

●

# سایکۆلۆژیەتی داهێنان

نووسین و
ئامادەکردنی
ئیسماعیل حاجی حەمەسین

داهێنان ئەو جیهانەیە کە تاوەکو ئێستا جێی ، سەر سورمان و تێرامـانی مرۆڤـە ، داهێنـان لەهـەموو بوارەکاندا لە کێشمە کێشمێکی دوو لایـەنەوە پەیدا دەبێت ، لایەنێکیان پەیوەندی هەیە بە هەستەکانەوە . بەوسیفەتەی کە هەستەکان [ لە راستی دا لایەنی هەڵچوونە لە ژیانی عەقڵی مرۆڤ دا ] (١) بە مانای کاردانـەوەی مرۆڤـە بەرامـبـەر شتـە دەرەکـی یەکـان ، هەستـەکـانیش بەدوو شێـوەی ئیجـابی و سەلبی خۆیـان دەردەبڕن ، شێوەی ئیجابی خۆی لە خۆشیو هەست کردن بە خۆشی دا دەردەبڕێت ..

ئەوی دیان بە پێچەوانەوە.

هەروەها داهێنان پەیوەندی هەیە بە پێکهاتنی کۆئەندامی دەمار [الجهاز العصبي] ی داهێنەرەوە و زاڵ بوونی بەشی دواوەی [کـە پەیـوەنـدی دارە بە هەسـت و سۆزو کاردانـەوە سروشتییـەکـانـەوە] ئەمـەش خۆی لە هونـەرمـەنـدان دا دەبینێتەوە، یان ئەوانەی کە بەشی پێشەوەیان زاڵە [ کەتایبەتە بە پرۆسێسە عەقڵیە باڵاکان ] ئەمانەش لە زانایان داخۆیان دەبیننـەوە ، کەواتە دوولایەن کارێك دەکەن و دەبنە هۆی لە دایك بوونی بەرهەمێکی نوێ لە منداڵدانی مێشك دا ئەویش کاردانەوەی ، جەستەی مرۆڤ [لە هەستەکانەوە تا مێشك کە ئەمـە لایـەنێکە] لەگەڵ شتە دەرەکییەکان . کە دەبێتە هۆی وورووژانـدنی ئەو مرۆڤـەو هەڵچـونێـك دروست دەبێت پێش داهێنان لەبەر ئەوە [گومانی تێدانییە کە هەڵچوون و سۆزو هەستـەکـان جووڵێنـەری هەڵسـوکـەوتن یان پاڵپێـوەنـەرە سایکـۆلۆژییـە سەرەکییـەکانی ژیانی فکری مرۆڤە لەدوای شیکردنەوەیەکی وورد] (٢).

ئەمـەش ئەوە دەگـەیـەنێت کە [پـرۆسێسی داهێنـان ڕوونـادات ئەگـەر پێش ئەوە بارێکی هەڵچوونی تایبەت نەی وروژانـدبێت لە ئەنجـامی بەرەنگـار بوونـەوەی کێشـەیەکی کۆمەڵایەتی یان زانستی ]

ئەمەش لێکدانەوەیەکی مادی فەسلەجییە بۆ پرۆسێسی داهێنـان لە هەموو بوارەکاندا ، بەمانای ئەم لێك دانەوەیە . زیاتر لە مانا زانستییە فراوانەکەی داهێنان نزیك دەبێتەوە . گومانی تێدانییە کە ئەمەش بۆتە هۆی ڕووناك کردنەوەی زۆر لایەنی تاریك لە ژیانی عەقڵی مرۆڤ دا بەگشتیو داهێنانیش بەتایبەتی .

قوتابخانەی شیکردنەوەی دەروونی یش لە گۆشە نیگای خۆیەوە مەسەلە سەختەکانی داهێنان شی دەکاتەوەو چەند تیشکێکی دەخاتە سەر کە ئەم مەسەلە یەش لەلایەن ( فرۆید ) ەوە زۆر پرسیـاری وورووژانـدو زۆر جەدەل و ڕەخنەو باری سەرنجی بەدووی خۆیدا بە کێش کرد .

بەتـایبـەتی لە پرسیـارە نەمـرەکـەی مرۆڤ بەرانبـەر پاڵپێـوەنەرەکانی داهێنان .. ( فرۆید ) هونەرمەندی داهێنەر دەگەڕێنێتەوە بۆ ڕەگەزە سەرەتایی یەکان . بۆ لایەنی ڕاستی کە بەڕای ئەو پاڵپێوەنەری هەڵس و کەوتی مرۆڤ و داهێنانیشە لە بەرزترین پلەی دا ، ئەویش لایەنی [ نەستی = لاشعوري ] مرۆڤـە ئەو لایـەنـەیە کە یاداشت و خەونەکانی مرۆڤی تێدا ماوەتـەوە یان چاکتـر وابڵێن بەنـد کراوە بەهـۆی ئەوەی کە پێویستی بەرهەمەکییەکان لەگەڵ مرۆڤ دا لە دایك دەبن . [وەك

پێویستی سێکس و برسێتی و دوژمنایەتی] ناتوانرێت تێرکرێن لەبەر ئەوەی بەرکۆمەڵێ لە یاساو رێساوی کۆمەڵایەتی دەکەون . کە تێر کردنیان بە شێوەیەکی راستەوخۆ دەبێتە هۆی جیابوونەوەی مرۆڤ لە کۆمەڵ و رەت کردنەوەی بوونی ئەو مرۆڤە لە کۆمەڵ . هونەرمەندیش بەهۆی ئەوەی کە لە کێشمە کێشمێکی دەروونی سەخت دایە لە نێوان [ ئەو ـ Id ] و [ من ـ EGO ] دا بەرانبەر پێویستی‌یەکان و کۆمەڵێ لە فرمانی کۆمەڵایەتی . لەبەر ئەوە لە ژێرسایەی ئەندێشەو زیندمخەون دا خۆی ، دەبینێتەوە ، بەو شێوەیە خەونی هونەرمەند بە شتەکانەوە جۆرێکە لە [ عصابي ][3] یان ( بە مەبەستی روون کردنەوە ) جۆرێکە لە نەخۆشی‌یەکی دەروونی کە ئەمەش پەیوەندی‌دارە بەو بارە هەڵچوونە لە رادە بەدەرەی کە توشی هونەرمەند دەبێت ، کەواتە جیهانی خەونی هونەرمەندی داهێنەر بریتی‌یە لە رێك خستنەوەی شتەکان و چربوونەوەی لە شێوەی خەیاڵێکی بەر فراوان . کە جۆرێکە لە میکانزمەکانی خۆپاراستن کە ئەویش [ کۆمەڵی کرداری ، ئامێری نەستی‌یە و بێ مەبەست مرۆڤ پێ‌ی هەڵدەستێ بۆ رزگار بوون لەو «توتر»و دڵە راوکێ‌یەی کە لە ئەنجامی قەیرانی دەروونی‌یەکەیەوە پەیدا بووە ئەمەش چەند کردارێکی نەگونجاوە کە ئامانجی چارەسەرکردنی کێشەکە نی‌یە بەڵکو رزگار بوونە لەو دڵەراوکێ‌یە ][4] کەواتە خەیاڵی بە پێزی ، داهێنەر لەلایەن قوتابخانەی شی‌کردنەوەی دەروونی جۆرێکە لە خۆپاراستنی دەروونی بۆ گونجاندنی خۆی لەگەڵ شتە دەرەکی‌یەکان داو کە کەم کردنەوەی ئەو دڵە راوکێ و قەیرانە دەروونی‌یەی ( أزمة النفسية ) کە لە ئەنجامی زۆرانبازی نێوان [ئەو ومن و منی باڵا] دا پەیدادەبێت ، هەروەها رازاندنەوەی ، خەونەکان بە بەرگێکی کۆمەڵایەتی کە خۆی لە کرداری [ باڵایی ـ إعلاء ـ التسامي ] دا دەبینێتەوە کە هونەرمەند پاڵپێوەنەرە رەمەکی‌یەکانی خۆی دەکات بە چەند بەرهەمێك کە کۆمەڵ لێ‌ی ، رازی بێت ، هەر وەکو چۆن ئەم بەرهەمە جۆرێکە لە کرداری ، باڵایی (التسامي) کە ئەمەش بە تاڵ کردنەوەی ئەو ووزە دەروونی‌یەیە ئەوە تا نووسەری ئینگلیزی ( مۆم ) لە یەکێك لە چیرۆکە کانیدا دەربارەی باڵایی رای خۆی دەردەبرێت :

[ ـ بۆچی چیرۆکێکی لەسەر نانووسیت ؟ـ کێ من لەسەری بنووسم ؟ـ دەزانی ئەو سیفەتە گەورەیەی کە نووسەر لە خەڵکی جیا دەکاتەوە ئەوەیە کاتێك هەست بە بێزاری و نەهامەتی دەکات دەتوانێت لە چیرۆکێك دا دایبرێژێت .. ئەمەش هێمنی‌و پشوویەکی پێ دەبەخشێت ][5] .

بەڵام دەربارەی ( عصابي ) یەتی داهێنەر ، شی‌کردنەوەی دەروونی لەبەرەوپێش چوونی‌دا جیاوازی دەکات لە نێوان عصابي و هونەرمەنددا [ فرۆید] بە هۆشیاری‌یەوە ئاگاداری ئەو جیاوازی‌یە بوو ، بۆیە پێمان دەڵێت کە هونەرمەند وەکو عصابی نی‌یە دەزانێت چۆن لە جیهانی خەیاڵ بێتە دەرەوەو « دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی بە هەنگاوێکی جێگیر لە واقع بدات »[6] .

هەروەها هونەرمەند نەخۆشانەنی‌یە [ ئەمەش هەموو جیاوازی‌یەکەیە کە شاعیر ئەندێشەی هەندەسوورێنی بەڵام جیاکەرەوەی راستەقینەی ( عصابی ) ئەوەیە کە ئەندێشەی زاڵە بەسەری‌دا ][7] .

[فرۆید] دەڵێت : [ پاڵپێوەنەرەکان و ئەو گۆرانانەی کە بەسەری دادێن دوا شتەکە شی‌کردنەوەی دەروونی دەری ـ دەخات و هەستی پێ دەکات ، وە لە دوایی دا شانۆ بۆ توێژینەوەی بایۆلۆجی چۆڵ دەکات . ئارەزووی خەفەکردن وەهەروەها توانای باڵایی پێویستە بگەرێتەوە بۆ بنچینە ئۆرگانی‌یەکەی لە کەسایەتی دا کە پەیکەری دەروونی لەسەر ئەو بنچینەیە دروست بووە ][8]

لە ئەنجامی بەرەو پێش چوونی شیکردنەوەی دەروونی‌دا (کارل کۆستاف یونگ) سروشتی داهێنان و داهێنەر دەگەرێنێتەوە بۆ پاڵپێوە سەرەتایی‌یەکانی مرۆڤ یان چاکتر وایە بڵێین ئەو ( بۆ ماوە ) سەرەتایی‌یانەی کە لە باپیرانەوە بۆمان ماوەتەوە لە وێنەو ئەفسانەو خوو نەریتەکانی چاخە کۆنەکان ، یان هەموو ئەزموونە کۆنەکانی مرۆڤ [ وەکو ترسان لە هێزێکی ئەو دیو سروشت و پەیوەستی بیری خاك بە دایکەوەو ژیری و دانایی پیاوی بە ساڵا چوو ( یونگ ) ئەمەی ناونا [ لاشعوري جمعي ] لە وانەیە تووشی بارێکی سەر سورمان ببین لەم بۆ چونە کە چۆن ئێمە بە شێوەیەکی [ لاشعوري ـ نەستی ] هەڵگری

ئەزموونەکانی باب و باپیران مان بین لە چاخەکۆنەکان ؟ (یونگ) وولامیمان دەداتەوەو دەڵێت [ وانەکانی پەرەسەندنی بایۆلۆجی پەنجەی بۆ پاشماوە جەستەیی‌یەکان راکێشا کە لە باپیرانەوە هەڵمان گرتووە ★ ، هیچی تێدانی‌یە کە پاشماوەیەکی دەروونی هەبێت بە مانـای پاشماوەی [ لاشعوري جمعي ] ئەویش لە هەمـوو کەسێکـدا وەکـو یەکـە بە چاو پۆشـین لە سنـووری کۆمـەڵگـاکـان][9] داهێنـان یش لای (یـۆنـگ) یەکێکـە لە میکانزمەکانی خۆپاراستن بە پێچەوانەی مرۆڤەوە ، ئەو لای ، وایـە کە ( خستە سەر = إسقاط ) ی (لاشعوري جمعي ) یەکێکە لەو جوڵێنەرانەی پرۆسێسی داهێنان ئەویش ئەوەیە کە داهێنـان [ئەو پرۆسێسە دەروونی‌یەیە کە هونەرمەند دیمەنە سەیرەکانی قوڵایی نەستی دەخاتە سەر بابەتە دەرەکی‌یەکان کە کەسانی تر دەتوانن تێی رابمێنن] [10] .

داهێنانیش لای ( الفريد آدلر ) بریتی‌یە لە هەوڵدانی مرۆڤ بۆ پلەو پایە بەرزەکان لە کۆمەڵ دا ، ئادلەر وا دەبینێ کە هونەرمەند هەست بە کەمێتی [ شعـور بالنقص ] دەکات و هەوڵدانیش بریتی‌یە بۆ پچرینی شوێنە بەرزەکان ، بەم شێوەیە داهێنان دەرئـەنجـامی ئەو دڵە راوکێیـە یەکـە لە هەست کردن بە کەمێتی‌یـەوە پەیدا بووە و هەوڵدانە بۆ سەرکەوتن ، یەکێك لە پاڵپێوەنەرە سەرەکی‌یەکان لە ووتە بەناو بانگەکەی ( ئادلەر ) بۆ مەبەستی روونکردنەوەی باری سەرنجی خۆی [من بە روونی لە هەمـوو دیـاردەیـەکی دەروونی هەوڵدان بەرەو سەرکەوتن دەبینم .. ئەو هێـزەی کە لە ( سالب ) ەوە بەرەو ( موجب ) دەروات کۆتایی پێ نایەت هەروەها هەوڵدان لە نزمی‌یەوە بەرەو بەرزی هەرگیز ناوەستێت ][11] .

شان بەشانی ئەم بۆ چوونانە لە ئەنجامی بەرەو پێش چوونی دەروونـزانی زیاتر شیکردنەوەی سروشتی داهێنەرو داهێنان قەوارەیـەکی زانـستی گرتـە خۆی بە تایبـەتی لە بواری [دەروونزانی ئەزمونی] ( علم النفس التجريبي ) دا بە تایبەتی کاتێـك پێـوانـە عەقـلی‌یەکان بۆ دیاری کردنی پلەی زیرەکی هاتەکایەوە کە رابەرانی [الفريد بينيەو تيوفل سيمۆن] بوون پاشـان ئەم پێـوانە عەقلیانە بەرەو کەسێتی داهێنەر رەوتی خۆی وەرگـرت و هەوڵیـان دا کە هۆیـەکانی داهێنان دەست نیشان بکەن و پاشان پێوانەی بۆ دابنێن..

هەوڵدانەکانی (جيلفورد) یش شایانی باسە لەم بوارەدا جێی گفتـوگـۆو لێ توێژینەوەکی زۆرە ، بەڵام ئەوەی کە تایبەتە بە قۆناغەکانی پرۆسێسی داهێنان ئەو دابەش کردنەیە کە (جراهام والای) دایـرێـژا ، و لەلایـەن زۆربـەی زانایانی دەروونی و هونـەرمەندان پەسەندە ، بە مەبەستی شارەزا بوون ... ئەم چوار قۆناغە دیاری دەکەین :

**١ـ قۆناغی ئامادەکردن :**

ئەویش پەیـدابـوونی تۆوی بیرۆکـەکەیە بە مانای پەیـدابوونی بیرەکەیە ، کە داهێنەر بۆ مەبەستی بە پێزەکەی سوود لە ئەزموونی تایبەتی و شارەزایی‌و زانیاری‌یە کۆنەکان وەردەگـرێت . ئەم قۆنـاغـە وەکـو پەیدا بوونی یەکەم بیر بۆ هۆنـراوەیەك یان چیرۆکێك یان بیرێك کە کێشەیەك لە مێشکی داهێنـەردا بخوڵقێنێت وەکو سەرنجدانی ( نيوتن ) لە کەوتنە خوارەوەی سێوەکە پاشان بەرەو قۆناغی دووەم هەنگاو دەنێت.

**٢ـ قۆناغی ترشاندن یان پێگەیشتن ( إختمار ) :**

ئەم قۆناغەدوای پەیدابوونی بیرەکەیە کە لە قۆناغی ترشـانـدن و پێگەیشتن دایە ، داهێنەر تاو توێی بیرەکەی دەکـات . تا ماوەیەك لێی دوور دەکەوێتەوە ، تا لە ئەنجامی ترشاندنیدا چوار چێوەیەکی روون وەردەگریت .

لەم قۆنـاغـەدا [ قەرەباڵغی هەڵچوونەکانی هونەرمەندوای لێ دەکات کە هەست بە جێگیر بوون نەکات عدم الأستقرار ][12]

**٣ـ قۆناغی سرووش ـ إلهام ـ**

بە مانـا فەلسـەفی یەکەی لە گۆشەنیگای دەروون ناسـەکـانـەوە [ سرووش وەکو هەموو پرۆسێسێکی عەقڵ کە دەمـاغ پێـی هەڵدەستێ ][13] دوای تێپـەر بوون بە هەردوو قۆناغەکەی کە پێشتر باسمان کرد لەم قۆناغەدا چارەسەر بۆ کێشـەکـە چوار چێوەی تەواوی خۆی وەردەگرێت و داهێنەر هەست بە بروا بە خۆبوون و هێوری‌یەك دەکات و پەیوەندی نێـوان رەگـەزەکـانی بیرەکەی لائاشکرایە لە ساتێکی دیاری

کراودا که بەو ساتە دەڵێن ساتی ئیلهام یان ڕوّشن بوونەوە.

**٤ـ قوّناغی چاو پێداخشاندنەوەو پاکژکردنەوە :**

ئەم قوّناغەش پاکژ کردنەوەو زیاد کردن و لابردنی هەندێ شتە دوای ئەوەی کە بەرهەمەکە لە قوّناغی سێیەم دا لە دایك بووە بەم شێوەیە پروّسێسی داهێنان و خەلق زوّر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت کە لە ووتارێك دا یان چەند کتێبێك دا باسکرێت و بکەوێتە ژێر سێبەری لێ توێژینەوەی قوڵ و تاوو توێکردنی هەموو لایەنەکانی ، هەتا وەکو ئێستاش کێشەی داهێنان و پاڵپێوەنەرەکانی داهێنان جێی پرسیارەو ڕوّژ بە ڕوّژ لە هەموو بوارەکاندا هەوڵی لێکدانەوەی تازەو نوێ دەدەن بوّ داهێنـان ، گومـانیشی تێـدانییـەکە داهێنان پەیوەندییەکی پتـەوی بە کوّمـەڵگـەو کاریگـەری داهێنەرو هەروەها هوّکارە سیـاسیو ئابـووری و جوگرافییەکانیش بە هەمان شێوە ڕوّڵی خوّیان دەبینن لەم بوارەدا.

داهێنـان لە کوّمەڵگەیەکەوە بوّ کوّمەڵگەیەکی دی دەگوّرێت و هیچ داهێنانێکیش ئەوی دی ڕەت ناکاتەوە ئەم باسەشمان جگە لە تێپەڕ بوونێکی خێرا نەبێت لە گوّشە نیگای ، دەروونزانییەوە بوّ داهێنان هیچی تر نییە ، تەنیا مەبەستمان ئەوەیە کە کاتی ئەوە هاتووە لایەك لە هونەرمەندو داهێنەر بکەینەوەو دەرك بەو حەقیقـەتـە بکـەین کە داهێنــان دابـڕاو نییـە لە داهێنـەر، داهێنەریش بەبێ ئازارێکی زوّر جواناوی ئەو لە دایك بوونە نوێیەی لە هەنیەی ناسرێت . هەروەکو (هنری جیمس) دەڵێت :

[ئەزموون هەرگیز دیاری ناکرێت و هەرگیزیش کوّتایی نایەت].

## پەراوێز

١ـ الدکتوّر نوری جعفر ـ الأصالة في العلم و الفن ـ ص ٨٧
٢ـ هەمان سەرچاوە ـ ص ٩٠
٣ـ بگەڕێرەوە بوّ [ موسوعة علم النفس ] ـ د.أسعد رزوق ـ ص ٢٠٧
٤ـ د. أحمد عزت راجح ـ أصول علم النفس ـ ص ٥٠٠
٥ـ د. مصطفى سويف ـ الأسس النفسية للأبداع الفني ـ ص ٢٠١
٦ـ د. عزالدين اسماعيل ـ التفسير النفسي للأدب ـ ص ٣١
٧ـ هەمان سەرچاوە ـ ص ٣١
٨ـ سجموند فرويد ـ ليوناردو دافنشي دراسة في السلوك الجنسي الشاذ ـ ص ١٢٥
٩ـ مەبەستی یونگ پاشماوەی بایولوجییە.
١٠ـ د. مصطفى سويف ـ الأسس النفسية للأبداع الفني ـ ص ٢٠٣ـ٢٠٤.
١١ـ لندال . دافيوف ـ مدخل علم النفس ـ ص ٥٩٨
١٢ـ قاسم حسين صالح ـ الأبداع في الفن ـ ص ٨٣

## سەرچاوەکان


١ـ د. جعفـر ، نوری ـ الأصـالة في العلم والفن ـ دار حرية للطباعة ـ بغداد سنة ١٩٧٩
٢ـ د. راجح ، أحمد عزت ـ أصول علم النفس ـ الطبعة ١١ سنة ١٩٧٧ ـ مصر
٣ـ د. سويف ، مصطفى ـ الأسس النفسية للأبداع الفني ـ الطبعة ٣ سنة ١٩٧٠ ـ مصر
٤ـ دافيوف ، لندال ـ مدخل علم النفس ـ الطبعة الثانية سنة ١٩٨٣
٥ـ صالح ، قاسم حسين ـ الأبداع في الفن ـ الطبعة الأولى ١٩٨١
٦ـ د. اسماعيل ، عزالدين ـ التفسير النفسي للأدب ـ الطبعة الأولى ـ ١٩٦٣ بيروت ـ لبنان
٧ـ فرويـد ، سيغمـوند ـ ليوناردو دافنشي دراسة في السلوك الجنسي الشاذ الطبعة الثالثة ـ ١٩٨٢ـ بيروت ـ لبنان




ڕەفیق غەفور

# فەلسەفە بەکورتی لە ئاوێنەی مێژووەوە

فەلسەفە زانستێکی سەربەخۆیە ، سیستەمێکی چڕوپڕی بیرکردنەوەیەو وەك هەر زانستێکی‌تر بابەت‌و پێڕەوو چەمك‌و ئامانجی خۆی هەیە . فەلسەفە لەو یاسا هەمەلایی (شامل)و فراوانانە دەدوێ کە حوکمی سروشت‌و کۆمەڵ‌و بیری مرۆڤ دەکەن .

جا ئەگەر وەك زانست‌و سیستەمێك بویٚ بڕوانین دەبینین لە سەردەمی پلاتۆن (افلاطون)[1] ەوە (٤٧٢ - ٣٤٧ پ . ز) دەست‌پی‌دەکا . لەپێش ئەویشدا فیساگۆرس[2] (٥٧٢ - ٤٩٧ پ . ز) بۆ یەکەمجار زاراوەی فەلسەفەی Philosophy بەواتای (حب الحکمة) بەکارهێناوە .

بەڵام بیری فەلسەفی بە شێوەیەکی گشتی لە سەردەمێکی زۆر لەوەوبەرەوە سەری‌هەڵداوە ، بەوپی‌یەش کە فەلسەفە هەڵوێست‌و لێکدانەوەو لی‌تێگەیشتن‌و بیرکردنەوەی مرۆڤە لە بوونی خۆی‌و ئەو سرووشتەی تیایدا دەژی‌و ئەو دیاردەو ڕووداوانەی لە دەوروبەری ڕوودەن . کەواتە دەبێ بیری فەلسەفی هاوشانی مرۆڤ بێ لەو کاتەوەی ڕووبەڕووی ژیان بۆتەوەو لە پێناوی بەردەوامی‌و مانەوەی‌دا وەك بوونەوەرێکی هۆشیار بیری کردۆتەوە . جا کەوابێ دەستنیشانکردنی دەقاودەق کاتی لەدایك‌بوونی شتێکی ئاسان نی‌یە .

هەروا بەو پی‌یەش کەبوونی مرۆڤ‌و ئەو دیاردەو ڕووداوانەی لە دەوروبەری ڕوودەدەن‌و هەستیان پی‌دەکا ، هەرهەموویان - بە شێوەیەکی گشتی - سەرچاوەیەکی هاوبەشیان هەیە کە سرووشت‌و ژیانە کۆمەڵایەتیەکەیە . کەواتە هەموو مرۆڤ‌و کۆمەڵێك لە هەر شوێنێك بن لەم گەردوونەدا بەپی‌ی کاریگەریی ڕووداوەکان‌و پێویستی‌یەکانی خۆیان بیردەکەنەوەو کێشەو دیاردەکانی ژیان لێك‌دەدەنەوە . بەم جۆرەش دەستنیشانکردنی دەقاو دەقی شوێنی لەدایك‌بوونی بیری فەلسەفی‌و بەستنەوەی بە کەسێکەوە یان کۆمەڵە کەسێکەوە کارێکی ئاسان‌و بێ کەموکوڕی نی‌یە .

جا لەسەرجەمی ئەوەی لەمەوبەر وتمان دەگەینە ئەو ڕاستی‌یەی کە بیری فەلسەفی ملکی سەرتاپای مرۆڤایەتی‌یەو هیچ کەس‌و نەتەوەیەك ناتوانێ خۆی بە تەنیا خاوەنی بزانێ .

ئەمەی باسمان کرد لە چوارچێوەیەکی گشتی‌دا ، بەڵام ئاشکرایە کە ڕێڕەوو گۆڕی بیرکردنەوەو پەرەسەندنەکەی لەوەودوای ، لە هەموو کات‌و شوێنێکدا چوون‌یەك نەبوون ، ئەمەش بەحوکمی واقیعی ژیانی مرۆڤ‌و ئەو پێداویست‌و ڕووداوانەی ناچاری زیاتر بیرکردنەوەو زیاتر گەڕان بەدوای کلیلی نهێنی‌یەکانیدا کردوون . هەر بۆیەش لەوەودوا ئەم بیرکردنەوە ڕووتە لە هەندێ ناوچەدا گەیشتە پلەو ئاستێکی کامڵترو دەربڕینێکی ڕوون‌و ئاشکراتر .

پەرەسەندنی مرۆڤ‌و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیش لە هەموو ڕوویەکەوە بابەتی هەرهەموو زانستەکانەو هەریەکە لەبواری تایبەتی خۆی‌دا دەتوانێ تیشکێك بخاتە سەر ئەو پەرەسەندنەو ئامانجەکانی لەوەودوای مرۆڤ .

فەلسەفەش وەك هەر زانستێکی‌تر بە مێژووو داهاتووی ئەم گەشەکردنەی مرۆڤایەتی‌یەوە لکاوەو بە شێوەیەکی هەمەلایی‌تر لە هەموو زانستەکان ڕۆڵی خۆی لەم بوارەدا دەگێڕێ .

### بایەخی مێژووی فەلسەفە :

بێگومان مێژوو هەر گێڕانەوەی کارەسات‌و ڕووداو نی‌یەو بە شان‌و شکۆ هەڵدانی قارەمان‌و سوارچاك‌و فلان دەوڵەت‌و فلانە شارستانێتی‌دا نی‌یە ، مێژوو زانستێکەو وەك هەر زانستێکی‌تر پێڕەوی شی‌کردنەوەو لێکدانەوەو دەرئەنجامی هەیەو دەبێ بەو چاوەش سەیری بکرێ کەکەڵەکەبوونی ئەزمون‌و هەوڵ‌و تەقەلای مرۆڤە لەو بوارانەدا کە مێژوو کاریان تێدا دەکا ، بە مەبەستی گەیشتنە ئاستێکی بەرزترو بەدیهێنانی ئاکام‌و ئامانجێکی تر .

فەلسەفەش دیاردەیەکی گەشەکردووی بیری مرۆڤایەتی‌یەو لەو ڕۆژەشەوە کەمرۆڤ وەك بوونەوەرێکی بەرهەمهێنی هۆشیار هەوڵی‌داوە بەدوای وەڵامە گەورەکانی ژیاندا بگەڕێ ، هەر لەو ڕۆژەوە بیرو بیرۆکەی فەلسەفی لەدایك بوون‌و دەبێ لەو ڕۆژەشەوە مێژووی ژیانی بیری فەلسەفی بنووسرێت‌و بەپێودان‌و تێڕوانینێکی زانستی‌و مەوزوعیانە شی‌بکرێتەوە . دەتوانین بەکورتی بایەخی مێژووی فەلسەفە لەم خاڵانەدا کۆبکەینەوە :

١ – پەرەسەندنی بیری مرۆڤ دەردەخا لەو کاتەوەی بۆتە بەرهەمهێنێکی هۆشیارو نەخشەی بۆ کارو ئامانجەکانی دارشتووە .
٢ – ئاستی پێشکەوتن‌و گەشەکردنی ئەو ناوچەو شوێنانە دەردەخا کە پێگەو مەڵبەندی شارستانێتی بوون . جا چ لە رووی کۆمەڵایەتی یان ئابووری یان هەر لایەنێکی تری زانستی‌و ئاوەدانیەوە بووبێت .
٣ – برو چۆنێتی ئەو گۆڕانکاریانە روون‌ئەکاتەوە کە بەسەر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا هاتوون‌و ، ئەو قۆناغانەی مرۆڤایەتیان پێدا تێپەڕیوە .

٤ – هاوکاریگەرێتی‌و پێکەوەبەستنی ڕەوڕەوەی مێژووی شارستانی‌و ژیانی مرۆڤایەتی دەسەلمێنی ، کاریگەری هەریەکە لە شارستانێتی‌یەکان لەسەر یەکتر دەردەخا .
٥ – کۆبوونەوەو کەڵەکەبوونی ئەزمونی بیری مرۆڤەو ، لەم گۆشەیەشەوە ڕێڕەوی پەرەسەندنی داهاتووی بیری مرۆڤ‌و کۆمەڵ روون دەکاتەوە .
کەواتە نووسینی مێژووی فەلسەفە لەخۆی‌دا هەڵوێستێکی فەلسەفی‌یەو بری زانستێتی‌و مەوزوعیەتی نووسینەکەش راستی‌و ناڕاستی ئەو مێژووە دەردەخا کە دەنووسرێ .

بەڵام لەوکاتەوەی مێژووی فەلسەفە دەنووسرێ‌و هەوڵ دەدرێ شوێن‌و مەڵبەندی لەدایك‌بوونی دەستنیشان بکرێ ، بەتایبەتیش لەسەردەمی ڕاپەڕینی ئەورووپا (ڕێنسانس)و سەدەکانی دوای ئەویشەوە کە هەنگاوی گەورە لەبواری نووسینی مێژوودا دەنرا ، کۆمەڵێك کەموکوڕی‌و ناڕاستی کەوتنە بۆچوون‌و ڕوانینی هەندێك لەو مێژوونووسانەوە کە خۆیان بە نووسینی مێژووی بیری فەلسەفی‌یەوە خەریك‌دەکرد . گەورەترین هەڵەش لەم بوارەدا ئەوەبوو کە ئەوان ڕاستەوخۆو بێ‌سێ‌ودوو سەرەتای سەرهەڵدانی فەلسەفەو زانستەکانیان دەگێڕایەوە بۆ یۆنان‌و ڕۆمانی کۆن‌و تا ڕادەیەکی زۆر شارستانێتی‌یە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتیان پشت‌گوێ خست‌و توخنی نەکەوتن . ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك بوو .
١ – بێگومان ئەرستۆ یەکێکە لە ئەقڵە مەوسوعی‌یەکانی یۆنان‌و جیهانی کۆن‌و سەرچاوەیەکی بەبایەخیشە بەدەست مێژوونووسانی بیری فەلسەفی‌یەوە . ئەو ڕای وابوو کە تالیس[٣] (٦٢٤ – ٥٤٧ پ .ز) یەکەم فەیلەسوفی سرووشتی‌یەو فەلسەفەیەکی هێناوەتە گۆڕێ کە پەیوەندی بە میثۆلۆژیاوە نەماوە . بەڵام پێش ئەو ئەوەی لەبارەی فەلسەفەوە وتراوە تا ڕادەیەکی زۆر لە سنووری میثۆلۆژیادا بووە[٤] .
جا تا ئەمڕۆش هەندێك بیرمەند (مفکر) ڕایان هەر لەگەڵ ئەرستۆیەو سەرەتای فەلسەفە دەگێڕنەوە بۆ یۆنان

٢ – بەشێك لە مێژوونووس‌و بیرمەندانی ئەورووپا ڕایان وایە کە لە شارستانێتی‌یەکانی ڕۆژهەڵات‌دا بیری فەلسەفی‌و زانستەکان هەر لەسنووری کردارو کاری ڕۆژانەدا بوون‌و نەگەیشتبوونە پلەی تەجریدکردن .
**ئەمەش بەڵگەیەکی لاوازە چونکە:**
أ – بەتەنیا تەجریدکردن مەرجی بوونە زانست نی‌یە ، لەبەرئەوەی مرۆڤ لەو ڕۆژەوەی ئاخاوتن‌و ژمارەی زانیوە ، گەیشتۆتە ئاستی تەجریدکردن ، چونکە ووشەو ژمارە خۆیان وشێوەی موجەڕەدی شتەکانن[٥] .
ب – هەندێك لە زانستەکان تا ڕادەیەکی زۆر پێش‌کەوتبوون‌و هەر لەگەڵ سەرهەڵدانیشیانا هەنگاویان بەرەو تەجرید کردن نابوو . وەك بیرکاری‌و ئەندازە .
ج – ڕاستە زانستەکانی ئەوسا بنچینەو سەرەتای زانست بوون‌و نەگەیشتبوونە قۆناغێکی کامڵ ، بەڵام لە یۆنانیشدا هەر بەتەواوی نەگەیشتنە ئەو قۆناغەو وەك زانستێکی سەربەخۆ ڕێبازو ئامانجیان دەرنەکەوت . ئەگەرچی لە جارانیان پەرەسەندوترو پێشکەوتووتر بوون .
د – لەبارەی بیری فەلسەفی رووتیشەوە ئەفسانەو ئاینەکان کە هەڵوێست‌و لێکدانەوەی مرۆڤیان بەرامبەر ژیان‌و سرووشت‌و کۆمەڵ – بە ڕابوردوو ئەوکاتەو داهاتوویەوە – دەردەبڕی بە شێوەیەکی موجەڕەد دەردەبڕران .
٣ – بێگومان لەسەردەمی ڕێنساس بەدواوە کە هەرروەك وتمان هەنگاوی گەورە لە بواری نووسینی مێژووی فەلسەفەدا دەنراو ڕێبازی فەلسەفی نوێ دەهاتە گۆڕێ . زۆربەی مێژوونووس‌و فەیلەسوفان هەر پشتیان بەو سەرچاوانە دەبەست کە لەوەوبەر هەبوون لەگەڵ لێکدانەوەو بۆچوونی فەلسەفیانەی خۆیان . بەڵام لەبارەی بیری فەلسەفی‌و زانست لە ڕۆژهەڵات‌دا سەرچاوەیەکی ئەوتۆیان لەبەردەستدا نەبوو ، جگە لەوەش شوێنەوارزانی‌و ئارکیۆلۆژی نەگەیشتبوونە ئەو ئاستەی زۆر لایەنی شاراوەو نادیاری داهێنان‌و کارە زانستی‌و بیری‌یەکانی کۆمەڵگەکۆنەکانی ڕۆژهەڵات بدۆزنەوەو بیانخەنە بەردەستی بیرمەندو مێژوونووسانی ئەوسەردەمە .
٤ – گەلێك لە نووسراوو دەسکەوتە زانستی‌یەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆن هەر لە زووەوە لەناوچوون‌و نەگەیشتوونە دەستی مێژوونووسان .
٥ – سەردەمی ڕێنسانس سەردەمی گەشەکردنی هەستی نەتەوایەتی‌و بوژانەوەی کەلەپووری نەتەوایەتی بوو لە ئەورووپادا ، جا هەندێك بیرمەندو مێژوونووس ، سا ئەگەر لەبەر بیرتەسکی‌و ڕەگەزپەرستی یان لەبەر دەست‌کورتی خۆیان بووبێ ، لەسنووری ئەورووپا دەرنەچوون‌و بایەخیان بە شارستانێتی گەلانی ڕۆژهەڵات نەداوە .



جا ئەم را چەوتەی سەبارەت سەرهەڵدانی بیری فەلسەفی باسمان‌کرد ، تا ئەمڕۆش لە مێشکی هەندێك مێژوونووس‌و ڕۆشنبیری ئەوروپادا هەرماوەو ، هەر بەو چاوە سەیری فەلسەفە دەکەن کە لەدایك‌بووی یۆنان‌و گەشەکردووی کۆشی ڕۆمانە .

ئەمەش واتا پشت‌گوێ‌خستنی هەموو ئەو هەوڵ‌و تەقەلایانەی کە دراون‌و ئەو دەسکەوتە زانیاری‌یە گرنگانەی لە کۆمەڵگە کۆنەکانی ڕۆژهەڵات‌دا بەدەست هاتوون‌و کاریگەرییەکی زۆریشیان لەسەرهەڵدان‌و گەشەکردنی شارستانێتی یۆناندا هەبووە .

بەڵام شوێنەوازانی‌و دەسکەوتە زانستی یەکانی تر ئەوەیان سەلماندووە کە گەلانی ڕۆژهەڵاتیش ڕۆڵێکی گەورەیان لە پێکهێنان‌و پەرەپێدانی زانست‌و بیری فەلسەفیدا هەبووەو خزمەتێکی زۆری بیری مرۆڤایەتیان پێ‌کردووە . ئەمە لەکاتێکا نکوڵی لەوە ناکرێ کە چ ئەم زانستانەو چ فەلسەفەش بە شێوەیەکی گشتی لەیۆنان‌و ڕۆماندا پێشکەوتووترو گەشەکردووتر بوون‌و زیاتر کاریان لە بیری فەلسەفی دوای خۆیان‌و ئەمڕۆ کردووە . ئەمەش وەنەبێ شتێکی سەیربێ ، یان تەنیا ئەنجامی بلیمەتی‌و زیرەکی یۆنانیەکان بووبێ ، بەڵکو ئاشکرایە کە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەوپێشەوە دەچێ ، زانستیش لە هەموو زرووف‌و قۆناغە مێژوویی‌یەکاندا هەر لەگۆڕان‌و بەرەوپێشەوەچووندا بووە ، زانینێکی دیاری‌کراو بووەو بەو زرووفە مێژوویی‌یەوە بەستراوە کە تیێدا دەرکەوتووە ، زانایەك چەند هەنگاوێکی ناوەو زانایەکی‌تر لەکات‌و شوێنێکی تردا ئالاکەی لێ‌وەرگرتووەو چەند هەنگاوێکی دی بردۆتە پێش ، ئیتر بەم جۆرە زانست‌و فەلسەفەو هەموو لایەنەکانی تری چالاکی مرۆڤایەتی هەمیشە لەسەر ڕێ‌ی کاروان‌و لە بەرەوپێشەوە چووندان .

لەم ڕووەشەوە شارستانێتی یۆنان لەدوای شارستانێتی‌یە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتەوە هاتووە ، ئەنجامی پەرەسەندنی ئەوان بووە بەگشتی‌و ئینجا ئەنجامی بیرتیژی‌و سەلیقەی وردی یۆنانیەکان خۆیان بووە ، چونکە سەرتاپای مێژووی مرۆڤایەتی وەك ئەڵقە یەك‌لەدوای یەکەکانی زنجیرێك پێکەوە بەستراون‌و لێك‌جیانابنەوە .

پووکانەوەی شارستانێتی لە ناوچەیەك‌و سەرهەڵدانی لە ناوچەیەکی تردا پاسایەکی گرنگی فەلسەفە دەسەلمێنێ‌و ئەوە دووپات دەکاتەوە کە شتەکان لەگۆڕانی بەردەوامدان‌و ، نوێ کۆن ڕەت‌دەکاتەوەو ، ڕووداوو دیاردەکانیش پێکەوە بەستراون‌و کار لەیەکتر دەکەن‌و دەبنە هۆی درووست‌بوونی یەکتر .

جگە لەمانەش ئەوکاتە لە یۆنان خۆی‌دا زەمینەیەکی لەبارو زرووفێکی مەوزوعی بۆ ئەو گەشەکردنەی فەلسەفە ڕەخسابوو کە بووە هۆی دارشتنی بنچینەیەك بەجۆرێکی ئەوتۆ کۆرپەڵەی هەموو بیرە فەلسەفیەکانی دوای خۆی لە منداڵدانیدا هەڵگرتبوو .

## سەرەتای بیری فەلسەفی لە ڕۆژهەڵات‌دا

لەژێر ڕۆشنایی ئەو بەڵگەو ڕاستیانەی بەدەستمانەوەن‌و بەپێ‌ی ڕاوبۆچوونی زۆربەی مێژوونووسانی هاوچەرخی فەلسەفە ، بیری فەلسەفی نزیکەی سێ‌هەزار ساڵ لەمەوبەر بەشێوەیەکی دیارو تارادەیەك تۆمارکراو لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتەوە دەرکەوتووەو پەرەی گرتووە . واتا لە هیندستان‌و چین‌و عێراق‌و میسری کۆنەوە ... تد .. ئەگەرچی سەرهەڵدانەکەش لەو کاتەدا بە شێوەیەکی سادەو ساکار بووبێ‌و لە چوارچێوەی ئەفسانەو کاری زانستی‌و ئایندا دەربڕرابێ بەڵام هەرچۆنێك‌بێ دەبێ دان بەم شوێن‌و سەرەتای سەرهەڵدانەدا بنرێ .

**فەلسەفە لە هیندستاندا :**

سەرەتای بیری فەلسەفی لە هیندستانی کۆن‌دا لە هەزارساڵی یەکەمی (ب . ز)وە دەست‌پێ‌دەکا . کۆنترین جێماوی شارستانی هیندیش لەم بوارەدا کتێبی (ڤیدا veda) یە واتا کتێبی زانیاری‌یەکان کە نووسراوێکی ئایینی‌یەو کۆمەڵێك بیروڕاو بۆچوونی فەلسەفی لەبارەی جیهان‌و ژیان‌و ئاکاری (اخلاق) مرۆڤەوە دەردەبڕێ .

لێرەدا فەلسەفە لە شێوەی ڕێبازو قوتابخانەی ئاینیدا دەرکەوت‌و لەو سەردەمەشدا دوو باڵی سەرەکی لەهەموان دیارترو لەبەرچاوتر بوون . ئەوانیش ڕێبازی (جاینی)و(بوزی) بوون :

**ڕێبازی (مذهب) جاینی :**

ئەم ڕێبازە لەسەر دەستی حەکیمی کۆنی هیندستانی کە پێ‌یان ئەوت (جین) واتا (سەرکەوتو) سەری‌هەڵدا .. بەشی زۆری ئەم ڕێبازە ئامۆژگاری‌و نیشان‌دانی ڕێ‌وشوێنی ئاکاری‌یەو ، داوا لە مرۆڤ دەکا لە چێژ (لذة)و خۆشی ژیانی مادی دووربکەوێتەوە . مرۆڤ لای ئەم ڕێبازە لە گیان‌و لەش پێك‌دێت ، لەشیش کە مادەیە گیانی بەندکردووەو ئازاری‌ئەدا

لەبەرئەوە ئامانجی زانین رزگارکردنی گیانە لەم بەندایەتی‌یە ، ئەویش بە کردارو رەوشتی چاكو دوورکەوتنەوە لە مادەو چێژی ژیانی مادی دێتەدی . واتا جۆرە سۆفێتی‌یەك .

سەبارەت بە بوون جاینی‌یەکان رایان وابووە کۆمەڵێك شتی واقیعی هەن‌و خاسیەتی تایبەتی خۆیان هەیە ، مادەش جەوهەرێکی نازیندووە‌و بە دوو جۆر دەرئەکەوێ . یان ئەوەتا بەش‌بەش ئەبێ بۆ ئەتۆم کە بچوکترین بەشەو لەوەش زیاتر دابەش نابێ ، یان لێکدراوەو لە یەکگرتنی ئەم ئەتۆمانە پێك‌هاتووە . هەروەها باسی چەند جەوهەرێکی نازیندووی تریان کردووە ، وەك کات‌و شوێن‌و بزووتنەوەو وەستان (السکون) .

**رێبازی بوزی :**

ئەم رێبازە کە لەوەودوا بووە ئاینێکی بەربلاو لە جیهان‌دا ، لەنێوان سەدەی شەشەم‌و پێنجەمی (پ . ز)دا دەرکەوت ، دامەزرێنەرەکەشی مێرێکی ئەفسانەیی بوو کە بە (سدهارتا) واتا رۆشنکەرەوە (المستنیر) ناسراوە .

سێ‌بابەتی سەرەکی‌یەردی بناغەی ئەم رێبازە پێك‌دێنن ، ئەوانیش :

**١ – ژیان پڕە لە ئازارو ئەشکەنجە .**

**٢ -- ئەم ئازارەش هۆی خۆی هەیە .**

**٣ – مرۆڤ . دەتوانێ بەسەر ئەم ئازارەدا زاڵ‌بێ‌و نەیهێڵێ .**

بەرای دانا بوزی‌یەکان ئامانجی زانین رزگارکردنی مرۆڤە لە ئازاروژان . ئەم رزگارکردنەش دەتوانرێ لێرەدا ، واتا لەسەر زەوی بێتەدی . بوزی‌یەکان بە حاڵەتی رزگاربوون ئەڵێن(Nirvana نیرڤانا)ئەمەش حاڵەتێکی دڵنیایی‌و کپ‌بوونەوەی بەردەوام‌و بێ بێزار بوونە . حاڵەتی خۆدوورخستنەوەیە لە هەموو ئەو شتانەی ئەبنە هۆی ئازاروژان . خۆ دوورخستنەوەیە لە جیهانی دەرەکی‌و بیرکردنەوەش ، بەکورتی خۆبەدەستەوەدانە نەك خۆرزگارکردن .

بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا بوزی‌یەکان بڕوایان بەگۆڕانێکی هەمەلایی (شامل) لە جیهاندا هەبووەو گیان (روح) یشیان وەك ماهیەتێکی تایبەتی رەت‌کردۆتەوەو تەنیا بڕوایان بەوە بووە کە حاڵەتی هۆشیاری هەیەو وەك تەزوو یەك بەدوای یەکدا دێن .

جگە لە جاینی‌و بوزیش لە هیندستانی کۆن‌دا گەلێك رێبازی تر هەبوون کە کۆمەڵێك بیروڕاو بۆچوونی فەلسەفیان لە خۆگرتبوو ، بیروڕاکانیشیان شایانی ئەوەن مێژووی بیری فەلسەفی ئاوڕیان لێ بداتەوەو لە شوێنی شیاوی خۆیان جێ‌یان بکاتەوە . وەك باسکردنی جیهان‌و پێکهاتنی لە رەگەزە بنچینەیی‌یەکان ، چونکە رایان وابووە کە شتەکانی سرووشت هەموویان لە هەواو ئاگرو ئاوو خۆڵەوە دروست‌بوون . هەروا گەلێك بیروڕای تریش کە بوونە بنچینەی رێبازە فەلسەفی‌یەکان دوای خۆیان .

## بیری فەلسەفی لە (چین)ی کۆن دا

لە ولاتی چینی کۆنیشدا بیری فەلسەفی بۆ نزیکەی هەزار ساڵی یەکەمی بەر لەزایین دەگەڕێتەوە . لە سەدەی هەشتەمیشەوە تا پێنجەمی (پ . ز) یەکێك لە هەرە فراوانترین رێبازە فەلسەفی‌یەکان لە چیندا ئەو رێبازە بوو کە باسی پێنج رەگەزە بنچینەیی‌یەکەی دەکرد (ئاو، ئاگر، دار، خۆڵ، کانزا)، بڕواشیان وابوو کە لە ئەنجامی یەکگرتنی ئەم پێنج رەگەزە شتەکان دروست بوون و دروست دەبن، جیاوازی‌و چۆنایەتیشیان بەندە بە چۆنێتی یەکگرتنی ئەم رەگەزانەوە .

دوای ئەم رێبازەش بیری فەلسەفی لە چیندا زیاتر پەرەی‌گرت و لەنێوان سەدەی پێنجەم و سێ‌یەمی (پ . ز)دا چەند رێبازێکی سەرەکی سەریان هەڵدا؛ لەسەروو هەمووشیانەوە رێبازی (تاو) واتا (رێگا) کە بە تاویزم ناسراوە .

لایەنگرانی ئەم رێبازە رایان وابوو کە گۆڕانی شتەکان بەپێی رێگای تایبەتی خۆیانە . واتا هەرشتێك (تاو)ێکی تایبەتی خۆی هەیە کە بەڕێوەی دەباو دەیگەیەنێتە مەبەست . لێرەدا دەتوانین بڵێین (تاو) واتای یاسا دەگەیەنێ‌و شتەکانیش بەپێی یاسای تایبەتی خۆیان بەڕێوە دەچن، ئەگەر ئەم بۆچوونەش راست بێ، ئەوا لایەنێکی تری بلیمەتی‌ی‌لایەنگرانی ئەم رێبازەمان بۆ دەردەکەوێ کە گەیشتوونە ئەو رایەی گەردوون گەڕەلاوژەو پێکداچوونێکی رەمەکی نی‌یە، بەڵکو سیستەمێکی رێك وپێکەو بەپێی یاسا بەڕێوەدەچێ .

لەوەودواش ئەوانەی بە تاوی‌یەکان ناسرابوون زیاتر پەرەیان بەم رێبازە داو، لەژێر رۆشنایی بۆچوونەکانیدا کەوتنە شی‌کردنەوەو باسکردنی کێشە مەنتیقی‌یەکانی تایبەت بە هەندێك لە چەمکە فەلسەفی‌یەکان وەك چەمکی (ناو) و (واقیع)و. . . . . . تد .

هەندێکیشیان گەیشتنە ئەوەی کە چەمك (مفهوم) رەنگدانەوەی دیاردەو شتە مەوزوعی‌یەکانە . هەروا یەکێك لە رێبازەکانی تر کە باسی ناوی شتەکان دەکا تا رادەیەکی زۆر لە رێبازەکەی پلاتۆنەوە نزیکە سەبارەت بە تیوری نمونە (نظرية المثل) .

جگە لەم رێبازانەش لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی هەندێك رێباز دەرکەوتن کە لەوەودوا بەجۆرێکی ئەوتۆ فراوان بوون کاریگەریان گەیشتە دەرەوەی ئەو ولاتەش . وەك بیروڕاکانی کۆنفۆشیۆس (٥٥١ ـ ٤٧١ پ . ز) .

کۆنفۆشیۆس رای وابوو کە قەدەر حوکمی ژیانی خەڵکی دەکاو

ئاسمانیش سەرچاوەی چاکەو سامانە؛ هەروا مرۆڤ خۆیان چۆن دروست بوون هەر بەو چەشنە دەمێننەوەو ناگۆڕێن، لەبەرئەوە لەسەر ئەوانەی خوارەوە پێویستە مل کەچی گەورەکانیان بن و پەیرەوی ئامۆژگاری یەکانی بکەن و هەرگیز داوای ئەوە نەکەن بگەنە ئەوان.

بێگومان ئەم رایانەی کۆنفۆشیۆس بە مەبەستی پتەوکردنی شوێنی خۆی و چینەکەی بووە لە کۆمەڵدا؛ چونکە لەسەردەمێکدا ئەویش لە کاربەدەستانی وڵات بووەو لە بەڕێوەبردنی کاروبارەوە نزیك بووە.

## عێراق و میسری کۆن

خاکی نێوان دووڕووبار (عێراق)و دۆڵی نیل (میسر) دوو مەڵبەندی شارستانێتی کۆنن و لاپەرەکانی یەکەمی مێژووی شارستانێتی سەر ئەم زەوی یە پێك دێنن. ئەمەش بەپێی ئەو بەڵگەو دەسکەوتە زانستی و مێژووییانەی کە دۆزراونەوەو تا ئێستاش هەر لە دۆزینەوەو شی کردنەوەدان.

لێرەدا بیری فەلسەفی زیاتر بە پەرەسەندنی سەرەتای زانستە سرووشتی یەکان و ئەفسانەوە بەسترابۆوە، وەك ئەستێرە ناسی و ماتماتیك و نۆژداریی (الطب)و بیناسازی و. تد.. کە لەم ناوچانەدا بەگەرمی بەرەوپێشەوە دەچوون و بایەخێکی زۆریان پێ دەدرا، جێماوە شارستانی و شوێنەوارە کۆنەکانی ئەم مەڵبەندانە تا ئێستاش هەرماون و بەڵگەی راستی ئەم قسەیەن.

لەرووی کاری ئەندازیاری یەوە ئەوەتا ئەهرامەکانی میسرو باخچەو خانوبەرەکانی بابل و ئاشورو سۆمەر دەست ڕەنگینی و کارامەیی و ئەندازیارانی ئەم مەڵبەندانە دەردەخەن.

هەروا مۆمیاکردنی فیرعەونەکانی میسرو بەکارهێنانی داوو دەرمان و رێی چارەسەرکردنی جۆراوجۆر رووی پرشنگداری نۆژداریتی ئەم مەڵبەندانە دەسەلمێنن. خۆ لەبواری ئەستێرەناسیشدا هەنگاوی گەورە نراوەو بناغەیەکی تارادەیەك پتەو لەم رووەوە دارێژراوە.

هەروا سەرلەبەری مرۆڤایەتی قەرزاری شارستانێتی عیراقی و کۆنن لەو رووەوە کە بنچینەکانی جەبرو نەخشەکێشان و زۆر شتی تریان دارشتووە. بۆ نموونە عێراقی یە کۆنەکان یەکەم کەس بوون کە سەعاتیان بەپێی سیستەمی (٦٠)ی بۆ دەقیقەو بچوککراوەکانی دابەش کردووە.

جگە لەوەش لە عێراق بۆ یەکەم جار لە مێژوودا یاسا نوسرایەوەو مەسەلە کۆمەڵایەتی یەکان بەم شێوەیە خرانە پێش چاو. ئەوە یاساکانی حامورابی کە نەك هەر شەریعەتێکی سادەو ساکارنین، بەڵکو سیستەمێکی یاسایی رێك و پێکەو کاری یاسازانی شارەزایە.

ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە ئەفسانەو داستانەکانی ئەم مەڵبەندانە گەلێك بیرۆکەی فەلسەفی یان لەخۆگرتووەو وەڵامی زۆر پرسیاریان داوەتەوە کە ئەوکاتە مێشکی مرۆڤیان سەبارەت بە بوون و دروستبوون خەریك کردبوو ئەوەتا ئەفسانەکانی ئافەریدەبوون (اساطیر الخليقة) لە عێراقدا بەشێوەیەکی گشتی سەرەتای دروستبوون دەگێرنەوە بۆ ئاو. هەروەك سۆمەری یەکان و دوایش بابلی یەکان دەڵێن: جارێ ئاسمان ناو نەنرابوو ئاسمان، زەویش ناوی زەوی نەبوو، کە لە (ئابسۆ) (ئاوی شیرین – باوکی مرۆڤ)و (تیامات) (ئاوی سوێر – دایکی مرۆڤ)، هەموو شتێك دروست بوو[٦]. هەروا میسری یە کۆنەکانیش بەپێی جێماوە ئەدەبی یەکانیان رایان وابووە کە هەموو شت و بوونەوەرەکان لەئاوی ساردەوە یان لە هەواوە کە لە هەموو شوێنێکدا هەیەو هەموو شوێنێکی پرکردۆتەوە دروستبوون. کەچی دوای ئەوان بە سەدان ساڵ (تالیس) بنچینەی شتەکانی بۆ ئاو گێرایەوەو (ئەناکسیمانس)[٧] یش بۆ هەوا.

بەڵام وەك وتمان لە عێراق و میسری کۆندا زیاتر بایەخ بەکاری زانستی دەدراو بەتایبەتیش لە رووی کردەیی یەوە، هەروا ئەو بیرورا فەلسەفیانەی لەبارەی ژیانی سرووشتی و کۆمەڵایەتیەوە گەلاڵەکرابوون، نەگەیشتبوونە ئاستێکی ئەوتۆ کە بە شێوەیەکی (موجەرەد)و سەربەخۆ لە زانست و ئەفسانەکان دابڕێژرێن و بخرێنەڕوو، واتا بچنە قاڵبی زانستی فەلسەفەوە.

## هەر لە رۆژهەڵاتدا:

جگە لەو بیرو بۆچوونانەی باسمانکردن، هەر لە رۆژهەڵاتدا گەلێك بیروڕای جۆراوجۆر سەبارەت بە ژیان و بوون و کردارو پاشەرۆژی مرۆڤ هەبوون و لە چوارچێوەی ئایین و ئەفسانەدا دەرکەوتوون. بیروڕاکانیش زیاتر پەیوەندی ژیانی رۆژانەی خەڵکیان بە دەوروبەرو سرووشتەوە دەربڕیوەو لە گۆشەی پێویستی یەکانی مرۆڤەوە روانیویانەتە بیرکردنەوەو دوارۆژی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و مرۆڤ.

ئەوەتا ئایینی زەردەشتی بە روونی ئەوە دەردەخا کە بیرکردنەوەی ئەوکانەی مرۆڤ تا چ رادەیەك پەیوەندی بەژیان و پێویستی یەکانی رۆژانەی خەڵکی یەوە هەبووەو رەنگدانەوەی گوزەرانی ئەوکاتەیان و نەخشەکێشی داهاتوویان بووە.

بەپێی ئایینی زەردەشتی گەردوون شانۆیەکی گەورەیەو لەناویدا ململانێیەکی توندو بەردەدام لەنێوان دوو هێزی گەورەو دژبەیەکدا بەرێوەدەچێ. لەنێوان چاکەو خراپە، رووناکی و تاریکی، رووناکی نیشانەی چاکەو خێرەو تاریکیش نیشانەی شەڕوخراپەیە. نەفسی مرۆڤیش

هەر هەمان شانۆیە بەلاّم بەبچوککراوەیی . چونکە لە هەر مرۆڤێکدا هەردوو لایەنەکە کۆبۆتەوە چاکەو خراپە – .

(ئاهورامزدا)ش سەرپەرشتی کاری چاکە دەکاو مرۆڤ بەرەو رووناکی رێنمایی دەکا ، بە پێچەوانەشەوە (ئەهریمەن) کەخوای خراپەو شەڕە هەوڵ ئەدا مرۆڤ بەلای خۆیدا راکیشێ‌و دەست بەسەر هەموو کردارەکانیدا بگرێ .

بێگومان باسکردنی ئەم دوو لایەنە دژبەیەکەو ململانێ‌ی نێوانیان لەوەودوا بووە مەسەلەیەکی تارادەیەك بنەڕەتی ، بەتایبەتیش لە بیری یۆنانیدا . چونکە زۆربەی بیرمەندو فەیلەسوفەکای یۆنانیش باسی ئەم مەسەلەی دژایەتیەیان کردووەو لەوە دواون کە بەلای کەمەوە دوو هێزی سەرەکی‌و دژبەیەك هەن ، جا هەریەکەیان بەجۆرێك ناوی هێزەکان دێنن .. وەك نەفس‌و لەش ، خۆشەویستی‌و کینە ، جیهانێکی بەرهەست‌و بگۆڕ ، بەرامبەر جیهانێکی ئەزەلی‌و نەمر . ئەمەش لەوەودوا دێینە سەری‌و درێژتر لێ‌ی دەدوێین .

هەروا لەئاینی زەردەشتیدا وەك (بوزی) باسی ئازارو ژانی مرۆڤ‌و رێبازی خۆرزگارکردن لێیان کراوە ، بەلاّم لێرەدا – لای زەردەشت – خۆرزگارکردن بەخۆ دوورخستنەوە لە جیهانی واقیعی‌و خۆدانە دەست ئازارو ژانەکە نی‌یە ، بەڵکو روخسارو ناوەرۆکێکی تری وەرگرتووە ، بەڕای زەردەشت خۆرزگارکردن رووبەڕووبوونەوەی واقیع‌و بەگژاچوون‌و رەتکردنەوەی ئەهریمەن‌و داواکاری‌یە خراپەکانیەتی[9] نەك شاندانە بەر واقیعە تاڵەکە .

هەر لێرەشەوە لەبیری زەردەشتیدا مەسەلەیەکی گرنگ دێتەگۆڕێ ، ئەویش دەوری مرۆڤ‌و گەورەیی‌یەتی ، چونکە بەپێ‌ی بیروڕای زەردەشت‌و کتێبەکەی (ئاڤێستا) مرۆڤ بوونەوەرێکی بێ‌دەسەلاّت‌و دەستەوستان نی‌یە ، بەڵکو خۆی سەرپشکە کامیان هەلبژێرێ ، چی بکا ! دوای رووناکی بکەوێ یان تاریکی ، جا ئەگەر پشتی ئاهورامزدای گرت‌و بەپێ‌ی ئامۆژگاریەکانی بەرێوەچوو ، ئەوا لە ئاکامدا لایەنی خێروچاکە بەسەر ئەهریمەن‌و تاریکی‌و خراپەدا سەردەکەوێ‌و مرۆڤ لە ئازارو ژانەکە رزگاردەبێ[10] .

نەك هەر ئەمەش بەڵکو زەردەشت داوای ئەوە دەکاو بەمرۆڤ دەڵێ دوای ئاهورامزدا بکەون . چونکە سەرکەوتنی ئەو حەتمی‌یەو لە ئەنجامدا هەر رووناکی بەسەر تاریکیدا زالّ‌دەبێ .

جا مرۆڤیش بەپێ‌ی بەشداری کردنی لە بەگژاچوونی ئەهریمەن‌و لایەنگرتنی ئاهورامزدا پاداشتی خۆی وەردەگرێ‌و ژیانی داهاتووی ئاسودە دەبێ[10] .

لەراستیدا بیری فەلسەفی‌و زانستی لە رۆژهەلاّتدا زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێ کە لێرەداو بەکورتی باسکراوە . بەلاّم رەنگە بەوەندەش ئەو راستی‌یە دەربکەوێ کەمەڵبەندی لەدایك‌بوونی بیری فەلسەفی ، تەنیایۆنان نەبووە ، بەڵکو ئەوەی لە رۆژهەلاّتی کۆندا بەدەست‌هاتووە رۆڵێکی گەلێك گەورەی لەپێوکردنی شارستانێتی‌یەکانی دوای خۆیدا دیوەو ، بگرە یەکێك لە مەرجەکانی گەشەکردنی فەلسەفەو زانست‌و بیری یۆنانیش ئەو بنچینەیە بوو کە لەپێش ئەواندا لە رۆژهەلاّت‌و ناوچەکانی‌تردا دارێژرابوو.جا لەگەلّ هەموو ئەمانەشدا کە لەبارەی بیرو بۆچوونی گەلانی رۆژهەلاّتەوە باسمان‌کردن ، ناتوانین بڵێین فەلسەفە وەك زانستی فەلسەفەو بەو مانا تایبەتی‌یە هەبووە . بەڵکو تەنیا بیرو تێڕوانینی فەلسەفی بووە ، هەڵوێست‌و لێکدانەوەی مرۆڤ بووە ، چونکە تا ئەو کاتەو چەند سەدەیەك لەوەودواش وەك بەشێکی دیار لە هۆشیاریی کۆمەلاّیەتی جێ‌ی خۆی نەگرتبوو ، بەلاّم بەهۆی پەرەسەندنی ئەو زانستی‌یە سرووشتیانەوەو ئەو ئەفسانەو بیروڕایانەی کە هەبوون زەمینەیەکی باش بۆ گەشەکردنی رەخسا کە لەوەودوا لای یۆنانیەکان زیاتر گەشەی‌کردو ، ئەوانیش زیاتر لە سیستەمێکی فەلسەفی کامڵتریان نزیك‌کردەوەو گەلێك هەنگاوی گەورەیان لەبواری بەرەوپێشەوەچوونیدا نا :

خۆ ئەگەر لێرەدا زۆر بەکورتیش باسی هەندێك لەو مەسەلە سەرەکی‌یانە بکەین کە لەبیری رۆژهەلاتدا سەرنجیان دراوەو لەوەودواش لە بیری یۆناندا دووبارە بوونەوە ، بەئاشکرا گەورەیی‌و کاریگەریی بیری فەلسەفی‌و زانستی رۆژهەلاّت دەردەکەوێ .

لەبیری فەلسەفی رۆژهەلاّتدا بەتایبەتیش لای هیندی‌و چینی‌یەکان باسی رەگەزە بنەڕەتی‌یەکانی درووست‌بوون (ئاو ، ئاگر ، خۆلّ ، هەوا ، کانزا) کراوەو بەهەمان شێوەش بیرمەندانی یۆنان خۆیان پێوە خەریك کردووەو سەرەتای ژیان‌و بوونیان بۆ ئەو رەگەزانە یان یەکێك لەوانە گێڕاوەتەوە .

هەروا مەسەلەی‌دووەلیزمی (ثنائیة) گیان‌و لەش یان نەفس‌و لەش کە سەرەتا لە بیری هیندستاندا سەری هەڵداو دواییش لە یۆناندا لە ئۆرفیزم‌و[11] فیساگۆریزم‌دا دووبارە بۆوە. لێرەشەوە ململانێ‌ی دژەکان‌و پەیوەندی‌یان بەیەکەوە–کەلە بیری زەردەشتیدا ململانێ‌یەکە لەنێوان دوو هێزی گەورەدایە – دیسانەوە بە شێوەی ململانێ‌ی نێوان نەفس‌و لەش لە

(ئۆرفیزم)(١١) دەردەکەوێتەوە . ئەوان رایان وابوو کەلەمرۆڤدا دوو هێز کۆبوونەوە (خودایی‌و شەیتانی) ، چارەنووسی مرۆڤیش بەوبریارەیەوە بەستراوە کە ئایا دوای کامیان بکەوێ . ئیتر خۆ ئەم ململانێ‌یە دژانە لای (هیراکلیتس)(١٢) گەیشتە چلەپۆپە .

ئەنبادۆکلیسیش (١٣) (سەدەی‌پێنجەمی ب . ز) هیزەکان ناو دەنێ خۆشەویستی‌و کینە ، خۆشەویستی هۆی یەکگرتن‌و درووست‌بوونەو کینەش هۆی تێکچوون‌و دابرانە . ئینجا لای پلاتۆن ئەم دوو هێزە دەچنە روخسارێکی فراوانترەوەو دەبنە دوو جیهان ، جیهانێکی مادی بەرهەست کە بگۆرو بزێوو پر کارەساتە ، جیهانی ئەقڵیش کە خێرو جوانی‌و دادپەروەری باڵی بەسەردا کێشاوەو ئەزەلی‌و نەمرە .

ئەمە جگە لە سەرەتاو بنچینەی گەلێك لە زانستەکان کە لە رۆژهەلاتدا دارێژرانو لە یۆنان زیاتر بەرەیان پێ‌درا ، وەك ماتماتیك‌و ئەندازەو ئەستێرەناسی‌و نوژداریی‌و .. تد .

جا بۆ زیاتر رونکردنەوەی هۆی ئەم هاوکاریگەریێتی‌یەو لێکچوون‌و تێکەڵ‌بوونی بیری ئەم گەلانەو هەروا چونێتی‌و رێگای کاریگەریی شارستانێتی‌یەکانی رۆژهەلات لە شارستانێتی‌و بیری یۆنان دەتوانین بڵێین .

١ – هەندێك لە شارستانێتی‌یەکاتی رۆژهەلات تا سەرهەڵدانی شارستانێتی یۆنانیش هەر بەردەوام‌بوون ، وەك هی میسری‌یەکان،ئەمەش یەکسەر هەردوو جەمسەری رۆژهەلات‌و رۆژئاوای پێکەوە گرێ‌داو گواستنەوەی دەسکەوتە زانستی‌و فەلسەفی‌یەکانی بۆ یۆنان ئاسانترکرد .

٢ – ئەو شارستانێتی‌یانەی – لە رووی کات‌و شوێنیشەوە – لەنێوان رۆژهەلات‌و یۆناندا بوون ، وەك فینیقی‌یەکان‌و کلدانی‌یەکان‌و ئەوانەی سەر دەریای ئیجەو .. تد بوونە پردێکی لەبار بۆ ئاشناکردنی یۆنانی‌یەکان بە جیهانی رۆژهەلات . چونکە پەیوەندی‌یەکی بازرگانی‌ی پتەو لەنێوان یۆنان‌و ئەو شارستانێتی‌یانەدا هەبوون کە ناومان بردن‌و نزیك‌بوون لە شارستانێتی‌یەکانی رۆژهەلاتەوە ، ئەم بازرگانیەش بووە هۆی تێکەڵاوبوونی خەڵکی ئەم مەڵبەندانەو تەنانەت فێربوونی زمانی یەکتریش . ئاشکراشە لەهەر شوێنێك شمەك (بضاعة) گۆرینەوە هەبێ بیروباوەر گۆرینەوەش دەبێ .

٣ – لەرێی ئەو هێرش‌و هەڵمەتە سەربازیانەوە – کە چ لە رۆژهەلاتەوە بکرانایە سەر یۆنان یان بە پێچەوانەوە – شارستانێتی‌یەکان زیاتر بەیەك ئاشنابوون . بە تایبەتیش هێرشەکانی ئەسکەندەری مەکدۆنی کە بەئاسانی گەیشتە میسرو لە رۆژهەلاتیشەوە گەیشتە چین .

٤ – وەك ئاشکرایە زۆر لەزاناو بیرمەندو فەیلەسوفەکانی یۆنان سەریان لەشارستانێتی‌یەکانی رۆژهەلات داوەو لەنزیکەوە شارەزای دەسکەوتە زانستی‌و بیری‌یەکانیان بوون

بێگومان ئەمانەی باسمان‌کردن ئەوە ناگەیەنن کە هەرچی یۆنانیەکان کردوویانە هەر هەموویان لە رۆژهەلاتەوە وەرگرتووە . جونکە مرۆڤ زادەی سرووشت‌و کۆمەڵەو ، دیاردە سرووشتی‌و کۆمەلایەتی‌یەکانیش زەمینەو بابەتی لێکدانەوەو بیرکردنەوەی مرۆڤن بەگشتی . کەواتە سەرجەمی مرۆڤایەتی هاوبەشن لەوەی بیریان لێ‌بکەنەوەو شی‌یان‌بکەنەوە . بەم پێ‌یەش شتێکی ئاسایی‌یە کە لە هەندێ رووەوە بیروبۆجوونی مرۆڤ لەیەکەوە نزیك‌بن‌و بگەنە هەمان ئەنجام . لەبەرئەوەش دەگونجێ یۆنانیەکانیش لە لێکدانەوەی هەندێك دیاردەو کێشەدا خۆیان گەیشتبنە هەمان ئەو ئەنجامەی لەرۆژهەلاتدا بەدەست‌هاتووەو کت‌ومت لەوانیان‌وەرنەگرتبێ .

**پەراوێزەکان** :

١ – د . حسين حرب – الفكر اليوناني قبل افلاطون – ل ٥ .

٢ – فیساگۆرس : یەکێك بووە لە زانافەیلەسوفەکانی یۆنان‌و لە سەردەمی بۆلیکراتی ستەمکاردا ژیاوە . خۆی بە باسی زانستی‌و بە تایبەتیش ژمارەو لێکدانەوەی بیرکاری‌یەوە خەریك کردووە . کۆمەڵەیەکی نهێنی پێکهێناوەو هەر ئەم کۆمەڵەیەش پەرەیان بە بیروراکانی داوە . سەری لە فینیقیاو میسرو عێراق داوەوشارەزای زانست‌و بیروراکانیان بووە .

٣ – تالیس : بە یەکەم فەیلەسوفی یۆنانی‌و یەکێك لە حەوت داناکە (الحكماء السبعة) دەژمێرێ . شارەزای بیرکاری‌و ئەستێرەناسی عێراقی‌و میسری‌یە کۆنەکان بووە . وای لێ دەگێرنەوە پێشبینی ئەو خۆرگیرانەی کردووە کە لە ٢٨ی ئایاری ٥٨٥ی (پ. ز)دا رووی‌داوە. هەوڵی داوە لەنێوان هەموو شتە جۆراوجۆرەکاندا بۆ تەنیا سەرچاوەیەك بگەرێ کە هەموو شت‌و بوونەوەرەکانی لێ‌درووست‌بوون . لە دواییشدا گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە (ئاو) ئەو سەرچاوەو بنەرەتەیە .

٤ – حسام الالوسي – من الميثولوجيا الى الفلسفة – لل ٥ ، ٦ .

٥ – هەمان سەرچاوە . ل٤١

٦ – مجموعة علماء – موجز تاريخ الفلسفة . المقدمة .

٧ – اميل برهيه – تاريخ الفلسفة – ل ٨ .

٨ – ئەناکسیمانس : (٥٨٨ – ٥٢٥ پ . ز) فەیلەسوفێکی یۆنانی‌یەو ئەمیش لە حەوت داناکەیە . بروای وابووە کە هەموو شتەکان لەهەواوە دروست‌بوۆنو بۆ ئەویش دەگەڕێنەوە . هەواش بزێوو نەمرەو دوایی نایەت . کە هەوا خەست‌بۆوە دەبێتە هەورو ئەویش دەبێتە ئاوو ئینجا ئاویش دەبێتە خۆڵو ئەویش دەبێتە بەرد . ئەمەش بەپێی گۆرانی چەندێتی شتەکان بۆ چۆنێتی .

٩ – فالح مهدي – البحث عن المنقذ ل ٧٧

١٠ – هەر ئەو سەرچاوەیە – ل‌ل ٧٨ – ٧٩ .

١١ – ئۆرفیزم : ڕێبازێکە لە ئەفسانەو بیری فەلسەفی یۆنانی . بۆچوونو بیری کۆیلەو جوتیارە هەژارەکانی یۆنانە دژی ئەو ئەفسانانەی کە دەیانگوت ژیانی جیهانەکەی دوای مردنیش هەر بەردەوام‌بوونی ژیانی سەر زەوی‌یە . بەرای ئۆرفیزم مرۆڤ لەگیانو لەش پێك دێت‌و گیانیش لە جیهانەکەی ترەوە هاتۆتە ناو لەش‌و سەر زەوی‌و ئازار دەچێژێ .

ئەم بیروڕایانەش هەموویان دەدرێنە پاڵ شاعیرێکی ئەفسانەیی کە ناوی (ئۆرفیوس) بووەو وەك پێغەمبەری ئەم ڕێبازە لە یۆنانی کۆن‌دا حسابی بۆ کراوە .

١٢ – هیراکلیتس : (٥٤٤ – ٤٨٣ پ. ز) یەکێکە لە فەیلەسوفە بلیمەتەکانی یۆنانو کتێبێکی بەناوی (لەبارەی سروشتەوە) نووسیوە بەلاّم زۆربەی فەوتاوەو نەگەیشتۆتە دەستی مێژوونووسان . ڕای وابووە کە ئاگر سەرچاوەی هەموو شتەکانە لە گەردوون‌دا ، چونکە لە هەموویان زیاتر توانای گۆرانو بزووتنەوەی هەیە . ئەم ئاگرەش بەردەوام بە ڕێژەیەك دەسوتێ‌و بەرێژەیەك کپ دەبێتەوە . بەرای هیراکلیتس هەموو شت‌و سیفاتەکان بەردەوام دەگۆڕێن بۆ دژەکانیان .. گەرم بۆ ساردو سارد بۆ گەرمو .. تد . بێگومان ئەمەش پرۆسێسێکی (عملیة) هەروا ئاسان نی‌یە . بەڵکو ململانێ‌یەکی توندە ، ململانێش «باوك‌و سەرداری هەمووشتەکانە» .

جا بەڕێوەچوونی ئەم کردارانەش هەمووی بەپێی یاسایەکە کە ئەم ناوی دەنێ (لۆگۆس) .

١٣ – ئەنبادۆکلیس : ئەمیش یەکێکە لە زاناکانی یۆنانو بیروراکانیشی زیاتر لە زانستەوە نزیکن وەك لە فەلسەفەوە . ئەنبادۆکلیس یەکەم بیرمەندی یۆنان بووە باسی ئەوەی کردوو کە هەموو شتەکان لە چوار ڕەگەزەکە دروست‌بوون (ئاگر ، هەوا ، ئاو ، خۆڵ) هەمووشیان ئەزەلی‌و ئەبەدین . بەلاّم دوو مەبدەئی تری دژبەیەك هەن کە دەستیان بەسەر کرداری دروست‌بووندا گرتووە ، ئەوانیش خۆشەویستی‌و کینەن . خۆشەویستی ڕەگەزەکان پێکەوە کۆدەکاتەوەو لەوڕێ‌بەشەوە شتەکان دروست‌دەبن ، بەلاّم کینە دەبێتە هۆی لێك‌دابرانی ئەم ڕەگەزانەو ، هەڵوەشاندنەوەی پێکهاتن‌و یەکگرتنەکە .

**سەرچاوەکان :**


١ – مجموعة علماء – موجز تأريخ الفلسفة – الجزء الاول – ط[١] ١٩٧٢ .

٢ – جورج سلرتون – تأريخ العلم – الجزء الاول – دار المعارف – مصر ١٩٦٣ .

٣ – د . حسام الالوسي – بواكير الفلسفة قبل طاليس – أو من الميثولوجيا الى الفلسفة – دار الشؤون الثقافية – بغداد – ط[٣] – ١٩٨٦

٤ – هـ . فرانكفورت ، هـ. ا. فرانكفورت جون . أ . وا ، توركيد جاكو بسن : ترجمه – جبرا ابراهيم جبرا – ط[٢] ١٩٦٠ .

٥ – اميل برهييه – تاريخ الفلسفة – الفلسفة اليونانية) – ترجمة : جورج طرابيشي – دار الطليعة – بيروت ١٩٨٢ .

٦ – تيودور وايزرمان – تطور الفكر الفلسفي – ترجمة . سمير كرم – دار الطليعة – بيروت – ١٩٧٧ .

٧ – روجيه غارودي – النظرية المادية في المعرفة – ترجمة – ابراهيم قريط – دار دمشق .

٨ – يوسف كرم – تاريخ الفلسفة اليونانية – دار القلم – بيروت – ١٩٧٧ .

٩ – جون لويس – مدخل الى الفلسفة – ترجمة : انور عبد الملك – الدار المصرية للكتب – القاهرة – ١٩٥٧ .

١٠ – مرغريت روثن – علوم البابليين – ترجمة : د . يوسف حتي – دار الرشيد – بغداد – ١٩٨١ .

١١ – فالح مهدى – البحث عن المنقذ – دار ابن رشد – بيروت ١٩٨٠

١٢ – د . حسين حرب – الفكر اليوناني قبل افلاطون – دار الفارابي – بيروت ١٩٨١ .

١٣ – اساطير بابلية – ترجمة : سلمان التكريتي – النجف ١٩٧٢ .


●

# پەیامی کافکا ١

نووسینی :صادق هیدایەت
وەرگێڕان و کورت کردنەوەی
هیمدادی حوسین

ئەو نووسەرانەی کە بۆ یەکەمجار ڕێگاو بیرو بابەتێکی تازە دێنە مەیدانەوە ، دەگمەنن ، بە تایبەتی مانایەکی تازە بۆ ژیان لەگەڵ خۆیان بێنە ئاراوە ، کە بەر لەخۆیان بوونی نەبووبێ – کافکا بە یەکێك لە هونەرمەندترین نووسەرانی ئەو دەستەیە دەژمێردرێ .

خوێنەرێك کە لەگەڵ دنیای کافکا سەروکار پەیدا دەکا ، لەکاتێکدا وورد و خاش بووەو بەرەولای دەچێ : کە لە دەرگای دنیایەکەی دەچێتە ژوورەوە ، کارتێکردنی ئەو بەسە رژیانی خۆیەوە دەبینێ و پەی بەوە دەبات ، کە دنیا ئەوەندە بن‌بەست نەبووە . کافکا لە دنیایەکەوە بۆمان دەدوێت ، کە تاریك‌و جەنجاڵ خوێ دەنوێنێ ، بە شێوەیەك کە هەر لەسەرەتاوە ناتوانین بە پێودانگەکانی خۆمان ئەو هەڵسەنگێنین . لای ئەو باس باس چی‌یە ؟ ، بێ کۆتایی (لایتناهي) ؟ ، خودا؟ جن‌و پەری !؟ ، نەخێر ، باس باسی ئەوشتانە نی‌یە. بابەتە سادەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆمانە ، لەگەڵ ئەو خەڵکە ئاسایی‌یە ، لەگەڵ کارمەندانی کارگێری‌یەکان ڕوو بە ڕوو دەبینەوە ، کە هەمان گرفتاری‌و کێشەکانی ئێمەیان هەیە ، بەزمانی ئێمە دەدوێن‌و هەموو شتێ شوێنی ئاسایی خۆی وەردەگرێ ، بەڵام لەناکاو هەستێکی پەشۆکاو یەخەمان دەگرێت ! هەموو ئەو شتانەی لەلامان جددی‌و مەنتقی‌و ئاسایی بوو بە جارێ مانای خۆیان گوم دەکەن ، بەندۆڵی کاتژمێر بەجۆرێکی دی دەکەوێتە کار ، مەوداکان بەپێی ئەندازەگیری ئێمە دەرناچن ، هەواتێك دەچێ‌و پشوومان تەنگ دەبێ ، ئایە لەبەر ئەوەیە کە ئەو شتانە مەنتقی نین ؟ بە پێچەوانەوە هەموو شتێ بەڵگەو پاژەی خۆی هەیە ، بەڵگەیەکی ئاوەژوو ، مەنتق هەوسارێکی پچڕاوەو ناتوانێ بەر دەمی بگرێ ، بەڵام نەء ! هی ئەوەیە کە سەیردەکەین ئەو خەڵکە بەگشتی سەریان شۆڕ کردۆتەوە سەر کارەکانیان‌و بەووردی تیایاندا کاردەکەن‌و هاودەردمانن‌و وەك ئێمە بیردەکەنەوە ، هەرچی کارگوزارو پشتیوان هەیە «پووچ» دەنوێنن . مەکینەکانی خۆکار بەدبەختن‌و هەر چەند کارەکانیان جددیترو گرنگتر بێت ، گاڵتەجارانەتر دێنە بەرچاو ، کارەکانی ڕۆژانەو ئەنجام‌و وەزیفەیان‌و هەموو ئەو شتانەی کە خوومان پێوە گرتووەو لەلامان ئاسایین ، لە ژێر قەڵەمی کافکادا واتای پێکەنین‌دارو پووچ‌و هەندێ جار ترسناك بەخۆیانەوە دەگرن . ئادەمیزاد یەکەو تەنهاو بێ پشت‌و پەنایەو لەسەر زەمینێکی ناسازگاری گومناو دەژی ، کە شوێنی لە دایك‌بوونی خۆی نی‌یە ، ناتوانێ لەگەڵ کەس پێوەندی پەیدا بکاو دڵ بەکەسەوە ببەستێ ، خۆی دەزانێ ، چونکە هەر لە نیگاو کوڵمی‌یەوە دیارە ، وەك ئاشکرایە کافکا تا ئەم دواییە لە ئەوروپادا ناوی نەبوو ، چونکێ وەرگێڕانی بەرهەمەکانی بەر لەجەنگ گرنگی‌یەکی ئەوتۆی پێ‌نەدرابوو کەسێ لەبارەیەوە نەدەدوا ، بەڵام دوای چوار ساڵ خامۆشی ، کاریگەری‌یەکی وای‌بوو بەیەکجار ناوبانگی‌یەکی جیهانی وەدەست هێنا ، کافکا کێ‌یە ؟ لە کوێوە هاتووە ؟ ئەم فیکرەیە سەرچاوەکەی لە کوێوەوەیە ؟ ، کە پەیامی ئەو لەگەڵ ئاوازی دنیای ئێمەدا دەگونجێ‌و هاومەبەستی نزیك لەگەڵ ژیانی ئێستادا نیشان دەدات ؟ دەشێ خوێنەری ئەوروپایی هێشتا دەگەڵ ئەم جۆرە فیکرەیە ئاشنایی نەبووبێ ، چونکە ئەو مانگەشەوە ساردەی ئاسمانی نووسینەکانی کافکای گرتووە ، چریکەی سادەو توێژینەوەکانی کافکا بۆ نیشاندانی شێوانی هەقیقەت (وەك لەبەرچاوە) ئەو گەڕانە بێ‌ڕەحمانەی کە کردوویەتی بۆ ئاشکرا کردنی (واجب الوجود)و نەگەیشتنی بە هیچ‌و ئەو تەمومژەی لە لێکچواندنەکانیدا هێناویەتیەوە هەموو ئەمانە بوون بە هۆی کۆسپ لەڕێی ناوبانگ دەرکردنی ، بەڵام کەسانێك کە شارەزای تەواوی دنیاکەمانن ، باوەشیان بۆ کتێبەکانی کافکا کردۆتەوە . لە ڕابردوودا بەر لەم جەنگەی دوایی ، خەڵکی هێشتا ئومێدێکی نادیاری‌یان بە ئازادی‌و ڕێزی مافی مرۆڤ‌و داد هەبوو ، هێشتا ئارەزوومەندانی دیکتاتۆری لە جێگای ئازادی ، کۆیلەیەتی‌و لە جێگای مافی مروڤ بۆمبای ئەتۆم‌و لە جێگای داد بێ‌دادی‌یان گرتبووە بەر . هێشتا کۆمەڵانی خەڵك بەدەست سیاسەتبازان‌و تاڵانکەرانەوە نەگۆڕابوون بۆ گیانەوەرو مرۆڤی نیوەگیان . لەبەرئەوە یە کە خەڵك دوای جەنگ هەست بە ڕەنگدانەوەی دنیایەکی پووچ دەکەن ، کە کافکای بەشێوەیەکی غەمبارانە پەروەردە

کردووه .

بۆ ئەوەی بتوانرێ دەربارەی نووسراوەکانی کافکابریارێکی یەکجاری بدرێ ، ناچار دەبێ ئەو زەمانەو ئەو سەرزەمینەی ئەوی لێ پەروەردە بووە ، لەبەرچاوبگیرێ . نووسراوەکانی ئەو بەرهەمی پێش و دوای جەنگی جیهانی (١٩١٤)ەوەن ، لەو زەمانە پراگ شارێك بووە لە رۆژهەلات و رۆژئاوا دەسەلاتی بووەو چەندان نەژادی جۆراوجۆر تێکەل یەکدی ببوون . لەم شارەدا چەندان میللەت و شارستانیەت تووشی یەکتر ببوون و کاریان کردبووە سەریەك . تەنها پراگ توانیویەتی شەخسێکی وەك کافکا پەروەردەبکا . هەلاتنی کافکا لە دەست خزمەکانی و لەهەمان کاتدا هەلاتنی لەپراگ و گوستن وای کردبوو زمانی جۆراو جۆر بزانێ .

شبکردنەوەو لێدوان لە کافکا کامل نابێ ئەگەر کارتێکردنی دەورووبەرەکەی لەبەر چاو نەگیرێ ، کافکا ناوێکی ئاسایی جوولەکەکانی نیشتەجێی چیکسلۆڤاکیای زەمانی ئیمپراتۆری هامبۆرگ بووە . لە زمانی چیکیدا بە مانای «قەلەرەشی گچکە» دێت و باڵندەی ناوبراو نیشانەی خانەی بازرگانی باوکی کافکا بووە لەپراگ .

فرانتس کافکا لە خێزانێکی چیکی جوولەکە لە رێکەوتی ٣ی تەمووزی ١٨٨٣دا هاتۆتە دنیاوە ، کە ماوەیەك بوو تەپلی کەوتنی ئەوروپا لێدراوەو ئیمپراتۆری ئەتریش بەرەو هەلوەشانەوە دەچوو . کافکا لەنێوان باوکێکی خوێندەواری ستەمکاری ،کە هەموو وەختێك بە دوای کامەرانی خوێدا دەگەراو شانازی پێوە دەکردو کورەکەیەشی (کافکا) پێ شێل کردبووو دایکێکی جوولەکەی خەرافاتی و خوشکانی ئاسایی پەروەردە بوو . کافکا حسێبێکی تایبەتی بۆ باوکی دەکرد ، چونکە لێی دەترساو تەواوی دەورەی ژیانی لەسایەی ترسی باوکی یەوە بەسەر برد ، دوای ئەوەی خوێندنی ناوەندی بە زمانی ئەلمانی تەواوکرد ، ماوەیەك لەئەدەبیات و پزیشکی کاری کرد . پاشان یاسا سەرنجی راکێشاو بەلکو بەهۆی ئەوەوە بتوانێ نان پەیدا بکات و سەربەستی یەکی شەخسیی لەژیاندا هەبێت .

چووە کۆلیجی یاساو لەساڵی ١٩٠٦دا لەپراگ دکتۆرای لەیاسا وەرگرت ، هەر چەندە ئەم بەشەی نەکردە پیشەی ژیانی خۆی ، بەلام شارەزایی لە یاسا بە چاکی لە نووسینەکانی دا رەنگی داوەتەوە ، هەر لەوکاتەدا لەگەل رۆماننووسی ئایندە (ماکس برود)Max Brod ئاشنایی پەیدا کرد ، ئەگەرچی زەوقی ئەدەبی یان دەگەل یەك نەدەگونجا ، بەلام هەر ئەو کەسە دوایی بووە هاودەم و نووسەری ژیانی ئەو . کافکا لە ١٩٠٨دا بووە کارمەندی کارگێری مسۆگەرکردن (ادارة التأمين) ، دوایی بۆ ماوەیەك لە کاگێری نیوە دەولەتیی مسۆگەرکردنی کۆمەلایەتی (التأمين الاجتماعي) پراگ لە بەشی کارەسات خەریکی کاربووە . بەلام ئەم کارە ماندووکەرەی کارگێری هەموو وەختێکی دەبردو هەلی نووسینی بۆ نەدەرەخساندو کاتێکیش چرێکە نووسین بە مانای ژیانی خۆی دەزانی ، بۆیە بریاریدا بەشەو کار بکات و خەو لەخۆی حەرام بکات . بێگومان ئەو چێژێکی زۆری لەو تاقیکردنەوەی خۆی دەبینی ، ئەو دەورووبەرە پیس و بێ نرخ و هەژاریەی لە دەزگاکانی کارگێری دەبینی بە شێوەیەکی وورد لە کتێبەکانی دیاری خستوون . پەیوەندی بەو تاقیکردنەوە هەیە ، بۆیە کافکا ناچار بوو بە مێزی کارگێریەوە وەبنووسی و لە مالە نەفرەتی یەکەی باوکی ژین بەسەر بەرێ . وا دیارە خێزانەکەی و دۆستەکانی کۆمەکیان نەکردووە تا بتوانێ ئەو حەسانەوە دەروونی یەی پێویستی پێ بوو بۆ خۆی برەخسێنێ . ماکس برۆد ئەو باوەرەدایە ، کە کافکا باوەری بەسەهۆنیەت بووە ، بۆیە ئەو حەسانەوە دەروونی یەی بۆ نەرەخساوە . کەچی کافکا لە بیروراکانی دا زۆر زۆر ئەلمانی بووەو بە ئەلمانی مایەوە لەوەی سەهیۆنی بێ . نووسینەکانی لەسەر رێ و شوێنی ئەدەبیاتی ئەلمانی بوو . لەبارەی رووحیشەوە زیاتر لە پاسکال Pascal و سۆن کیرك گارد Soren Kierk Gaared ی فەیلەسووفی دانیمارکی و دیستۆفسکی Dostoeewski نزیکتربووە لەوەی لە پێغەمبەرانی جوولەکە نزیك بێت . هەرچەندە برۆد ناچاری کرد تا زمانی عیبری فێربێ و کتێبی (تلموذ) بخوێنێ ، بەلام کافکا هیچ کاتێ خەلوەتی خۆی لەدەست نەداوە بۆ ئەوەی لەکۆمەلگای قەلپی جوولەکە تێ بگات . لە ساڵی ١٩١١دا لەگەل (ماکس برۆد) بۆ ماوەیەکی کورت چوونەتە پاریس . ساڵی دواتریش چاوی بە ویمار Weimar کەوتووە . ئەو زەمانە زۆرترین بەرهەمی ئەدەبی خۆی خستۆتە روو ، لە شەوێکدا چیرۆکی «بریار»ی نووسیووە . دوایی رۆمانی (ئەمریکا)ی بە دەستەوە گرتووەو چیرۆکی گەورەی (داوەشان) کۆتایی پێ هێناوە . هەروەها سەرەرای ئەوەش لەگەل کیژە ئەلمانی F.B خۆشەویستی لەنێوانیادا دروست بووە ، بەلام مەوزوعی ژن و مێردایەتی ئەمرۆو سبەینێ پێ کردووەو تا دواجار دوای پێنج ساڵ حەزلێکردن وازی لە دەسگیرانەکەی هێناوە .

رۆمانی (داوەری)و (ولگەی سزا) ی پێش ساڵی ١٩١٤ نووسیوون . لە ساڵی ١٩١٦ دا گۆیا بە هۆی کێشمەکێش و یان رێسوایی کە وەك (ماکس برۆد) ئیشارەتی بۆکردووە ، ماوەیەك مالی باوکی بەجێ هێشتووەو لە کۆلانی «کیمیاگەران»ی پراگ خانوویەکی سەربەخۆی بەکرێ گرتووەو بە مانگانەیەکی کەم ژیانی بەسەر بردووە . لەوێ نەخۆش کەوتووەو تووشی سیل بووە . لە ساڵی ١٩١٧دا کافکا خوێن رشاوەتەوەو چەند ساڵ بوو خۆیشی مۆتەکەی مەرگی هەر لەبەرچاو بوو ، لە ساڵەکانی کۆتایی ژیانیدا

نزیکی بەرلین گۆشەگیری هەڵبژاردووە تا هەلی زۆری دەستکەوێ‌و بکەوێتە سەر نووسین‌و لەوێشەوە ماوەیەکی کورت ئاشقانی دەگەڵ «دۆرا دیمانت»ی کچە جوولەکەی پۆڵەندی کردووە. ساڵەکانی قات‌و قڕی‌و گرانی دوای جەنگ بەرلین دەگەیەکی دیشی لێدا. خۆراك کەم بوو. نەخۆشی سیل زیادی کردە گەڕایەوە ئەتریش‌و لە ۳ی حوزەیرانی ۱۹۲۳دا لەتەمەنی ٤١ ساڵی لە ئارامگای سیلدارەکان لەنێزیکی (ڤیەننا) بەشێوەیەکی خەمناکانە دنیای بەجێ‌هێشت.

کافکا لەژیانی خۆیدا تەنیا یەك کتێبی بەچاپ گەیاندو لە پێخەفی مەرگدا هەڵەکانی چاپی کتێبی دووەمی ڕاست دەکردەوە. سێ ساڵ پێش مەرگی. تکای لە ماکس برۆد کردووە. کە گشت دەستنووسەکانی لەکن وی بووەو هەروەها (داوەری)و (کۆشك) و (شوورەی‌چین) هەموویان بسووتێنێ. خۆیشی بەر لە مەرگ چوار نامیلکەی ئەستووری نووسینەکانی خۆی سووتاندووە. بەڵام برۆد گوێ‌ی بەقسەکانی وی نەداوە. کافکا جگە لە چەند تێکستێکی. کە بەڕای خۆی تەواو کامڵن. هەموو بەرهەمەکانی دی خۆی بەخراپ زانیوەو گوتویەتی لە دوای خۆم جگە لە خامۆشی هیچی‌دی نابەخشن....

ئەم نووسەرە پێویستی بە نوێنەرێك نەبوو بۆ ئەوەی دوای مەرگی خۆی ناوبانگ وەربگرێ، بۆیەوەسیەتێکی وای نەکرد.. لە گۆشەگیرییەکی تەواو دەژیاو ئەوەی فەرامۆش کرد بوو خوێنەر بۆ خۆی پەیدا بکا. ڕەنگە کافکا ئارەزووی کردبێ وەك ڕەمزێك لەچاوی ئەغیار بە پەنهانی بمێنێتەوەو بەشێوەیەکی نهێنی ئامێز بێ‌و دەرنەکەوێ. بەڵام ئەو پەردە پۆشی‌یە بووە هۆی شانازی کردنی...

ئەو نووسراوانەی لە کافکا جێماون، سێ ڕۆمانی درێژن:
(داوەری) و (کۆشك) و (ئەمریکا) و کۆمەڵێ کورتە چیرۆك‌و مەتەڵ‌و گوتەی کورت‌و یادداشتی ڕۆژانەی کەسی‌و ئەندێشەی بڵاوو چەند وتارێکی ڕەخنەیی‌و چەند نامەیەکن. بەڵام نووسراوە ئەدەبی‌یەکانی زیاتر بە ناتەواوی ماونەتەوە. سەربردەی ژیانی کافکاش لە لایەن (ماکس‌برۆد)ەوە نووسراوەتەوە چەند پارچە نووسینێکیش لەسەر ژیانی کافکا بەقەڵەمەکانی F. Feigl و دڵبەرەکەی دۆرادیمانت‌و کەسانی ترەوە نووسراوەتەوە، وا دێتە بەر چاو. کە کافکا تەنیا لەگەڵ چەند کەسێك. کە بەپەنجەکانی دەست دەژمێردرێن. لە نووسەران‌و فەیلەسووفان تێکەڵێکەی هەبووە.

شارەزاییەکی زۆری لەئەدەبیاتی زمانی خۆی نەبووە. لەوانەیە ئەم بلیمەتی‌یەی لەئەنجامی توێژینەوەو خوێندنی تێکستی عیبری (تلمود)ەوە بووبێ. بەڵام خوێندنەوەی ئەم تێکستە هیچ لەبیرو باوەڕەکانی نەگۆری کافکا لە بەرامبەر زۆر لە نووسەرە ناسراوەکانی ئەڵمان‌و ئەتریش وای پێشان داوە کەهیچ پێوەندی‌یەکی لەگەڵیاندا نەبووە لەنێوان نووسەرەکانی سەردەمی خۆی‌دا لەگەڵ ڕۆدلف کاسنەر R. Kassner و هۆڤانشتال Von Hofmannstahl و هانس‌کارۆسا H. Carossaو هێرمان‌هەسە H. Hesse و نۆت هامسۆن Hamsn rchkjs mdjcl Kunt Hamsun فرانتی وێرڤل F. Werfel وێلهێلم شیفەر W. Schaferو تۆماس مان T. Mann پەیوەندی هەبووە. بێگومان چیرۆکنووسانی ئەڵمانی‌وەك ئشتەرم Stormو کلایست Kleistو هێبل H. Hebleلو فۆنتانە Fontaneو ئەشتیفەر Stifter و هەروەها گۆگۆل Gogolبە تەواوی لەڕێگەو زمانی نووسینی ئەو بەشداریان کردووە. کافکا بە ووردی نووسراوەکانی گۆتەو تەورات‌و ئوپانیشادرایشی خوێندۆتەوە. بەڵام کارتێکردنی گۆستاڤ فلۆبێر G. Flaubertو (کیرك‌گارد) لە شەخسیەتی ئەو زیاتر لەخەڵقانی دی بەرچاو دەکەوێ. خۆیشی ستایشی مەعنەوی (گۆتە)و (فلۆبێر)ی کردووە. هەروەها جیاوازی فلۆبێرو کافکاش لەوەدایە. کە فلوبێر دەیویست کتێبێك دەربارەی بابەتی پووچی بنووسێ. کەچی کافکا دەیەویست ژیان بە پووچ پێشان بدات. (فلۆبێر) نووسیویەتی:
«هەموو شتێ دەزانم بەڵام باوەڕم بەهیچیان نی‌یە». کافکایش زانای سروشت‌و خووو ئاکارە. بەڵام دەترسا لەوەی بەشتێ باوەڕ بکا. کافکا وەك مشکە کوێرە بە شاری پراگ‌ەوە نووسابوو. ئەوێ‌ی بە پەناگەی خۆی دەزانی‌و لەهەمان کات‌دا لێیشی بێزاربوو. کاتێ دەست بەتاڵی خۆی بەنووسین‌و مەلەوانی‌و بەلەم ئاژوان‌و باغەوانی‌و دارتاشی‌یەوە بەسەر دەبرد.

* * * *

سەیر لەوەدایە بە هەمان شێوە کە زەمەن تێدەپەڕێ سیمای کافکایش بە هێزتر دێتە بەرچاو. ئەشێ بە ڕێگەی شیکردنەوەی دەروونی ئەو بتواندرێ تا ڕادەیەك پەی بە ژیانی دەروونی ئەو ببردرێ. بەڵام نامۆیی خوورەوشتی هەر بە شاراوەیی دەمێنێتەوە. سێ بابەت چارەنووسی کافکایان دەست نیشان کردووە:

دژایەتی باوك‌و لەئەنجامی ئەو دژایەتی‌یەش دژایەتی کردنی کۆمەڵگای جوولەکە (یەهوودی). ژیانێکی ناخۆش‌و سادە. لەوێ کە باوکی بە نوێنەری یاساو کۆمەڵگاکە دەزانی.

بۆ تێگەیشتنی خوداوەند کەوتبووە گەرانی شەخسیی خۆی. بەڵام بە دەستی بەتاڵ دەگەڕایەوە. بۆ ئەوەی جددیەت لەگەڵ تەنیایی‌یەکەدا ڕابهێنێ. وەك (کیرگ‌گارد) دەسگیرانەکەی خۆی دوا دەخست‌و تا وازی

لێهێناو چاوپۆشی ی لەژن و مێردایەتی کرد . بەڵام لەوکاتە دەردی بێدەرمانی سیل وەدەرکەوت و ئەم نەخۆشی یە تا سەرەمەرگ ئەشکەنجەی تەنیایی بۆنایەوە . ئەو نموونەیەش بەسە بۆ ئەوەی چاکی و خراپی ئەومان بۆ دەربخات . گومانی تیا نی یە کە کافکا ژینی خۆی لەژێر ترسی فەرمانڕەوایی باوکە ستەمکارەکەی بەسەر بردووەو تا ئاخیری عومری نەیتوانیوە ئەم نێڵەتەکان پێ بدا . هەڕەشەی بابی بە هەموو دەمێ لەگوێی دەزر نگایەوە : «وەکی ماسی زگت دەدەڕم .» . بەڵام ئەم کابرایە هەرگیز دەستی لە کورە تاقانەکەی بەرز نەکردۆتەوە . کافکا دڵخۆش دەبوو بەوەی بتوانێ خێزانەکەی ڕێك بخات بەڵکو لەو بەندیخانەیەی باوکی ڕزگار بێ . ئەم ئارەزووەی ئازادی وەك سەراب لەبەردەمی دا خۆی دەنواند ، بەڵام هەمیشە دەخزایە نێو گێژەو کێشمەکێش لەگەڵ دەسگیرانەکەی و لێی دوور دەکەوتەوەو لێی نێزیك دەبۆوە . تا دواجار چارەنووسی غەمبارانەی کەسێکی هەڵبژارد . کەتەنیایی بۆ خۆی هەڵبژادبێ ، نەك لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی ڕێ نەدەکەوت ، بەڵکو لەبەر ئەوەی ژیانی بەهیچ دادەنا .

ئەو نامەیەی کە کافکا بۆ باوکی نووسیووەو (ماکس برۆد) چەند بەشێکی لێ بڵاوکردۆتەوە ، تا ئەندازەیەك بنچینەی کێشمەکێشی ئەو لەگەڵ باوکی دا ڕوون دەکاتەوەو هۆی گەڕانی بە دوای نەریتی باوکە جوولەکەکەی ئاشکرا دەکات

باوکی سوور بووە لەسەر ئەوەی کە وەحدانیەت(یەکانە) ڕووخساری ڕاستەقینەی جوولەکایەتی یە (یەهوودیەتە) . ئەم بانگەوازە کۆمەڵی مەسەلە دێنێتە ئاراوە .

بڕواهێنان و پێشوازی کردنی ئەو مەسەلانەش بە لای کافکاوە نا پەسەند بووە . ماڵی باوکی بە ڕای کورەکەی جێی گومان بووو خۆی لەژێر کۆمەڵێ کۆت و بەندا دەدیتەوە . (کیرك گارد) گوتویەتی : «من زۆر قەرزار باری ئەو کەسەم منی هێناوەتە وجود .» ، کافکایش لەم ڕووەوە خۆی نەبەرامبەر باوکی بە بەدکار دەزانێ . لە نامەیەکدا ، کە بۆ باوکی نووسیووە ئەوە دێنێتەوە یاد : «ئەوەی نووسیم پەیوەندی بەتۆوە هەیە ، ئەو گلەییانەن . کە نەمدەتوانی لەلات وەدەریانخەم ، دڵپری خۆم وا بە نووسینەکانم دەرکرد .» ، پاشان درێژەی پێ دەدا :

«ئەو شوێنەی تێیدا دەژیم ، تووشی دوودڵی و ڕاڕایی کردووم و بەجارێ تێکی هاڕیوم . هەرچەندە ناچار بووم بچمە شوێنێکی دیکەوە ، بەڵام هەوڵێکی بێ سوود بوو ، چونکە هیچم بە دەستەوە نەماوە .» ، دەربارەی بیرو ڕای باوکیشی نووسیویەتی :

«هەتا لە گەنجیەتیشدا ، تێناگەم تۆ بۆچی سەرزەنشتی منت دەکرد ، کە دەبێ سەر بۆ ئەو یەهیوودیەتی یە پووچە دابنەوێنم کە تۆ پێیەوە بەند بوویت . (دەتووت بۆ خواپەرستی یە) ، ئەوەندەی من لێی تێگەیشتبم ئەم یەهیوودیەتە لەڕاستی دا شتێکی ناچیزو گاڵتەیەو لەگاڵتەش بێنرخترە .» ماکس لەژێر سەری دەخوێنێ و دەیەوێ دووبارە ڕێنوێنی بکاتەوە بۆ ئەوەی باوەری بە یەهیوودیەت هەبێ ، بەڵام هیچ سوودی نابێ . کافکا بە هاورێکەی دەڵێ : «من چیم بەجوولەکان دەچێت ؟» . لە ئەنجوومەنی ئاهەنگی ئایینی جوولەکان دێنە دەرەوە کافکا بە توانجەوە دەڵێ :

«ئەگەر ڕاستیت دەوێ وەك ئەوە وا بوو لەنێو ڕەشە کێوی یە ئەفریقی یەکاندا بووبین . ئەو شتە پڕوپووچە بێنرخانە چی بوون !» ...

لە یادداشتی شەخسی خۆیدا نووسیویەتی : «نەك تەنها کەسانی وەك کیرك گارد نەیانتوانی دەستی ماندووی مەسیحیەت ئاشنای ژیانم بکەن ، بەڵکو پەیرەویکەرانی سەهیۆنیەتیش چ لە بەراییداو چ لەدوایێدا نەیانتوانی ئارەزووی ئیسرائیل لە مێشکمدا بچەسپێنن .»

هەر وەك کافکا خۆی وەدەری خستووە زیاتر بیرکردنەوەی لە (کیرك گارد)ەوە نزیکتر بووە ، کەچی جیاوازی یەکی زۆر لەنێوان کیرك گاردو کافکادا بەرچاو دەکەوێ . بۆ نموونە ، ئەگەرچی خودای کیرك گارد دڵڕەقە بەڵام لە هەمان کاتدا میهرەبان و بەخشندەیە ، کەچی خودای کافکا هەر وەك لە نووسینەکانیدا بەرچاو دەکەوێ ، ترسناك و هەڕەشەکەرە ، لەسەر یاسا دەڕواو بەکاری ئاگادار کردنەوەو سزادان و بەخشندەیی هەڵدەستێ . هەتا (یهوذا)ی تەوراتیش بەم شێوەیە نی یە ، هەر چەندە دڵڕەقیشەو ڕق و کینەی هەیە ، بەڵام جاری وا هەیە سەد گوناهبار بۆ خاتری یەکێ دەبەخشێ ...

* * *

دوو شت کافکایان لەشوێن خۆی دەرکردووە : یەکیان ئەوەیە ، کە ئەگەرچی خوێنی جوولەکەی بووە ، بەڵام لە کۆمەڵگای جوولەکان ڕایکردووەو ئەوەی تریان ئەوەیە ، کە نەخۆش بووەو جودایەکە بۆتە دووقات بۆی ....

کافکا لە تاقیکردنەوە دەروونی یەکانی خۆیدا گەیشتە ئەوەی : کە بێ بەشە ، شتێکی کەمە ، لەگەڵ خەڵك ڕێك ناکەوێ ، حەقیقەتی لەبەر چاو وونە ، دوولایەنی (الازدواجیة) لە گۆڕێیە ، مرۆڤ دەگەڵ خۆیدا بێگانەیە ، لەنێوان بنیادەم و جیهانی بەهەشتدا گێژاوی بۆ دروست دەبێ ، هەموو شتێ کۆسپێکی دێتەڕێ ، مەبەستی کافکا چی یە ؟ دنیایەکی دی؟ نەخێر ، ئەو هەر ئەو دنیایەی دەوێ . حەقیقەتێکی تازەی گەرەك نی یە ،

ئەوەی لە دەوروبەری خۆی دەیبینێ حەقیقەت نی یە . کافکا هەوڵ دەدا لە کەناری ژین بوەستیٌو هەموو شتێ ببینێ : سستی ، ناخۆشی ، تەنهایی و توانای باوکە خوێندەوارەکەی ، کە دەیەوێ کورەکەی خوورەوشتی بازرگانانەی هەبێ . لەچیرۆکی (لانە)داکاتێ مەترسی دوژمنی نامەرد نزیك دەبێتەوە ، گیانەوەر بیر دەکاتەوە : « .. من وەك منداڵەکان بیرم نەدەکردەوە ، کە نەختێکیش بە ساڵدا چووم بە یاری منداڵانەکانی خۆم بەسەر دەبردو ترسی یاری یەکانم هەبوون . هەرچەندە دڵم خەبەری ئەو مەترسی یانی ی دەدا ، بەڵام گوێم پێنەدەدان»

ڕەنگە مەسەلەکە ترس بێ لەبەر دەم لێپرسراوی یەکانی ژیان . ئەو هەستی کردووە ، کە ژیانی دەم دەمی یە ، شتێ دەستی پێ نەکردووە تا بەرەو کۆتایی بڕوات . هەر چەندە نووسەر بەدەست کورتی ژیاوە . بەڵام ، ئەوە لەبەر دەمی دا نەبووە بە کۆسپ ، خەڵکی هەموو خۆشیان ویستووە ، بەتایبەتی ، بلاوکەرەوەی کتێبەکانی . کە (ماکس برۆد)یش نامەکانی کافکای خستەڕوو ، کافکا پاداشتی ئەدەبی پێوەرگرت ، جا بۆیە دەبێ کۆسپێکی دی هاتبێتە ڕێ کە وای لێکردبێ ناکامی بە توندی دەستی لە یەخەی گیرکردبێ ، چونکە نووسیویەتی : «نەك هەر تەنها بە هۆی باری کۆمەلایەتی ، بەڵکو شێوەی هەڵکەوتنی سروشتی ی خۆم وا هەڵکەوتووە مرۆڤێکی کەم دوو ، ووردبین و کەم تێکەڵاوی خەڵك بم و ناکام بێمە دنیاوە . ناتوانم ئەمەش بە بەدبەختی بزانم چونکە ترووسکەیەکی ئەو مەبەستەیە کە خۆم گەرەکمە .» .

کافکا هەر لە منداڵی یەوە هەستی بە جوادبی و ناسازگاری و جیاوازی خۆی لەگەڵ خەڵکدا کردوە : «کەس لە خوو ڕەوشتی تێنەدەگەیشت ئەم بارو دۆخەی تووشی مەحکومیەتی کردبوو ، هەتاوای هەست دەکرد بە دۆستەکانیشی ناچێ ی ئەوان هاو دەردی ئەونین . لە یاداشتەکانی دا نووسیویەتی : «ئەو خەڵکانەی دەدوێنم و چاویان دەدرەوشێتەوە ، باشە چ شتێك لە هەموان زیاتر تۆ بەوان دەبەستێتەوە ، بۆ نموونە تۆش وەك ئەوان دڵت هەیە ، ڕەنگە بۆ ئەوە بێ تا لەگەڵ ئەوان ڕێکبکەوی ؟ بەڵام تۆ لەگەڵ ئەوان ڕێك ناکەوی ، بۆیە وا ئەم پرسیارەش لەلای تۆ سەرهەڵدەدات .» ، کە تەواو بیردەکاتەوە ئەمجار بەرەو خلوەتەکەی خۆی دەگەڕێتەوەو تەنیایی بۆ هەڵدەبژێرێتەوە .

سەیر نی یە ، کە هەر جارێ کێشمەکێش لەنیوان خۆمان و دنیای کافکادا بەرپا بێ هەست بە تاوانێکی گەورە بکەین . تاوان نەك گوناهـ ، چونکە کافکاو قارەمانەکانی خۆیان بە گوناهبار نازانن . کافکا بە هیچ شێوەیەك گوناهـ ناناسی و پەی دەرپەی چەندان پرسیاری غەمبارانەی جاویدانی مرۆڤ دەخاتە ڕوو : بۆ کوێ دەڕۆین ، لەژێر کارتێکردنی چ هۆیەکین . یاسا کامەیە ؟ بیری ئەو پەیوەستەی نێوان دوو تەوەری گۆشەگیری و یاسایە . بەڵام لەنێوان هەردووکیاندا دێت و دەچێ و خۆی بە هیچیانەوە نابەستێتەوە — گۆیا مرۆڤ گەمەی دەستی هێزێکە کە زۆربەی کات لە هەڵوشانەوەکەی چاو دەپۆشێ ، ئەویش بە هۆی ئەوەوەیە کە بچوکترین هەستی پشکنینی نی یە کە دەتوانێ لە کۆمەڵگا بە چاکی بدۆزرێتەوە . ئایا وا دەرناکەوێ کە نووسراوەکانی چالاکی یەکە بۆ لە ناوبردنی ناکامی یەکانی ژیان ؟ ئەو دنیایەی کافکا پێشانی داوە دنیایەکی ووردەو لە گۆشەکانی ڕووحی مرۆڤ دەکۆڵێتەوەو وەك مۆتەکە تێدەپەڕێ ، مرۆڤ کاتێ خۆی بەکاری پووچ و بێ مانا بەسەر دەباو تێ دەکۆشێ لەژێر باری ئەو گوناهانەی کە پشتی چەماندۆتەوە شانی خاڵی بکات و لەتەنیایی و نائومێدی بن بەست دەست و پێ دەکوتێ ، بێگومان ئەم جۆرە دنیایەش دنیای زۆر لەهاودەمانی ئێمەیەو هەر وەها ڕوون کردنەوەی ژیانی خۆیشیەتی .

کافکا بەرامبەر بەخۆی وەفادارە ، ئەوەی نووسیویەتی لەدەردو ئەشکەنجەی گیانی و مەعنەوی خۆی هەڵێنجاوەو بەشێوەیەکی گەشبینی و مەنتقی و شك و بێ بەزەییانە وەدەری خستوون و ترس و سام دەخاتە دڵی خوێنەرەوە .

قارەمانەکانی بەقەدەر ڕووخساری خۆیان ون و نایەوێ بیانشارێتەوەو بە پیتی یەکەمی ناوەکەی خۆیشیان دەیانخاتە ڕوو ، وەك : جۆزیف ك ... ناوی تەواوی نی یەو تەنها سێیەرێکی ئەوەو وادێتە بەر دیدە کە ك ... نەیادگاری هەیەو نە ئایندە ، بەشێکی گیانی ئەو ناوەیان قرتاندووەو هەڵیانگرتووە

ژنەکان ڕووخسارو ناوی دەسگیرانەکەی ئەویان هەڵگرتووەو دەوروبەرەکەی هەر هەمووی لە ڕۆمانەکانیدا بەرچاو دەکەون .

لەڕۆمانی (داوەری)و (کۆشك)دا خشڵەکانی ژیانی ڕۆژانەی کافکا دەدۆزرێتەوە . هەروەها ئارەزووی ئەو کارانەمان بۆ دەردەکەوێت کە کردوونی تا بتوانێت

دەسکەوتی ماددی و زەمەنی زیاتری دەسکەوێت ، بەڵام چۆن لەگەڵ دژواری یەکاندا ڕوو بە ڕوو بۆتەوە ، هەروەها دەزگا شروشەپڕیوو گاڵتە ئامێزەکانی دەوڵەتی وەدەرخستووە ، وەك پشت گوێ خستن و ڕۆیشتنی کار بەسستی و نارێکی و پیسی دەفتەرەکان و لەکۆڵ خۆکردنەوەو توانای سەرۆکی فەرمانگەکان ، هەر هەموو ئەمانە بە چاکی لەم کتێبانەیدا ڕەنگی

داوەتەوە .

ئەوانە چەند ڕاستی‌یەکن کافکا بە ئازارەوە هەستی پی‌کردوون‌و وەدەرێخستوون . بە خستنە ڕووی ئەم شتانە وا دەردەکەوێ . کە توانیویەتی خۆی ڕزگار بکات‌و لەژێر نیئەی خێزان‌و کۆمەڵگای جوولەکەو زەمین‌و نەژادی خۆیبێتەدەرەوە . بە دایکی دە گووت : «من هەمووتان بە بێگانە دەزانم .» بەڵام ئەوەندەی لەژیان مایەوە بۆ شتە لەدەست چووەکانی گوزەرانی کرد . «بە بێ نەوەکانی . بە بێ خاوخێزان‌و بە بێ ئەو شوێنەی لێی لە دایك بوو .» . دەیویست دووبارە ئەم شتانە بەدەست بێنێتەوە . تا بتوانێ وەك خەڵکی دی بژی . بەڵام ئارەزووەکانی نەهاتنە دی . تیژبینی‌و ووردبینی بیری ئەو بووە کۆسپێك لە ڕێگەی ئەوەی بتوانێ گرێی دەروونیی خۆی لای خەڵك بکاتەوە .

کافکا یەکەمین کەسە باسی نەگبەتی مرۆڤ لە دنیابەکی بێ‌خودا بکات . دنیایەکی پووچی وا . کە دوایەکەی کەس نی‌یە پشتگیریت لێ‌بکات . ئەگەر بەهێزی خۆت بتوانی چارەنووسی خۆت دەست نیشان بکەیت . چونکە شیرازەی گشت نەریتەباوەکان لەیەك‌پچراون‌و بۆ ئەوەی دووبارە بێنەوە ئاراوە . دەبێ بناغەکەیان بە پێی بنەماو بزوێنەری ترەوە دابرژرێنەوە . کافکا بۆ درێژە پێدانی تاقیکردنەوەکانی خۆی گۆشەگیری هەڵبژاردووەو ئیدی هەتاوی گەرەك نەبووە . لە یادداشتەکانی‌دا نووسیوویەتی : «زۆربەی کات دەبێ بە تەنی‌بم . ئەو بەختیاری‌یەی دەستم دەکەوێ لە دەوڵەتی تەنیایی‌یەوە دەستم دەکەوێ .» لە هەراو هۆریاو جەنجاڵی هەڵاتووە . چونکە بەمە دەکەوتە تێو ژیانەوە . لە ساڵی ١٩١٣دا نووسیوویەتی : «لەم ساڵانەی دوایی‌دا ڕۆژێ بیست قسەم لەگەڵ دایکم نەکردووە و لەگەڵ باوکیشم تەنها سڵاوم لێکردووە . لەگەڵ خوشکەکانم‌و زاواکانم بێ ئەوەی هیچیش لەنێوانماندا هەبێت هیچ قسەم لەگەڵ نەکردوون». دوای ئەوە هەتا نەیویستووە (دکتۆر برۆد)ی برادەریشی ببینێ‌و خۆی لێ‌شاردۆتەوەو لەگەڵ کەس قسەی نەکردووە . چونکە هەر بە ئەنقەست ویستوویەتی هەموویان بکاتە دوژمنی خۆی‌و هەموو هێزێکیشی لەپێناو مەبەستەکەی بەکار بەرێ : «من شێتانە پردەکان هەموو تێك دەشکێنم ! هەموویان لە خۆم دەکەمە دوژمن‌و لەگەڵ کەسیش قسە ناکەم .»

ئاکاری ئەو خۆراگری بووە لەبەر دەم نووسین‌و ئومێدەوە : «ئاسمان لاڵە ، ئاژاوە بۆ کەرەکان دەنێتەوە .»

ژیانی نەمری‌ی بە دەست کەس ناکەوێ . ژینی سەرزەمین (بیابانێکی مەعنەوی)یە ، کە لەوێ «لاشەی کاروانی ڕۆژانی ڕابردووو داهاتوو» بەسەر یەکدا کۆمەڵ دەکرێن : « دەبێ سەری پڕ لە کینەو بێزاری بەسەرسنگدا شۆڕ کەینەوەو ووریای خۆمان بین کەس بینە قاقامان نەگرێت .»

هەروا بەرستەیەك دنیای ڕابردووی خۆی ڕەت دەکاتەوەو دەڵێ : «من سەرکەوتووانە نەفی زەمانەم لەگەڵ خۆمدا گونجاند .» . لەم ڕووەوە کافکا تێکۆشاوە گیانی وتەکانی خۆی بە دەنگێکی تازەو ترسناکەوە دەربجات . بە دەنگێکی ئاوارە ، کە دەنگی دیارو لەبەر چاوی ئەمرۆکەمانە ...

* * *

هەروەها لایەنێکی دی هەیە سەرنج ڕادەکێشێ . ئەویش ئەوەیە . کە هەر سێ ڕۆمانی کافکا (داوەری)و (کۆشك) و (ئەمریکا)و زۆر لە چیرۆکەکانی بە ناتەواوی ماونەتەوە . ئەم دیاردەیەش هەڵبەتە بەهۆی تەمبەڵی‌و پشت گوێ‌خستن یان بە هۆی ناتوانایی نووسەرەکەوە نەبووە . پسپۆڕێکی دەروونناسی ئەم شتە وا شی‌دەکاتەوە ، کە بێ‌شك بەهۆی کاری سێکسی‌یەوە بووەو دەیبەستێتەوە بەوەی کە کافکا ئارەزووی ژن‌هێنانی هەبووەو نەیتوانیوە کار بکات : لەگشت نووسینەکانی‌دا بابەتی شکست‌و ناکامی پەروەردە کردووەو وەك پەیامبەرێك بە شێوەی جیا جیا بەرگری لێکردوون ، بەڵام کافکا ئەزموونەکانی خۆی درێژە پێدەدان‌و بەهۆی نووسینەکانیەوە ڕایدەگەیاندن . چونکە خۆی نووسیوویەتی : «لەبەر تەمبەڵی‌و نیازپیسی‌و بێ تاقەتی نی‌یە کە لەشتێکدا چ لە ژیانی خێزانداریەتی‌و چ لەژن‌هێنان‌و چ لەکارو ئەدەبیات‌دا ڕوو بەر ڕووی شکست‌و غەیری شکست دەبمەوە ، بەڵکو بەهۆی نەبوونی زەمین‌و هەواو یاساوەیە ، کاری منیش هێنانەکایەی ئەمانەیە ... ئەمانە بەکاری سەرەکی خۆم دەزانم .»

بەم شێوەیە دەردەکەوێ کە کافکا هەر لەسەر نەخشەکەی خۆی دەڕوا ، قارەمانەکانی وەکو خۆی لە دنیایەکی ناسازگاردا دەژین ، کە پڕە لەمەترسی‌و مۆتەکەو بارو دۆخی خۆیان لەم دنیا پووچە بە جیادەنوێنن‌و بە ئەنجامێکی ترسناك دەگەن ، کە بن‌بەستەو دەرباز بوونی تیا نی‌یە . خاڵێکی دیکە هەیە ئەویش ئەوەیە ، کە دەتوانرێ (داوەری)و (داوەشان) بەم چاوەشەوە سەیر بکرێن‌و ڕاڤە بکرێن ، کە بە هۆی هەست‌کردن بە ناخۆشی‌و دەردەکەی خۆی بێ دەرمان بینیوەو سەیری کردووە دەوروبەرەکەی لێ‌ی دوورکەوتوونەتەوە ، بۆیە نووسراون ، بەڵام ئەو بەرهەمانەی پێش ئەوەی تووشی نەخۆشی سیل بێت نووسیووە .

ماکس برۆد نەیزانیوە یاخو نەیگوتوە . کە کافکا نیشانەکانی ئەم نەخۆشی‌یەی لەخۆی هەست پی‌کردووە یان نا؟ ...

* * *

کافکا زۆر خێرا نووسیویەتی . هەندێ جار وەك دیستۆفسکی چیرۆکێکی لە شەوێکدا تەواوکردووە . لە نووسینەکانیدا زۆر سەرنج وورد بووەو ڕاستگۆیی‌یەکی تەواوی نیشان داوە . ئەو نووسیوویەتی . چونکە ویستویەتی پەیامێکی ڕاستەوخۆ بەدەستەوە بدات . نابێ بپرسن کافکا ویستویەتی چی بڵێ . ئەوەی گوتویەتی هەر ئەوەیە کەویستویەتی .

دنیای کافکا دنیای خەونەو بە مۆتەکەو ترسەکانی یەخەی مرۆڤ دەگرن . کەچی لەپڕ کە بەهۆش خۆمان دێینەوە ڕوو بە ڕووی هەراو پووچی‌و گاڵتەجاڕیی دنیا بێداریی خۆمان دەبینەوە . کە خوومان پێوەگرتووەو بە جددیات وەرمانگرتووەو هەتا هەنووکە بەناوەی حەقیقەت بۆیان کردووین بە قاڵب .

لەهونەردا تەنها ڕووخسار گرنگ نی‌یە . ڕووخسار بەبێ بیرێکی پایەدار ناتوانێ خۆی ڕاگرێ . کارەساتە ئاسایی‌یەکانی ژیان لەژێر نووکی قەڵەمی کافکادا بە شێوەیەکی درامی خۆیان نواندووە . بەسەرهاتەکانی ڕۆمانێك لە چیرۆکێکدا کورت دەکرێتەوە . ڕستەکانی بەهێزنو هەندێ جار ئاڵۆز . بەڵام سادەو ئاساییێ . کافکا لەژیانی ئاسایی‌و ڕاستی‌یەکانی ژیان هەڵاتووە . لەم ڕووەوە . خۆی حەقایق دێنێتە ئاراوە . نووسینی ئەو مۆتەکەیە هەر وەك خەون خۆی دەنوێنێ . هەروەك خۆی ئیشارەتی بۆ خەوزڕانی شەوێکی خۆی کردووەو دەڵێ : «ڕاستە من دەنووم . بەڵام لەگەڵ ئەو خەونانەی دەیانبینم لەبێنەو بەردەدا دام .» . خوێنەر دەچێتە دنیایەکەوە . کە لەنێوان خەوو بێداری‌دایە . وەلێ هێشتا بە ئاگایەو خۆی دەناسێتەوە . — ئەم دنیایەش بە پووچو خەیاڵاوی‌و گومان لێکراو نایێتە بەرچاو بەڵکو حەقیقەتێکی بە سۆیە . ڕووخسارەکان تێکەڵ بەك دەبن بەڵام پەراگەندە نابن .

گەردوونو زەمانە لەشوێنی خۆیانن . بەڵام مەنتقی‌کەسەکانو تووش بوونیان بەیەکتر جۆرە مەنتێقێك‌و تووش بوونێکە تەنها لەجیهانی خەونێدا ڕوو دەدات . کافکا بێ ئەوەی بابەتی غەمبارانە یاداواکاری بێ سەرو بن بخاتەڕوو بەری دڵ دەگرێ . هونەرەکەی حەقیقەت دەخاتە لاوە . واتا زیادە ڕەوی لە واقیع بینی دەکاو بەشێوەیەك مەحکومیان دەکات کە لە هونەرەکەی ئەودا ڕادەیەك بۆ جددیات‌و گاڵتە دانەندراوە ...

* *

وەرگێڕانی بەرهەمەکانی کافکا کارێکی ئاسان نی‌یە . بەهۆی زمانەکەیەوە . کە هەرچەندە دیاریکراویشە (محدود) بەڵام لەبەر ئەوەی لەسەر ڕێو شوێنی تەواوی کلاسیکی‌یەو ئاواز و کێش‌و ئاڵۆزی‌و گشت ڕێگەکانی دی **کلاسیکیەتی** ڕەچاوکردووە . بۆیە پێویستی بە خۆماندووکردن هەیە . لە نووسینەکانی کافکادا هەموو شتێ پەیوەندی‌یەکی مەنی بە ژیانەوە هەیە . قارەمانەکانی یاواچاکترە **بڵێین** شتەکانی غەیری قارەمانەکانی . هەموو سەرشۆڕو ستەمدیدەن . بێ فیزیی کافکا وەك بێ فیزیی (مقدس)ەکانی مەسیحە . بەڵام بەپێچەوانەی ئەوان : مەبەستی ئەو لە بێ‌فیزیی داماوی‌و **تێکشکاوی‌**نی‌یە بەرامبەر بەخوا . بەڵکو بە پێچەوانەوە بەهۆی (نەفی) مرۆڤ ئێستا ڕوو بە ڕووی ڕق لێ‌بوونەرەی خودا **دەکاتەوەو** ئادەمیزاد هیچو **ناچیز** دەکات . ئەو **قارەمانانەی** لە دنیای ئاژەڵانەوە وەریدەگرێ ناکرێ لەوە زیاتر بچوکترو نزمتریان بکاتەوەو بەم ڕێگەیە دەیەوێ بڵێ . کە ئادەمیزادی ئێستا هیچ نی‌یە . قارەمانە مرۆڤەکانیشی بۆنموونە . کارل ڕۆسمان لە ڕۆمانی (ئەمریکا)دا نموونەی مرۆڤی بێ‌فیزە . لە ڕۆمانی (داوەری)دا جۆزێف ك ... بەند دەکرێ‌و لەڕۆمانی (کۆشك)دا ك ... ی‌گەڕیدە وەك ئەوە وایە (کلی لە چاواندا دزی بێ) . هەموو یەك جۆرە سێبەرن . بەڵام چونکە سیماو ئەندامو کێشیان نازانین . بۆیە سوودێکی ئەوتۆیان نی‌یە . بەڵام دەزانین چەند سێبەرێکن‌و مەبەستێکیان هەیەو ئیرادەیان لە بەهێز بوون دایەو جێی خۆیان دەگرت‌و هەڵدەسەنگێندرێن‌و ئەنجامێك بەدەستەوە دەدەن . هەتا نیشانەی بەرایی ناوەکەشیان زیادەیە . چونکە لەو هەرێمە تەوەریانە (قطبی)دا «زۆرمان بە قەڵەم‌ڕەساسێك کە لەسەر ئاوەوە چەسپیوین‌و گومان دەکەین . کەشتێکمان دەسگیر دەبێ . کەچی لەکاتێکدا کە نقووم دەبین خەونی ڕزگابوون دەبینین .»

چۆنە هێشتا ناوێك بۆ خۆمان دابنێین؟ لەم شوێنانەدا هەموو شتێك پاك دەبێتەوە . نووزەی لێ‌دەبڕێ . ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ‌و پەیوەست دەبێت بەتیشکێکی خزەوە . وەك بڵێ‌ی : «مرۆڤ لە ناو ئاو سێبەری خۆی بخاتە ژێر پێیەوە .»

هیچ شتێك بوونی نی‌یە . پیتی یەکەمی (ك) یش نیشانەی **نەوبەری** بێ‌فیزی‌و لەخۆبایی نەبوونە . ئیرادەی ڕوو خێنەری کافکا ناتوانرێ لەبەرچاو نەگیرێ . هەموو جارێ کە چاومان بەو دوو نامەیە دەکەوێ . کە تیایاندا وەسیەتی کردووە گشت بەرهەمەکانی بێ ئەوەی بخوێنرێتەوە ئاگریان تێ‌بەردرێ . ئەوەمان بۆ دەردەخات . کە ئارەزووی ئەوەی کردووە بە تەواوی شەخسیەتی خۆی لەناوببات . باوەری قایمی بە نەفی‌و پووچی هەموو شتێ هەبووە . بەچاوی هیچو پووچو سووکی لەبەرهەمەکانی

خوێشی ڕوانیوه . نه‌یویستووه وه‌ك سوفی‌یه‌كانی به‌شادی‌و به ختیاری‌یه‌وه قوڵ‌و باسكی خۆی بكاته‌وه‌و بڵێ :
«دوای‌ئه‌وه‌ی ون بووم وه‌ك ئه‌سپێكی به‌غار به هه‌شتاوی به‌ره‌و نه‌بوون راده‌كه‌م» . نه‌خێر . به‌ڵكو ئاره‌زووی شه‌وی نه‌مری كردووه‌و بێئه‌وه‌ی شوێن‌پێ‌ی ڕێبواری خۆی به‌جێ بهێڵێ كه له‌سه‌ر چه‌ویش شتێكی نووسیووه حه‌زی كردووه زوو بیسرێته‌وه . چونكێ گچكه‌ترین ڕۆژنه‌ی ئومێدی به دنیای دوای مه‌رگ نه‌بووه ....

* * * * *

له (وڵگه‌ی سزادا - في مستوطنة العقاب)دا . كه یه‌كێكه له چیرۆكه دڵگیره‌كانی كافكا . تا راده‌یه‌ك له به‌رهه‌مه‌كانی ئێدگار ئالان‌پۆ E. A. Poe ده‌چێت . به‌ڵام له‌ڕووی ناوه‌رۆك‌و دركه (كنایة)وه كه هێناویه‌تیه‌وه جیاوازه . له‌م چیرۆكه‌یدا (دادگا)له شێوه‌ی ئامێرێكی خۆكاری ئه‌هریمه‌نی خۆی نواندووه . كه به پێی قسه‌كانی فه‌رمانده مردووه‌كه ئازاری له‌شی گیراوه‌كه ده‌دا . له‌به‌رامبه‌ر ئه‌و ئه‌شكه‌نجه بێ ئه‌نجامه‌ی به به‌ندكراوه‌كه‌ی ده‌ده‌ن . ئه‌مان ڕێگه‌ی به‌رگری‌یان بۆ خۆیان هه‌ڵبژاردووه و ئاگایشیان له تاوانی خۆیان نی‌یه‌و هه‌تا روون كردنه‌وه‌ش به زمانی بێگانه بۆ جیهانگه‌ری ته‌ماشاكه‌ر وه‌ده‌رده‌خه‌ن . ئه‌م ئامێره له داهێنانی فه‌رمانده‌ی پێشووده‌بێ . كه‌مردووه .

فه‌رمانده‌ی تازه له‌گه‌ڵ بیروڕایه‌كانی ئه‌و ڕێك ناكه‌وێ‌و په‌یره‌وه‌كانی درێژه پێ‌ده‌دات . لێره‌دا هه‌رچه‌نده ئه‌مه مه‌حكوومیه‌تێكی ته‌واوه‌و یاساو دادگا به شێوه‌یه‌كی میكانیكی هاتۆته ناوه‌وه به‌ڵام ئومێدێكی شاراوه به گۆرانی ڕژێم هه‌ر هه‌یه . له كاتێكدا ئه‌م چیرۆكه بڵاو بۆوه (١٩١٩) ڕه‌نگه هه‌ندێ به خه‌یاڵێكی پڕو پووچی په‌نگ خواردووی مێشكی نه‌خۆشێكیان دانابێ . به‌ڵام دوابی ئه‌م خه‌یاڵه پایه‌یه‌كی گرنگی تاقیكردنه‌وه‌ی له‌لایه‌ن كۆمه‌ڵێ كه‌سانه‌وه گرته‌خۆو پێشبینی‌یه‌كی ته‌واوی ناكه‌سانه‌و خوێنخوارانه‌ی دنیای ئێمه‌ی گرته‌وه . چونكه ئه‌و ڕژێمه‌ی له‌سه‌ره‌وه رازوه‌ته‌وه و ئارایشت كراوه‌و به‌ناو پشتیوانی له یاساده‌كا . بووه رووخساری ڕۆژانه‌ی زۆر له به‌ندكراوه‌كان . ئه‌و بابه‌ته‌ی كه كافكا باسی لێوه كردبوو (جودابی . جیابوونه‌وه) بووه بابه‌تێكی ڕۆژانه . له‌م چیرۆكه‌ی كافكا . ئه‌و ئه‌فسه‌ره‌ی كه كاری خوێن ڕێژی له ئه‌ستۆ گرتووه . كه ئامێره‌كه له كار ده‌كه‌وێت به‌شێوه‌یه‌كی سه‌یرو به ئومێده‌وه گیانی خۆی به‌مه‌رگ ده‌سپێری‌و خۆی ده‌كوژێ . به‌ڵام ئه‌مه به‌ڵگه‌ی ئه‌وه نی‌یه كه ڕژێكی چاكتر دێته جێگه‌ی . چونكه ترس ده‌خاته ژێر پێ‌یه‌وه‌و پێشبینی‌یه‌كی ترسناكی نوێ ده‌دا . ئه‌ویش زیندووبوونه‌وه‌ی ئه‌فسه‌ری رابردووه .

هێربێرت تۆبه‌ر H. Tauber بۆ ئه‌وه چووه . كه داهێنه‌ری ئامێره‌كه . واتا فه‌رمانده ی پێشوو له هه‌مان‌كات‌دا سه‌ربازو دادپرس‌و ئه‌ندازیارو كیمیاگه‌ر بووه . ئیدیه‌می (توانای ڕه‌ها – الطاقة المطلقة) ی ڕه‌ت‌كردۆته‌وه گیرار بۆدین G. Bodenله‌و باوه‌ڕه‌دایه . كه هیچ بیركردنه‌وه‌یه‌كی نوێ یان ڕێگه‌یه‌كی تازه نی‌یه له خستنه ڕووی سته‌می فه‌رمانده‌ی پێشوو (كه‌ناوی نه‌هێزاوه)و له رووخساری ئه‌فسه‌ره‌كه‌ش نیشانه‌ی (دڵسۆزی په‌یمان) به‌رچاو ناكه‌وێت . به‌ڵكو دركه‌یه‌كه بۆ ئه‌وه‌ی . كه یاسا سه‌خته‌كانی سه‌رده‌مه كۆنه‌كان ته‌ورات ڕژێمی تازه‌شی چوواندووه به سه‌رده‌می ئێستا (ئینجیل) . ئه‌م جۆره ده‌سته‌واژانه له لێكدانه‌وه شیكردنه‌وه‌ی به‌رهه‌می ئه‌ده‌بی ده‌گونجێ هه‌بێت . به‌ڵام به‌هیچ شێوه‌یه‌ك ناتوانرێ به بڕیاری یه‌كجاره‌كی بژمێردرێن .

هه‌رچه‌نده په‌یامی كافكا نائومێدانه‌و بن‌به‌سته‌و تیایدا گشت هه‌وڵ‌و كۆششێك سه‌ری له‌به‌رده‌داو نه‌بوون (عدم) له‌هه‌موو لایه‌كه‌وه هه‌ڕه‌شه ده‌كات‌و په‌ناگه‌یه‌ك نی‌یه‌و ئاكام هه‌ر ده‌چێته‌وه سه‌ر (پووچ)ی‌و شوێنێ نادۆزرێته‌وه . كه تیایدا پشوو ته‌نگ نه‌بێ . به‌ڵام كافكا ئه‌م دنیایه قبوڵ ناكات . له دنیایه‌ك كه هه‌موو شتێ یه‌كسان بێت دنیایه‌كی ئه‌هریمه‌نی‌یه‌و هه‌ر جارێ ده‌وروبه‌ره‌كه‌ی به‌م شێوه‌یه ده‌بینێ ماناى وانی‌یه ئیتر ... ده‌بێ گیانی به به‌لا بسپێری‌و خه‌می لێ‌بخوات . به پێچه‌وانه‌وه كافكا ڕقێكی زۆر به‌رامبه‌ر پله‌و پایه‌ی سته‌مكاران به‌رپا ده‌كات . ئه‌و دیو نووسینه سه‌یره‌كانی‌یه‌وه بانگێشه‌كانیان ده‌داته ده‌م بای گاڵته‌جاری‌و ئه‌و یاساو دادگاو ده‌زگا ئه‌شكه‌نجه‌بی به‌زه‌خیانه‌یانه حكووم ده‌كات‌و تواناییان له‌نێو ده‌بات‌و به مردوویان له قه‌ڵه‌م ده‌دات . له‌م دنیایه له‌لای ئه‌و یه كه لكی ژیان نایه‌ت و قرقه‌پ كه‌ره بۆیه به‌دوای (زه‌مین‌و هه‌واو یاسا) یه‌كدا ده‌گه‌ڕێ تا تیادا ژیانێكی ئابڕوومه‌ندانه به‌سه‌ر به‌رێت .

كافكا له‌و باوه‌ڕه‌دایه . كه له‌م دنیای درۆو ته‌زویرو گاڵته‌جاری‌یه ده‌بێ تێك بدرێ‌و له‌سه‌ر رووی وێرانه‌كه‌ی دنیایه‌كی چاكتر دورست بكرێ . ئه‌گه‌ر دنیای كافكا به‌خه‌ی پوچی گرتووه ئه‌وه ناگه‌یه‌نێ . كه ده‌بێ باوه‌شی بۆبكرێته‌وه . به‌ڵكو شوومه . هه‌ست ده‌كرێ . كه كافكا وه‌ڵامێكی هه‌یه . به‌ڵام ئه‌م‌وه لامه‌ی نه‌داوه‌ته‌وه

* * * *

١٩٦٣



# كۆمـەلـە چیرۆكەكی فۆلكلۆری

- غازی حەسەن -
ژ پیتێن سلاڤی كۆستیە



## ● پادشاو گوندی ●

رۆژەكە بەهاری‌یە خوەش بوو . پادشا وەزیرو وەكیلێد خوەڤا سیپاری دچوونە سەیرانگێ .

پادشێ دیت ، وەكی گونـدەكیـدا رەخ جەوەكـە ئاڤێ كالۆمێرەك دارەكە گوزێ دنكینە . وەختا پادشێ ئەڤا یەكادیت ، نێزیكی كالێ بوو ، سەلام دایێ‌و ژێ پرسی :

- كالێ زەمانی ، چ ل تە قەومی‌یە ، تو ڤی جەفایی دبینی گەلۆ تو زانی ، وەكی دارا گوزێ دەرنـگ بەردده ، هەتـا وی چاخی توێ عمر بكی ؟

- پادشێ دەلال - كالێ گۆتێ - باڤێ تەیی رەعمەتی ، وەكی تەرا خەزنەو دەفینە نەهیشتا ، گەلۆ تەیێ بكاربوویا پادشاتی بكرا ؟ كال - باڤێ مە گەلەك دارێ هانكاندنە ، مە بەرێ وان خوەری‌یە ، ئەمێ ژی بنكینن ، بدا نەڤی - نەڤیچركێد مە بەرێ وان بخوون ئاها ئەڤە نێتە من .

كێفا پادشێ كالێ‌و خەبەر دانا ویرا هات . ئەوی عمری سەر وەزیـرێ خوەكـر ، وەكی دەهـ زێرا بدەكالێ . كالێ زێر

هلدان ، ڤەگەرىيا سەر دارا خوەو ژێرا ها گۆت :

ـ ئەز گەلەکی ژ تە رازیمە ، دارا منە دەلال ، برا بەریٚ تە تمیٚ زەعفبە ، دومکا تە درێژ بە ...

ڤرا پادشا عجێبمایی ما : گەلۆ چرا کالیٚ ئوسا رازیبوونا خوەدا داریٚ ، لیٚ نەگو وی .

پادشا ڤەگەرىيا سەر کالیٚو گوتیٚ :

ـ کالا ، تەچما ئوسا دارێرا گۆت ؟

کالا جابیٚ پادشیٚ دا :

پادشایی ساغبە تەبەر چەعڤیٚ خوە دیت ، وەکی ڤیٚ داریٚ هەما ڤیٚ سەهەتیٚ بەردا من .

وەختا پادشیٚ ئەڤ گلیٚ کالیٚ بهیستن ، وەزیریٚ خوەرا گۆت :

وەکی دەهـ زێریٚ دنیٚ ژی بدەنە کالیٚ .

کالیٚ ئەڤا زێریٚ خوە ژی هلدان ، بەر پادشیٚ تەمەنە بووو گۆت :

ـ ئاها من ب تەمامی هەقیٚ دارا خوە ژ دارا خوە ستاند ، بدا دوا خوەدیٚ ل دارا منبە . هەر دارەك ناڤا سالێدا جارەکیٚ بەر دوە ، لیٚ دارا من رۆژەکێدا دوو جارا بەردا .

## ● گوندیٚ ئاقلبەند ●

رۆژەکە سایی بوو

پادشا وەزیرو وەکیلێد خوەڤا دچوونە نێچیریٚ . پادشیٚ رێڤا گۆتە وەزیریٚ خوە :

ـ وەزیر ، دکاری بێژی ،ئێرۆ بارانیٚ ببارە ، یانیٚ نا ؟

پادشـایی ساغبە ـ وەزیر گۆتیٚ ـ چقاس ئەز زانم ئێرۆ باران نابارە .

ئەوانا ب خەبەر دان رێدا دچوون .

وی چاڤ وانــا دیت ، وەکی گونــدیکی کەسیب کەریٚ سێیارە ، وێداتە . ئەوی گەلەکی لەز بوو . وەختا گوندی نێزیکی وان بوو ، پادشیٚ ژیٚ پرسی :

ـ تو ژ کوتێیی ، تویٚ کودا هەری ، چما ئوسا لەزی دبەك کو قازاخا دایە پەی تە ؟

ـ پادشایی ساغبە ـ گوندی گۆتیٚ ـ ئەز بۆنا ویٚ پەکیٚ دلەزینم ، وەکی نها بارانەکە ئوسایی ببارە ، لێییٚ رابە . ئەز دلەزینم ، وەکی چۆلیٚ نەمینم .

پادشیٚ گوهـ نەدا سەر گۆتنا وی .

وەختیٚ ئەوانـا چون گهیشتنە جییٚ نێچیریٚ ، بارانەکە ئوسا باری ئەوانا ئوسا حال بوون ، وەکی نکار بوون بن خوەدا بچونا.

وانانێچیر نەگر ، ڤلك و ڤالا سەر مالیٚ خوەدا ڤەگەریان .

وەختا پادشا ، وەزیرو وەکیلیٚ خوە گهیشتنە مال پادشیٚ شاندا پەی وی گوندییی وەکی وی بکە رەملداریٚ خوە چاخا گوندی ئانینــە دیــوانیٚو پادشیٚ گۆتــە وی ، کو ئەو ئێرۆدا رەملداریٚ پادشیٚیە گوندی معدیٚ خوە کرو گەلەکی بەر خوە کەت .

پادشیٚ ئەو یەك تەغمینکرو گۆتە گوندی :

ـ تو گەرەکە شابی ، وەکی ژعمریٚ خوەیی کە سیبتییٚ خلاز دبی لیٚ چاوا تیٚ کفشکیٚ ئەو ڤولخ نە ب دلیٚ تەیە بێژە چیە معنی ؟

ـ پادشای ساغبە ، دیوانا تەدا باران نابارە وتمیٚ نینە وەکی باو باران تە دخە . لیٚ باو باران تمیٚ ل گوندیيا دخە . ئەز دها گەلەکی کێری وانا تێم و دخوەزم ڤەگەرمە جەم وانا .

## ● ڤێلبازىيا پێچەرموکیٚ ●

وەختەکی تەرمول و تەیرمدە دوژمنیٚ هەڤ بوون .

رۆژەکیٚ ئۆرتا واندا شەر پێشدا تیٚ . پێچەرموك ، وەکی هم نۆلا تەرمولانەو هم ژی نۆلا تەیرمدانە ، تەڤی شێر نەبوو ، خوەدا ئالیکی ل شەریٚ وان مێزە کر .

ئەو دلیٚ خوەدا ژی ها فکری :

«ئەزیٚ تاییٚ مەزینێییٚ گران بنهێرم کیٚ کو ئالتکە ، پشتا وان بگرم» .

وەختا ئەو پیٚ هەسیيا کو تەیرمیٚ ئالتکن ، چووجەم وان گۆت :

ـ ئەز تەیرە دمە ، وەختا قەزیيا بیٚ پێشیيا ، یانیٚ ژی دژمنەك هجومی سەر وە بکە ، ئەزیٚ بێمە پشتا وە

چەندمکی جوندا ، وەختا پێچەرموك دیسا پیٚ حەسیيا . کو ڤیٚ جاریٚ ژی تەرمولا زۆر دایــە تەیرمدا ، ئەو ژ گۆیرمدا

رەڤى، چوو جەم تەرەولا ، وانرا ها گۆت :
ـ ئەز تەرەولم ، جسنىٚ مشكامە ، ئەز هاتمە كۆمەكىٚ بدمە وە. ئەمىٚ تەڤايى پێشىيا تەيرەدا شەركن . ئەوانا قايىل بوون . شەر هەپێشدا دچوو .

ئاخرىێدا تەيرەدا ڤەواتا خوە تۆپكرىو ب سەرەك ڤانىيا تەيرىٚ خومىى سيمر نشكێڤا هجومى سەر تەرەولا كرن و ئەوانا جارەكێڤا ئالتكرن .

شەر خلاز بوو ، پەيمانا بارشبوونىٚ گرێدان پێچەرەموك جەم رەڤىٚ چوو ، كەتە شكەڤتىٚ ، جىىٚ تعرى ، بۆنا روچكىٚ تەيرەداو تەرەولا نەبينە . هەتا نها ژى ل ورا دژى .

## ● كەرو گا ●

جارەكىٚ كەرو گا پەى خەباتێرا دچوونە مالىٚ . نشكێڤا گورەك پێشيا وان دەردكەڤەو وانارا دڤێژە :
ـ گەلى پزماما ، چاوا دڤينم ، هونٚ گەلەكى وەستيانەو هم ژى برچينە ، وەرن ئەزىٚ وە بڤمە ناڤ مێشە ، ل ورا جيكى چێرەيى باش هەيە ، هون دكرن رند هێسابن و خومرا بچێرن .

كەر گێرا دڤێژە :ـ برى منى مەزن ، گور راست دبێژە ، وەرە ئەم هەرنـە وێـدەرىٚ ، كىٚ زانە ، دڤە ئەم هەرنە مالىٚ ، خومىٚ مە تشتەكى نەدە مە ، ئەمىٚ برچى بمينن .
گا قايل نەبووو گۆت :
ـ نا خوشكا من ، ئەز ژ گۆتنا گور باوار ناكم ئەمىٚ زيانا خوە ژ وى بڤينن ، كىٚ خێر ژ گورا ديتيە ، وەكى ئەم ژى لىٚ بڤينن ؟

پەى ڤىٚ يەكـێرا گا ئەو هشتن و بەر ب مالىٚ چوو ، لىٚ كەرىٚدا پەى گور ، چوو مێشە .

گەلە وەعدە دەرباز بوويە ، هەلا كەرىٚ بىٚئاقل ژ مێشە ڤەنەگەريايە .

## ● پارە ڤەكرن ●

رۆژەكىٚ گور ، رەڤىو شێر تەڤـايى چوونـە نێچيرىٚ . نێچيرا وان وىٚ رۆژىٚ پر بوو . ما ، وەكى وىٚ نێچيرىٚ وەكە هەڤـ پارە ڤەكەن .

رەڤى شێر را گۆت :
ـ پادشىٚ منى مەزن ، هورمەتا تەرا دەست نادە ، وەكى تو وى شوخولى بكى ، من ژى ناڤا فێلبازێدا گونەكار دكن . هەر تەنىٚ گور دكارە ئەڤىٚ نێچيرا مە وەكە هەڤ سەر مە پارەڤەكە .

شێر گۆتنا رەڤێرا قايل بوو .

گور دەست پىٚكر نێچير پارەڤەكر .

ئەوى گۆتە شێر :ـ خودى خودانىٚ من ، ئەڤا هەر دوو پارىٚ مەزن تەرا ، ئەڤان هەردوو ژى منرا ، دە ئەڤا پارا هانە بچوك ژى رەڤێرا .

شێر دلىٚ خوەدا پارە ڤەكرنا گوررا قايل نيبوو ، چمكى ئەوى پارا خوە قاسى ياوى هلدا .

وەختىٚ گور نێچير پارەڤەدكرو هاتنى خوە تونەبوو ، وى چاخى شێر نشكێڤا لەغەمەكى ئوسا سەرىٚ گور خست ، وەكى هەمـا دەستخـوەرا هەردوو چعڤىٚ وى هەڤـرا دركـەتن شێر ڤەگەرىيا سەر رەڤىو گۆت :ـ پزمامىٚ منى دەلال . ئيجار ژى تو وەرە نێچيرىٚ پارەڤەكە .

رەڤى ب فێلبازى پێشدا هات و گۆت :
ـ سەر چعڤىٚ من ، پادشىٚ منى مەزن ، ئەز بۆنـا هورمەتا تە سەرىٚ خوە ددم ، تشت ناكە ، ئيجار ژى ئەزىٚ جەڤىٚ بكشينم ، نێچيرىٚ بارەڤەكم .

ئەڤ هەردوو بارێدهانا ـ تعشتىيا تە ، هەردىٚ هانا ژى بۆنـا فراڤينـا تە ، ئەڤا ژى شيڤا تە ، لىٚ هەردوىٚ هانا ژى ژ ئالىٚ مندا تەرا پێشكێش .

شێر بن لێڤادا كەنياو گۆت :
ـ رەڤيێ فێلباز ، بێژە ، چكا كىٚ تو ئوسا هينكرى ، وەكى تو نێچيرىٚ ئوسا رند پارەڤەدكى ؟

رەڤى جاب دا گۆت :
ـ چعڤىٚ گور .

## ● دەولەتىو كەسيب ●

گوندیکی کەسیب دخوەست دوّرا خوەلیا بەر دەریّ خوە چەنەرکە .
وەختا ئەو پەی خەباتێرا وەستیایی دهاتە مال ، دەست ویّ خەباتیّ دکر . ئەوی پێشییّ چەل دکوّلان ، وەکی ستونا بنکینە .
جارەکیّ ، وەختا ئەوی چەل دکوّلان ، مەرڤەکی دەولەتی هات ل ویدەریدا دەرباز بوو .
ئەو نیزیکی کەسیب بوو گوّتیّ :
ـ تو چ دکی ، ئەو چ چەلن دکوّلی ؟
گونـدی سەریّ خوە بەر خوە دەرنەخست ، خودانا عنیا خوە تەمزکرو بفەن ویرا گوّت :
ـ تشتەکی ناکم ، ماقولیّ مّن . مالاڤاییّ کالکیّ من بوتە زێـریّ خوە دوّر بەریّ ڤیّ خوەلیـا مە چەلکریە . ئەم نها لیّ دگەرن . وەکی بڤینن .
وەختا دەولەتی ئەڤا بهیست چەڤیّ وی فرە بوون معدیّ وی بوّنا دیتنا وان زێرا ئوسا ڤەبوو ، تەییّ بگوّتا وەکی سال و زەمان برچی مایە .
ئەوی تو تشت نەگوّت هنەکی سەکتی ، هیشت و چوو .
پەی چوییـنـا دەولەتـێرا گوندی ژی خەبات خوەیە ویّ روّژیّ خلاز کر .
ئەو چوو مال و پێرا ـ پێرا دەست پێکر ستوون هازر کرن .
وەختا ژنیّ ئەڤا یەکا دیت عجێبمایی ژ مێریّ خوە پرسی :
ـ مالاڤا ، تە هیّ چەل تەمام نەکوّلانە ، تو ستوونا هازر دکی ؟
مێر جابا ژنیّ ها دا :
ـ ژنك ، قەت فکارا نەکە ، حەتا سبیّ چەلیّ بێنە کوّلانیّ .
خیلەك دەرباز بوو ، تەعری کەتە عردیّ ، دەولەتی بەر فەنا خوە بوو . ئەوی ژن ، زارو خولامیّ خوە هلدان ، هات نەمامیا شەڤیّ دەست پێکر دوّر بەریّ خوەلیا کەسیب ، عرد کوّلا ، بوّنا زێرا بڤینە .
ئەوی زێر نەدیّن ، بیّ گومان هیشت و چوو .
وەختا سبە زەلال بوو گوندی هات و دەست پیّ کر چەلیّ هازر کریـدا ستوون نکاندن . پاشیّ سەر کەڤرەکی رونشت ، سەر دەولەتیو بیّ ئاقلیا وی کەنییا .

## ● کێوریشکیّ ترسوّنەك ●

روّژەکیّ کێـوریشد بەرەڤی سەر هەڤ بوون ، شێورا خوەکرن . ناڤا واندا کێوریشکا مەزن خەبەردا و گوّت :
ـ ئەز گەلەك دەشت و زوّزان ، گەلیو نەوالا گەریامە ، چقاسی حەیوانەت و تەیرەدە هەنە ، تەڤا ناسی دکم ، لیّ ژ گشکا زعفتر جسنیّ مەنەوێرەکە ، ئەم ژ هەر تشتی دترسن . بوّنا ڤیّ یەکیّ ژیّ ئەوانا قرار کرن ، هەرن خوە باڤێژنە ئاڤیّ و جارەکێڤا خەزابن .
وەختا ئەوانا هەڤ گرتن و چوونە بەر دەڤیّ چێم ، کو خوە باڤیـژنە ئاڤیّ ، وانا دینا خوە دانیّ ، ویّ رەخ چێم برەك پەز مەغەل هاتیە . نشکێڤا کێوریشکەك بەزی ، پەزیّ مەغەلهاتی سەر ڤیّ یەکیّ سلکی و رەڤی .
وەختـا کێـوریشکا ئەڤا یەکا دیتن ، گەلەکی شابون و هەڤرا گوّتن :
ـ ئیدی ئەم چرا هەرن خوە باڤێژنە ئاڤیّ ، ژ مە ترسوّنەکتر ژی هەنە .
ئەوانا ئەو قاسی ژ ڤیّ یەکیّ کەنییان وەکی ژ وی کەنی لێڤیّ وانا قەلشین .
ئو دبێژن وەکی ژ ویّ روّژیّ حەتانها کێوریشکیّ کو دبن لێڤیّ وانا قەلشینە .

## ● نان و زێر ●

ئاباس گوندیکی کەسیب بوو .
تەمامیا روّژیّ ل دەشتیّ د خەبتی بوّنا نەفەریّ خوەرا کەری نان دەستخا . ئەو هەی دخەبتی و هەی ژی دفکری : «گـەلوّ هەبە ، وەکی نشکێڤا بە ختەك بیّ سەر من ، راستی خزنەکیّ بێم ، ژڤیّ تونە بونیّ خلاز بم ؟» .
روّژەکە هاڤینیّیە گەرم بوو .
ئاباسی دیسا ل دەشتیّ دخەبتی . ئەو گەلەکی وەستیّیا .

بۆنا قاسەکی هێسابە . هات بن سیا دارەکێدا روونشت و نشکێڤا خەورا چوو .
خەونێدا ئەو خوەرا دفکری‌و هادگۆت: «خودێ، گەلۆ وێ چ بە، وەکی تو بەختەکی ئوسا بدی من ، ئەز دەستێ خوە بدمە چ ، ئەو دەست خوەدا بڤە زێـر ، ئەز دەولەتیبم ، ژڤێ زەلولیێ خلازبم » .
-ەرێ ئاڤا وان متالادا ، دەنگەك ل وی تەسەلە بوو .
ئاباس نها خوەستنا تەیێ بێ سێری ، دە زوو بکە دەستێ خوە بدە سەر نشتەکی ، ئەوێ دەست خوەدا بڤە زێر .
ئاباس ژ گوهێ خوە باوار نەکر ، لێ خوەست بجێر بینە .
وەختا ئەوە، دەستێ خوەدا سەر کەڤرێ کێلەکا خوە ، ئەو کەڤر یێرا یێرا بوو زێر .
پاشێ ئەوی دەستی خوەدانی سەر کەڤرەکی دنێ ، ئەو ژی بوو زێـر . گونـدی گەلەکی شابووو نشکێڤا ئاقلەك هاتە سێری : «ئەزێ هەرمە باژێر ، ورا هەر تجتی بکمە زێر ، پاشێ ل ورا کۆچـك سەراکـێ چێکم ، کنجێ بەدەو ل خوەکم و ب ئاغاکیمی دەربازکم .
ئەوی خوەست وابە ، لێ دیت هێ وەستیایی‌و برچی‌یە .
وی چاخی کەتە بیرێ : «نە من ژ مالێ خوەرا هنە نان و پیڤـازەك ئانیـە ؟» وەختا وان دەستێ خوە برە تۆرپە ، نان و پیڤازێ ژێ دەرخە ، وی نان و پیڤاز دەستدا بوونە زێر .
ئابـاس ژ ڤێ یەکێ گەلەکی ترسیـا ، فکری وەکی وی ڤرهادا خورەکێ دەست ژی بڤە زێر ، ئەوێ چ بکە ؟
ئێ ، وەکی ئوسانە ، حەساب یەکە ، ئەوێ دیسا برچی بمینە .
وەختا ئاباس نشکێڤە حشیار بوو ، دۆرا خوە نهێری ، دیت ، کو هەر تشت دەرەوە ، ب خەونێ خاپیایە ، ئەو گەلەکا شا بوو .

## ● شێرێ چەف قۆل ●

جارەکێ شێر دەرکەتبوو نێچیرێ . نشکێڤا کێوریشکەك ل بەر وی رابوو ، ئەوی‌دا پەی وێ ، گاز کرو گۆتێ :
ـ هێ کێـوریشکا چەلەنگ ، تەزە توێ کودا ژ بەر من بزەڤی ، ئەزێ نها گۆشتێ تە بخۆم .
وەختا نێزیکا یا وی کر ، نشکێڤا بزنەکە کوڤی پێشی‌یا وی دەرکەت . شێر لێ نهێری ، وەکی بزن دها مەزنە ، گۆشتێ وێ گەلەکەو ئەو نێچیرەکە دها رندە . ئەوی کێوریشك هشت داپەی بزنێ . هەما هندك مابوو ، کوشێر خوە بزنێرا بگهینە ، چاڤێ کەرەکە خەزالا . تشکێڤە بەر وی بانزدا .
ئەوی ڤێ جارێ ژی بزن هیشت و داپەی کارا خەزالا .
وەختا کارا خەزالێ پێشییا شێر دڕەڤی‌یا ، نشکێڤا راستی چەمەکی گور هات ، ئەوێ سەرویرا فرقاسی کرو دەربازی ئالیێ دنێ بوو . شێر هات سەر کەڤیا چێم سەکنی نکار بوو سەرا بانزداو وی چاخی ئەوی نشکێڤا ل ئاڤێ نهێری سیا خوە ئاڤێدا دیت ، هەو زانبوو تەرەولەکی مەزنەو بەر وی سەکنی‌یە .
شێر فکـری ، وەکی چ لازمە ئیدی بدە پەی کارا خەزالێ هازێ حەیـوانـەکی مەزن ڤابـەر وی ، ناڤا ئاڤێدا سەکنی‌یە ، ئەو نێچـیرەکە دها رندە . ئەوی وێ دەڤێ خوە ئاڤیتە ناڤا چێم ، وەکی نێچـیرێ بگرە . نێچیر ناڤ ئاڤێدا تونە بوو . لێ چەمی گەلەکی کور بوو ، شێر هێدی ـ هێدی نقۆیی نبە ئاڤێ دبوو و دخەنقی . وی چاخی کێوریشـك ، بزنا کوڤی‌و کارا خەزالێ رەخ چەم سەکنیبوون ، ل شێرێ کو دخەنقی دنهێرین ، هەڤرا گۆتن
ـ تەرا ئوسا لازمە ، شێرێ خوتحرری .. تێرنەخار ، تە دخوەست ئەم گشت بخارانا ، لێ تەرا لەڤ نەهات . سەر بەلا خوە ڤە بویی .

## ● پادشێ خەوارۆك ●

جارەکێ گوندیك نیڤرۆ کاما خوە بەر ددا ، سەرێ خوە ددە سەر کەڤـرەکێ ، هنـەك رادزێ . خەونێدا دبینە ، وەکی بێدەرا وی کۆتای‌یە ، گەنمێ وی عمبارا کری‌یە .
شابوونا نشکێڤا چەڤێ خوە ڤەدکە ، گایێ خوە نەبینە گا دزی بوون . لێ دگـەرە ـ ناگـەرا ، نابینـە . بەنگـۆزا ، بەن چارخێ خوە دشدینە ، بەرێ خوە ددە مالا پادشێ .
ـ برا پادشایی ساغبە ، من کام دکر نیڤرۆ گا بەردان ،

ئەم کتێبە «١٠٤» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٢×١٦سم»ەو، لە چاپخانەی «ڕۆشنبیری و لاوان» لە هەولێردا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارەی «١٤٧٨»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ و، نرخی «٥٠٠» فلسەو، دوو هەزار دانەی لێچاپکراوە.

کاک «سۆران عیزەدین فەیزی» سەرپەرشتیی چاپکردنی کردووە، «عەزیز ڕەشید حەریری»ش نەخشەی بەرگ و کارە هونەرییەکانی بۆ ئەنجامداوە.

## ١٩ـ زێوان:

چامەیەکی شیعریی کاک «سەباح سابیر حەسەن»ە، لە دوو توێی بەرگێکدا کۆکراوەتەوەو، بۆ هەشت بەشی سەرەکی دابەشی کردووە.

وەکو لە لاپەڕەی پێنجدا دەردەکەوێ ئەم «چامەیە» لە ماوەی نێوان «١٩٨٤/١/٦٠ ـ ١٩٨٧/٨/٢٤» لە هەولێردا نووسراوەتەوە.

ئەم بەرهەمەی شاعیر «٨٨» لاپەڕەی قەبارە بچووکی «١٦ر٥×١٢سم»ەو، لە چاپخانەی «حسام» لە بەغدا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارەی «١٤٧٩»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ و، نرخی «یەك دینارە»و، دوو هەزار دانەی لێچاپکراوە..

کاک «ئازا حەسیب قەرەداغی» نەخشەی بەرگی بۆ کێشاوەو، کارە هونەرییەکانیشی ئەنجامداوە.

## ٢٠ـ تەمە سپییەکانی ڕۆح:

ئەم بەرهەمەی کاک «کەریم دەشتی»ی شاعیر «٢٦» پارچە شیعری گرتۆتەوە، کە لە ساڵانی «١٩٨٣ تا ١٩٨٦» نووسراونەتەوەو دانراون، هەروەها شاعیر لە لاپەڕەی «٦٦»دا فەرهەنگۆکێکی بۆ ووشە گرانەکان دروست کردووە کە لە نێو شیعرەکاندا بەکار هاتوون.

ئەم کۆمەڵە شیعرەی «دەشتی» بریتییە لە «٦٨» لاپەڕەی قەبارە بچووکی «١٦ر٥×١٢ر٥سم»ەو، لە چاپخانەی «فنون» لە بەغدا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارەی «١٤٨٣»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ و، نرخی «٦٠٠» فلسەو، دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاک «محمد زادە» نەخشەی بەرگی بۆ کێشاوەو، کارە هونەرییەکانی ئەنجامداوە.

## ٢١ـ کانگەی بەڵا:

ڕۆمانێکی کاک «حسام بەرزنجی»یەو، دووەم بەرهەمی چاپکراویەتی، نووسەر بەبێ هیچ سەرەتاو پێشەکییەك، یەکسەر ڕۆمانەکە دەخاتە ڕوو، تەنها لە سەر بەرگی دواوە ئەم ئاگادارییەی نووسیوەو دەڵێ: «ئەم ڕۆمانە ئاگاداری نامەیەکە بۆ:

ـ ئەو قوڵبڕانەی کە بازار تەنها بە قەسابخانەیەك دادەنێن و چیتریش نا.

ـ ئەو نەزانانەی کە هەموو بەختیاری و سەرفرازییەکی خۆیان لە گیرفانی گەرما دەدۆزنەوە.

ـ ئەو نەخۆشانەی کەلەناو غەریزەی خاوەندارییەتیەوە خنکاون و، گرێی بەرژەوایان لێ ڕسکاوەو، لێیان بۆتە کانگەی هەموو بەڵاو کارەساتێك»..

نووسەر لە سێ لاپەڕەدا فەرهەنگۆکێکی بۆ ئەو ووشەو زاراوە گرانانە کردووە کە لەنێو ڕۆمانەکەدا بەکاری هێناون.

ئەم ڕۆمانەی کاک «حسام»، بریتییە لە «١٩٦» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٢٣ر٥×١٦ر٥سم»ەو، لە چاپخانەی «الحوادث» لە بەغدا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارەی «١٥١٧»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ و، نرخی «دینارو نیوێکە»و، دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاک «محمد زادە» نەخشەی بەرگی بۆ کێشاوەو، نووسەر هەر خۆی سەرپەرشتی چاپکردنی کردووە.

## ٢٢ـ شانۆی توندو تیژی لەنێوان تیئۆرو پراکتیکدا:

کتێبێکی هونەریی برای نووسەرو هونەرمەند کاک «دانا رؤوف»ە، دەربارەی شانۆی توندو تیژی..

نووسەر ناوەڕۆکی کتێبەکەی بەسەر دوو دەروازەدا

دابەش کردووە، یەکەمیان: تیئۆرو دووەمیشیان: پراکتیک»ە.. یەکەمیان بۆ حەوت بەش دابەشکردووە؛ دووەمیشیان بۆ دوو بەش، لەگەڵ زۆربەی بابەتەکانیشدا چەند وێنەیەك بڵاوکراونەتەوە، بۆ زیاتر پتەوکردنی راوو بۆ چوونەکان کە نووسەر باسی کردوون، هەروەها کاك «دانا» ناوی ئەو سەرچاوانەیشی بردووە کە سوودی لێ وەرگرتوون.

ئەم کتێبە «١٦٠» لاپەرەی قەبارە گەورەی «١٧×٢٤سم»ە‌و، لە چاپخانەی «حسام» لە بەغدا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارەی «١٥٢٨»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ‌و، نرخی «دینارو نیویکە»و، دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاك «ئازا حەسیب قەرەداغی» کارە هونەرییەکانی ئەنجامداوە، کاك «اسماعیل خیاط»یش نەخشەی بەرگی بۆ کێشاوە؛ خوشکە «رووپاك عبدالقادر»یش سەرپەرشتکاری چاپکردنی کردووە..

## ب: کتێبە عەرەبییەکان:

### ١- نظريات الاستراتجية العسكرية الحديثة:

ئەم کتێبەی لیوا روکن «احمد داود سليمان» کە بەزمانی عەرەبییەو، بریتییە لە کۆمەڵە زانیارییەکی ووردو بەپێز دەربارەی کاروباری سەربازی لە چەرخی ئێستاماندا..

نووسەر ئەم کتێبەی پێشکەش کردووە بە؛ «شەهیدانی قادسیەی صدام» کەلە هەمووان شکۆدارترن..

نووسەر ئەم کتێبەی بەسەر چوار دەروازەدا دابەش کردووە، لەگەڵ پاشکۆیەك و چەند وێنەیەك کە پەیوەندران بە کاروباری سەربازییەوە.

ئەم کتێبە «٢٧٦» لاپەرەی قەبارە گەورەی «١٧،٥×٢٤،٥سم»ەو، لە چاپخانەی «دار الحرية» لە بەغدا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارەی «٢١٤»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ‌و، نرخی «سێ دینارە»و، دە هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

عقید «سامي محمد صالح» نەخشەی بەرگی بۆ کێشاوە.

### ٢- الى العظيم غوربا تشوف: تحية ورجاء:

سێیەمین کتێبی مامۆستا «مەسعود محەمەد»ی نووسەرە کە لە ساڵی «١٩٨٨»دا کەوتووەتە کتێبخانەکانەوە، جگە لەو دوو کتێبەی کە هەر لەسەر ئەرکی ئەم ئەمینداریەتە بۆی چاپکراون بە ناوی «زاراوە سازی پێوانە- بە زمانی کوردی»و «من هموم الحياة - بە زمانی عەرەبی».

ئەم کتێبەی نووسەر بریتییە لە نامەیەکی کراوە بۆ سەرۆکی ووڵاتی یەکیەتی سۆڤیەت، گۆرباشۆف، کە تیایدا کۆمەڵە راوو بۆ چوونێکی تایبەتی خۆی باس دەکاو دەخاتە روو.

ئەم کتێبە «٧٢» لاپەرەی قەبارە گەورەی «١٧×٢٣،٥سم»ەو، لە چاپخانەی «الحوادث» لە بەغدا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارەی «١٢٥٣»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ‌و، نرخی «یەك دینارە»و، «١٥» هەزار دانەی لێ چاپکراوە..

### خوێنەرانی ئازیز:

بەمجۆرە ئەمساڵیش ئەو کۆمەڵە کتێب و چاپکراوانەمان پێناساندن، کەبەرهەمێکی بەپێزو دەوڵەمەندی ساڵێکی ئەرك و کۆششی ئەمینداریتی گشتیی رۆشنبیریو لاوانی ناوچەی کوردستانەو، بە هەردوو زمانی کوردیو عەرەبی بڵاوبوونەتەوە، چ ئەوانەی لەسەر ئەرکی ئەمینداریەت بەچاپ گەیشتوون؛ چ ئەوانەی بە پارە یارمەتی نووسەرەکانیان دراوە، بۆ ئەوەی بتوانن بە پێی توانا خزمەتێکی ئەدەب و رۆشنبیریی نەتەوەکەیان بکەن و، کتێبخانەی کوردیی پێ دەوڵەمەندتر بکەن. هیواداریشین ساڵی داهاتوو نەخشەی ئەم کارە پیرۆزو پڕ لە خزمەتگوزارییە فراوانتر بێ‌و، زیاتر گەشە بکاو پێش بکەوێ.



# کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا

## هەولێر        دزوار

### حەمەد بەگی

لە رۆژی ۱۵/۲/۹۸۹ لە هۆڵی رۆشنبـیری جەمـاوەر مەکتـەبی دەزگـا کۆڕێکی لەژێـر ناونیشــانی (سەرەتایەك بۆ حەیـران و کورتەیەك لەژیانی حەمەد بەگی)دا، بۆ کاك غفور مەخمووری فۆلکلۆرپـەروەر سازکـرد. لە سەرەتادا مامۆستا مەحمـود زامـدار وتـەیـەکی کورتی خوێندەوە، ئینجا کاك سعـدالله شێخـانی فۆلکلۆرپـەروەر پووختـەیـەکی ژیـان و دەستنووسی کاك غەفووری پێشکەش بە ئامادەبوان کرد.

دوابـەدوای ئەمـە برای موحـازر هاتـە سەر پێشەکی باسەکەیی و گووتی [گۆرکی ئەڵێ بناغەی ئەدەب لە فۆلکلۆردایە، فۆلکلۆر کەرەسـەیـەکی خاوی مەزنـەو سەرچاوەیە بۆ هەموو هونـەرو بویـژان ئەگـەر بەبـاشی لە رابردوو بگەین بەرهەمی ئەمـرۆمان زۆر رەنگین ئەبێ و ئینجا زۆر بە ووردی لە گرنگی فۆلکلۆر ئەگەین... گەلی کوردیش وەك هەموو گەلانیتری سەر رووی زەمـین خاوەن فۆلکلۆرێکی زینـدوو رەسـەنەو یەکێکە لەگەلە دەوڵەمەندەکانی جیهان لە فۆلکلۆرو بەهۆی ئەو فۆلکلۆرە رەسەنە شارستانێتی و مێژووی خۆی پاراستووە].

ئینجا هاتە سەر وەسفی حەیران و کوورتەیەکی لەسەر رۆیی و هەر لەوێوەوە هاتە سەر زمانی حەیران و دەوری (پێناو) لە پەخشـانـە حەیـرانـدا، جۆرەکـانی حەیرانی دابەشکردو سەرەرای یەکێتی بابەت لە حەیرانداو چەند نموونەیەکی لەو پەخشـانـە حەیـرانـانـە هێنایەوە ئینجا لە رووی ناوەرۆکەوە حەیرانی دابەشکرد بۆ مێژوو، جوگرافیا، ئایین، ئینجا حەیران و داشۆرین و فەرهەنگی حەیران و مەڵبەندی حەیران و چەند نموونەیەکی خستە بەرچاو.

لەبەشی دووەمدا هاتە سەر خواڵێ خۆشبو حەمەد بەگی حەیـران بێـژ. ئەو حەیـران بێـژە لەسـاڵی ۱۹۱۲ لە شاری مەخمـوور لەدایـك بووە، ناوی حەمـەد ئیسمـاعیل ئەحمەد دێـوانـەیـە کە بە حەمـەد بەگی بەنـاوبـانگ بووە، لەهۆزی (شێروانی)یە، لە ساڵی ۹۲۹ـ۹۳۰ دەستی بە حەیران بێژی کردووە، ژنی هێناوەو چەند کورو کچی لە پاش بەجێماوە، لە رۆژی ۲۱/۷/۱۹۷٦ دەمرێ و لە گۆڕستانی شێخ محەمەد لە مەخمور نێژراوە.

دوا بەدوای ئەمـە هاتـە سەر رەوشتی حەمـەد بەگی شێروانی و چەنـد نموونەیەکی لە حەیرانەکان هێنایەوە. ئینجا ئەنجامێکی کورتی بۆ باسەکەی خۆی کردبوو، ئەوەی شایانی

باسە لەم جموجۆڵییە فۆلکلۆرییەی ئەمرۆ لە شاری هەولێردا هەیە لەو جۆرە یادانە چەند حەیران بێژی پیرو جوامێر بەشداری دەکەن و بۆ یەکەمجار لەدوای دیدەنی ئەم حەیران بێژانە لە بەرنامە لە کەلەپوورەوە لە تەلەفزیۆن دێنە بەردەم مایکرەفۆن کە ئەم دیاردەیە دڵ خۆشکەرەیە بۆ زیندوو کردنەوەی ئەم جۆرە مەقامە رەسەنە کوردییە، ئەو بەرێزانەی بەشداری ئەم یادمیان کرد بەحەیران گووتن: حاجی سەعید باداوەیی، حاجی نادر ئەحمەد رەسووڵ، عومەر گاوەرەیی، میرزا خدرە کۆر، خلیل ئەبوبەکر روستایی، سەرەرای ئەمانە بەرێز جمیل عەلی ئاغا دزەیی.

## ئەدەبی منداڵان

دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی لە رۆژی ٢٢/٢/٩٨٩ لە هۆڵی نەقابەی کرێکاراندا کۆرێکی لەژێر ناونیشانی (ئەدەبی منداڵان و رەخنە)ی ، بۆ مامۆستا رۆستەم باجەڵانی شاعیر سازکرد. لە سەرەتادا مامۆستا زامدار برای موحازیری پێشکەش بە ئامادەبوان کرد، ئینجا هەندێك لە قوتابیانی پۆلی یەکەمی ناوەندی روناکی کوران چەند شیعرێکی ئەم شاعیرانەیان خوێندەوە: محمد عزیز فتاح، عەزیزی مەلا رەش، سەلاح سەلیم سەیدۆك، شوان باجەڵان، اسماعیل تەنیا، جمال اسماعیل.

ئەوەی شایانی باسە ئەم شیعرە خوێندراوانە راستەوخۆ لێیان وەرگیرا بوون و لە هیچ گۆڤارو رۆژنامەیەکدا بڵاونەبووبوونەوە.

لە کۆتایی کۆرەکەدا بەرێز محمود زامدار دەرگای گفتوگۆی والاکردەوەو ئەم برادەرانە بەشدار یان لە گفتوگۆیەکە کرد: عەزیزی مەلا رەش، طلعت سامان، جلال خان، مؤید فقێ، اسماعیل تەنیا، سەلاح سەلیم سەیدۆك. دوا بەدوای شیعر خوێندنەوەکان مامۆستا رۆستەم باجەڵان هاتە سەر خوێندنەوەی بابەتەکەی خۆیو گوتی [جیهانی منداڵان جیهانێکە پرە لەوێنەی جوان و رەنگاو رەنگ و داهێنان و خەیاڵێکی بێسنوورە.

منداڵان هەر هەموویان چیرۆك نووس و شاعیرو هونەرمەندی بچکۆلەن، ئەدەبی منداڵانیش کە بۆ ئەم جیهانە بنووسرێ دەبێ خاوێن بێو ئەدیبەکەش لەنهێنییەکانی ئەم جیهانە بزانێ تا منداڵان دەروازەکەی بۆ بکەنەوە. گەلێ کەڵە شاعیرو ئەدیبانی دونیا گرنگییان بە ئەدەبی منداڵان داوەو توانیویانە ناوی خۆیان لەلاپەرە بێگەردەکانی ئەم جیهانە تۆمار بکەن. ئەدیبانی کوردیش بەپێی بۆ لوان و دەرفەت لەم بوارەدا درێغیان نەکردووە.. جێگای داخە هەندێکیان سەربازێکی نەناسراون و مافیان خوراوە].

ئەوەی شایانی باسە کاك رۆستەم پشتی بە گەلێ سەرچاوەی عەرەبیو بێگانە بەستبوو بۆ بەپێزکردنی بابەتەکەی ماوە ماوەیش چەند کۆپلە شیعری منداڵانی شاعیرانی کوردو بێگانەی دەخوێندەوە، ئینجا هاتە سەر دەست نیشان کردنی ئەو خاڵانە کە پێویستە رەخنەگری ئەدەبی منداڵان پەیرەوی بکات یان لەو روانگانە سەیری ئەو ئەدەبە بکات وەکو: هونەری، زمان و هەڵبژاردنی ووشەو ناوەرۆك هەروەها چەند خاڵێکی نیشان کرد بۆ پەرەپێدانی ئەم ئەدەبە لەدوا رۆژدا.

## ژمارەی تایبەتی

لقی دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی ئێوارە کۆرێکی لەژێر ناونیشانی (بەیان و پێداچوونەوەی ژمارەی تایبەتی چیرۆك) بۆ چیرۆکنووس کاك سابیر رەشید لە رۆژی ٤/٣/٩٨٩ لە هۆڵی نەقابەی کرێکاران سازکرد. لەسەرەتادا مامۆستا زامدار بەناوی دەزگاوە بەخێرهاتنی میوانەکانی کرد، ئینجا کاك احمد محمد اسماعیل و کاك ئازاد شوان بە ناوی گۆڤاری بەیانەوە وتەی خۆیان خوێندەوە. ئینجا کاك سابیر هاتە سەر باسەکەیو گوتی [بێگومان دەرکردنی ژمارەی تایبەتی هەر گۆڤارێك بۆ هەر لقێکی ئەدەب و رۆشنبیری کارێکی بەسوودو گرنگە لە رووی بایەخ پێدانی بەم بابەتەو لێکۆڵینەوەو سەرنج و راو رەخنەی ژمارە تایبەتییەکەش زیاتر دەنیخەملێنێو جموجۆڵێکی چاکی لێدێتە ئاراوەو سوودمەندتر دەبێ، ئەمەیش لای هەموو گەلانی دونیا پەیرەوکراوەو لای ئێمەش ئەم تاقیکردنەوەیە خەریکە سەرهەڵدەداو دەرەخسێو خەمخۆرانی ئەدەبەکەمان زیاتر تەکانی بۆ دەدەن و بۆ هەر بابەتێکی جیا جیای ئەدەب و رۆشنبیری ژمارەی تایبەتی بۆ تەرخان دەکەن].

دوابەدوای ئەمە مامۆستا سابیر رەشید لە پێشکەشکردنی بابەتەکەی خۆی بەردەوام بوو گوتی [هەرچەندە لایەنێکی

تایبەتیم نەگرتوتە بەر لەم هەڵسەنگاندنەدا بەڵام ویستوومەو مەبەستم بووە بۆ هەر چیرۆکێ و بەگوێرەی حاڵەت و تەکنیك و تایبەتیەکانیەوە لێیان بدوێم چیرۆکنووسەکانیش هەر بەگوێرەی ریزکردنیان لە ژمارەکەیەك بەدوای یەك باسکراون، تەنها ئەو چیرۆکانەی بەشێوەی کرمانجی باکوور نووسراون باسم نەکردوون ئەمەش هەم لەبەر ئەوەی نیاز وایە لە دهۆك کۆری لەسەر ببەستن و هەم لەبەر ئەوەش چیرۆکەکان خۆیان زۆر بوون و نەمدەتوانی باسی هەموو چیرۆکەکانی ژمارەکە بکەم و باسی ئەو چوار چیرۆکەشم نەکرد کە برای رەخنەگر کاك زایەر رۆژبەیانی توانیبووی زۆر بەجوانی باسی چیرۆکەکانی (حسین عارف، نەجیب گەرمیانی، رسول کریم، رؤووف حسن) بکات و ماف تەواوی خۆی پێدابوون و رێك وپێك و سەرنج راکێش بوو هیچ ئیزافەیەکیشم لەسەر رەخنەکەی نەبوو، ئەوانەی کە باسیشم نەکردوون بەلای خۆمەوە مەرجەکانی چیرۆکی هونەریان تیا بەدی ناکرێت بەو هیوایەی ئەوانیش بتوانن لەدوا رۆژدا چیرۆکی هونەری بنووسن].

لەکۆتایی کۆرەکەدا ژمارەیەکی زۆر لە ئەدیب و رەخنەگرو چیرۆکنووسان گفتوگۆیان دەربارەی باسەکەو چیرۆکی کوردی کرد.

## کۆلێرا

لە جموجۆڵی دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی لە رۆژی ٨/٣/٩٨٩ لەهۆڵی نەقابەی کرێکاران کۆرێك لەژێر ناونیشانی (مەرگ و خۆشەویستی لە رۆمانی خۆشەویستی لە سەردەمی کۆلێرادا) بۆ برای هونەرمەند حەمە عەلی سازکرا. لەسەرەتادا مامۆستا زامدار کاکە حمە علی پێشکەش بە ئامادەبوان کرد، ئەم رۆمانە لە نووسینی نووسەری بەناوبانگ (گابریێل گارسیا مارکیزە)، برای موحازر لە سەرەتادا هاتە سەر باسی کورتەیەك لەژیانی مارکیزو لەچەند خاڵێکدا جویی‌کردەوە لە نووسەرانی پێش خۆی کە کاربنتێرو ئۆستۆریاس بوون.

دوایی هاتە سەر شێوازی نووسین لای مارکیزو دەستنیشانی ریالیزمی سیحری کرد کە شێوەی سەرەکی‌یە لەرۆمانەکانیدا. دوا بەدوای ئەوە هاتە سەر روون کردنەوەو تێروانینی مارکیز بۆ بابەتی مەرگ و خۆشەویستی لەرۆمانەکەدا. چەند مووناقەشەیەکی خۆشەویستیو برایانە کۆرەکەی رازاندەوەو کۆرگێر وەڵامی پرسیارەکانی دانەوە.

## پیشانگای تایبەتی

کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی کورد لقی هەولێر لە رۆژانی ١-٦/٣/٩٨٩ لە هۆڵی میدیا سێیەم پیشانگای تایبەتی هونەرمەند کەمال سەعدی سازکرد. برای هونەرمەند بەم تابلۆیانە چاوی بینەرانی روون کردەوە: پڵنگ، قەلەرەش و مێژوو، هێرشی قەلەرەشەکان، رۆژئاوا، هاوار، ئاوەدانی، بیرکردنەوە، دڵی ئەو ئافرەتە بێ سنوورە، وێنەیەك لە جەنگ، لەسەر گۆڕی شەهید، جیابوونەوە، مەلەوانی، کۆچ کردن، بروسکەیەك لە ئاسمانەوە بۆ زەوی گریانی خوێناوی، کۆتری ئاشتی، دیواری سەربەخۆیی، بێناونیشان و چەندانی دیکە.

هونەرمەند کمال سعدی لە ساڵی ١٩٥٦ لە شاری هەولێر لە دایك بووە، لەسەرەتای حەفتاکانەوە خودووی هونەری تەشکیلیەو بەردەوامیشە، لەساڵانی ٩٧٦-٩٨٥ لەشاری هەولێر پیشانگای یەکەم و دووەمی سازکردووە، لە ساڵی ١٩٧٣ بەیەك تابلۆ بەشداری ئەو پیشانگایەی کرد کە لە بەرلینی





دیموکراتی سازکرابوو. لەساڵی ١٩٧٥ بەشداری پیشانگای جیهانی ئاشتی بە پۆستەری سیاسی کە لە بەغدا سازکرا کرد. سەرەرای گەلێ بەشداریتری کە دواییەکەیان ئەوەبوو بە تابلۆیەك بەناوی ژیانی مردوو بەشداری لە پیشانگای هاوبەشی هونەرمەندانی کورد لەساڵی ١٩٨٦ کرد کە ئەمینداریتی رۆشنبیریو لاوان لە هۆڵی رۆشنبیریو لاوان. (میدیا) سازکرد.

## سلێمانی

- ئازاد -

### جزیری وانەی ئەڤین دادەدات

تیپی شانۆی سالار لە ٩/٣/١٩٨٩ مەوە لەسەر شانۆی هۆڵی یەکێتی نیقابەکانی کرێکارانی سلێمانی دەستیان بە پێشکەش کردنی شانۆیی «جزیری وانەی ئەڤین دادەدات»ی کرد.

ئەم شانۆییە کە لەنووسین و دەرهێنانی هونەرمەند مامۆستا «ئەحمەد سالار»ە بە درێژەپێدانی ئەو شێوازەی دەژمێردرێ کە لە هەردوو کارە شانۆییەکەی پێشوویدا (نالیو خەونێکی ئەرخەوانیو کاتێ هەڵۆ بەرز دەفرێ) خستبوویە روو؛ هونەرمەند لەتێکرای ئەم کارانەدا هەوڵداوە سوود لە موفرەداتی شانۆی ئاهەنگسازی وەربگرێت.

●

ئەو ئەکتەرانەی لەم کارەدا بەشدار بوون برێتی بوون لەم هونەرمەندە لاوانە: (یونس حەمەکاکە - جزیری، فرمێسك مستەفا - سەلما، شۆرش قادر - بەیت بێژ، ئاراس تەیب بەقاڵ - میر، بورهان محەمەد - سەرکردەی دوژمن، قارەمان ئیبراهیم - حەسۆ، سۆران ئیسماعیل - مەمۆ، ئەرسەلان ئەحمەد دەروێش - راوێژکار، ئاڤان حەمەکاکە - نیگار، مەریوان عومەر شەربەتچی - جارچی، دڵشاد عەبدوڵڵا - شڤان).

کارە هونەریو ئیدارییەکانیش بەم جۆرە دابەش کرابوون: (یاریدەرانی دەرهێنەر: کامەران رەئووف و ئەرسەلان ئەحمەد دەروێش، بەرێوەبەری شانۆ: رەمەزان ئیبراهیم، دیکۆر: کامەران رەئووف و ئاراس تەیب بەقاڵ و رەمەزان ئیبراهیم و سۆران ئیسماعیل، رووناکی: مەریوان عومەرو شیروان عەبدوڵلا).

مۆسیقاکارەکانی ئەم شانۆییەش برێتی بوون لەم هونەرمەندانە: (سەلاح رەئووف - کەمان، محەمەد حسەین - فلووت، لوقمان مەجید - ساز، ئاسۆ جەمال - ئیقاع، بورهان محەمەد - گۆرانی بێژ).

لیژنەی بەرهەمیش برێتی بوو لە هونەرمەندان یاسین قادر بەرزنجیو سیروان ئەحمەد بەرقی.

### پیشانگایەکی تایبەتی

لە کۆتاییەکانی مانگی دووی ئەمساڵدا؛ دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی - لقی سلێمانی؛ پیشانگای سێهەمی تایبەتی هونەرمەند (بورهان هەژار) کردەوە.

لەم پیشانگایەدا کە لە هۆڵی گەلەریی سلێمانیدا کرایەوە؛ برای هونەرمەند کۆمەڵێك کاری نوێی خۆی پیشان دا لەوانە: (چەخماخەی شۆرشی بەرد، گەران بەدوای راستیدا، روانینی خۆم، کۆچی باڵندەکان لەونبوون دا، رامان، گریانی چیا، سێوێکی هەڵواسراو، رارایەکی هاوچەرخ).

هونەرمەند لەوتەکەیدا دەڵێت: (هونەر ئەزموونە، هەر لەبەرەبەیانی مێژووی مرۆڤایەتیەوە هەتا ئەمرۆ هونەر بەچەندین قۆناغی گەران و دۆزینەوەو سەرهەڵدانی نوێدا تێپەریووە، هاوشانی رازو نیازو خەمەکانی مرۆڤ بووە تا دەڵێت.... ئەم تابلۆیانەش رەنگدانەوەی شتە هەست پێکراوو

بینراوەکانی ناو واقیعن، سەرباری جودایی لەشێوازدا).
- بورهـان هەژاری هونـەرمـەند لەساڵی ١٩٦٤دا لەسلێمانی هاتۆتە دنیاوە.
- قوتابی‌ی دواقۆناغی ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانە.
- دوو پیشانگای تایبەتی‌ی کردووەتەوە لەساڵانی ٨٢ و ٨٤دا.
- بەشداریی چەند پیشانگایەکی هاوبەشی کردووە.
- دەربارەی هونەری شێوەکاری؛ باس و نووسینی هەیە.
- رێچکەی شیعر نووسینی گرتۆتەبەر.

**( ئێوارە کۆڕێکی شیعری )**

لەلایـەن بەڕێـوەبـەرێتی‌ی رۆشنبـیری‌ی جەمـاوەرەوە لەسلێمانی؛ سەر لەئێوارەی رۆژی ٣/٩ ئێوارە کۆڕێك بۆ شیعر خوێندنەوە سازکرا.

لەم ئێـوارە کۆڕەدا کە برای رۆژنـامـەنووس (شەهاب عوسمان) بەڕێوەی دەبرد ئەم شاعیرە بەڕێزانە بەشداریان کرد (سەعدوڵا پەرۆش - قەسیدەی ئەبەدیەت، کەریم دەشتی - ١ - کەپـرەکـانی دەروون ب - گەڵای رژاو، فەرید زامدار بە قەسیدەیەکی درێژ، سەلاح شوان - بەشی سێیەمی قەسیدەی شەوێك لەشوانی سیمرغ).

**« قەرەج »**

لەرۆژی ١٩٨٩/٣/١٧ وەو لەسـەر شانۆی سانەوی سەلاحـەدین؛ تیپی نواندنی سلێمانی شانۆیی «قەرەج» یان پێشکەش کرد.

شانـۆیی «قـەرەج» لە ئەسڵدا قەسیـدەیەکی درامایی شاعـیری مەزنی رووس «پـوشکـین»ە و کاك ئەحمـەد کەریم لەعەرەبیەوە کردبووی بەکوردی‌و مامۆستا ولیەم یوحەنا ئاوازی گۆرانیـەکـانی نێـو شانـۆییـەکەی دانابوو، هونەرمەند بەکر رەشیـدیش ئامادەی کردبووو دەری هێنابو ئەکتەرەکانی ئەم کارە شانـۆیی‌یە بریتی بوون لە: (زاهیر عەبوڵڵا رەش - پیرە، تریفە جەمال - زەمگیرا، رزگار باهیر - ئەلیکۆ، بەکر رەشید - لاوە، لوقمـان سابـیر - فلۆوت ژەن، تەها عەبدولقادر - گیتار ژەن، هوشیار محەمەد - مەندولین، سازگار تەها - گۆرانی بێژ، سالار عوسمان، بەهائەدین محەمەد، ئاشنا فەرەج، شیلان محەمەد، عوسمـان کاکـە حەمە، نەدیمە ئیسماعیل، کاروان محەمەد، رێبوار کەریم، تەها رەئووف، حەسەن عەلی).

ئیداری‌و هونەریەکانی ئەم کارەش بریتی‌بوون لە:
(سمکـۆ عەزیـز - سەلاح باڵابـەرز: بەڕێـوەبەرانی بەرهەم، عوسمان محەمەد قادر - بەڕێوەبەری شانۆ، سەلاح باڵابەرز - عوسمـان محـەمـەد - زاهـیر عەلی - کاروان محـەمـەد: جێبـەجێکـەرانی دیکـۆر، عوسمـان محـەمەد - رووناکی‌و جێبـەجێکردنی، زاهـیر عەلی - جلوبـەرگ، تریفە جەمال - ئارایـشـت، عەلی لەتـیف - پۆستـەر، نوری ئیسمـاعیـل - خۆشنووس، لوقمان سابیر - سەرپەرشتی‌ی مۆسیقا، سەلاح محەمەد - دانانی شیعری گۆرانی‌یەکان، حیسام بەهائەدین - بلیت).

**« پیشانگایەکی تایبەتی »**

لەهـەفتـەی یەکـەمی مانگی سێ‌داو لەهۆڵی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی؛ لەلایەن بەڕێوەبەرێتی پەیمانگاوە دووەمـین پیشـانگـای هونەرمەندی لاو «ستار قادر» کرایەوە، هونەرمەندی لاو لەم پیشانگایەیدا «٩٠» تابلۆی خۆی پیشان دابوو؛ کەتێکەڵ بوون لەکاری رەنگی ئاوی‌و زەیتی‌و سکێچ و هێلکـاری کە بابـەتەکانیان لەنێوان ئیشی پۆرتریت و مۆدێل و هەندێ بابەتی کۆمەڵایەتی‌و ئیشی تەعبیریدا خۆیان دەبیننەوە.
- هونەرمەند «ستار قادر» لەساڵی ١٩٦٨دا هاتووەتە دنیاوە.
- بەشـداریی زۆربـەی پیشـانگای قوتابخانەکانی کردووە لە



قوناغی سەرەتاییو ناوەندیدا.
- لەساڵی ١٩٨٧دا یەکەم پیشانگای تایبەتی خۆی هەر لە پەیمانگادا کردووەتەوە.
- قوتابیی دوا پۆلە لەبەشی تەشکیلیی پەیمانگای هونەرە جوانەکان لەسلێمانی.

**« پیشانگایەکی هاوبەشی منداڵان »**

لە ٣/٢٢ تا ٣/٢٦ بەڕێوەبەرێتی رۆشنبیریی جەماوەر لەسلێمانیو لە هۆڵی مۆزەخانە بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە پیشانگایەکی هاوبەشی بۆ حەوت منداڵ کردەوە.

ئەم پیشانگایە (٦٨) تابلۆی ئاویو باستیل و هێڵکاریی گرتبووە خۆو زۆربەی بابەتەکان بریتی بوون لە ژیانی رۆژانەی نێو کۆمەڵگاو خێزان و دیمەنی سروشتی. جێی ئاماژەیە کە هەر ئەم هونەرمەندە بچووکانە لە ساڵی ١٩٨٧دا پیشانگایەکی هاوبەشی تریان کردەوە.

منداڵە بەشدارەکانیش بریتی بوون لە:

**● یادگار محەمەد فەرەج**

- قوتابیی پۆلی دووەمی سەرەتاییە.
- لەساڵی ١٩٨٧دا بەشداریی پیشانگایەکی هاوبەشی کردووە کە بۆخۆیو دیاریی برایو ئاشنای خوشکی کراوەتەوە.
- لە ١٩٨٨دا بەشداریی پیشانگایەکی هاوبەشی منداڵانی کردووە.

**● دیاری محەمەد فەرەج**

- قوتابیی پۆلی شەشەمی سەرەتاییە.
- لە ١٩٨٧دا بەشداری پیشانگایەکی هاوبەشی کردووە.

**● ئاشنا محەمەد فەرەج**

- قوتابیی پۆلی یەکەمی ناوەندییە.
- لەساڵی ١٩٨٧دا بەشداری پیشانگایەکی هاوبەشی کردووە.

**● دڵکەش محەمەد عەلی**

- قوتابیی پۆلی پێنجەمی سەرەتاییە.
- لە ساڵی ١٩٨٧دا بەشداری پیشانگایەکی هاوبەشی کردووە.
- بەشداری پیشانگایەکی هاوبەشی قوتابخانەکەیان (قوتابخانەی گەل ی تێکەڵاو)ی کردووە.

**● زانا محەمەد عەلی**

- قوتابیی پۆلی دووەمی ناوەندییە.
- لە ١٩٨٧دا لەگەڵ بەشداربووانی ئەم پیشانگایەدا هاوبەشی لەپیشانگایەکدا کردووە.

**● هانا محەمەد عەلی**

- قوتابیی پۆلی یەکەمی ناوەندییە.
- لە ١٩٨٧دا بەشداری لە پیشانگایەکی هاوبەشدا کردووە.

**● ئاکار تاهیر**

- قوتابیی پۆلی دووەمی سەرەتاییە.
- تەمەنی هەشت ساڵە.

●

## دهۆک مەتین

### «سیابەند دەستێ جزیری ماچی دکەت»

**ل بن ڤی ناڤنیشانی ئێکەتیا نفیسفانێت کورد ل دهوکێ کۆرەك بو هونەرمەندێ هێژا «ابراهیم سمۆ» سازکر، ل هولا ئێکەتیێ ل ئێڤاریا پێنجشەمبێ رێکەفتی ٢٣ـ٢ ـ١٩٨٩ سەیدا نجیب بالایی هوزانڤان ئەڤ ئێڤاریە پێشکێش کر.**

کەکێ موحازر بابەتێ خوە لسەر ڤان خالێت ژێری پارڤەکر:
پیروزباهی‌یا هەردوو تیپێت شانوویێ (ئەڤرۆ) و (بەهدینان) کرو رایا خو ئاشکرا کر ل دویف ئەڤرو دڤێ چاوا بخەبتن و چاوا بزاڤ و چالاکی‌یا شانوویێ ل دەڤەرێ دێ پێش ئێخین.
- شانووگەری‌یا (جزیری وانەی ئەڤین دەدات) یا هونەرمەندێ هێژا «احمد سالار»ی کرە دناڤ بەینا چەند پرسیارەکادا و پاش بەرسڤا وان داو راو بوچونێت خوە ل سەر خویا کرن.
- د دویڤدا بدرێژی ل سەر دەرهێنانێ ئاخفت د شانووا جیهانی‌دا بگشتی‌و شانووا کوردی بتایبەتی‌و تبابەکێ بەحسێ دەرهێنانا سەیدا «احمد سالار»ی کر د شانووگەری‌یا جزیری‌دا.
سەبارا ڤێ شانووگەریێ ناڤبری گوت:
د سەر هەمی کێماسیێت د کاری‌دا، کارەکی سەرکەتی بو ژلایێ دەرهێنان و بەرهەڤکرنا دەقی‌و زارڤەکرنێ‌و دیکوری‌و ئێکسسواریڤە.
ل دوماهیێ برادەرێت ژێری پشکداری د دان و ستاندنێ‌دا کرن:

● **محسن عثمان:**
ئەز دگەل هندێ نینم کو سیمایێت شانۆوا کوردی دیار نەبوینە ژبەر هندێ شانۆوا کوردی نینە.

● **کریم بیانی:**
سەیدایێ احمد سالار نە گەلەکێ سەرکەوتی بو د ئامادەکرنا دەقی‌دا، د راکرنا هوزانا‌داو ئەمانەتا مێژوویێ، نزانم د دەرهێنانێ‌دا هەر بێ وەلێ بو، یان نەء.

● **احسان عثمان:**
سەیدایێ احمد سالار نەڤیایە یاسایێت شانۆوا ئاهەنگی (إحتفالي) پشکێنیت لەو شانۆوکەی وەکی «لقطات» دەرهێنایەو هندەك ستران بکار هینانە کو چو پەیوەندی بناڤەروکا شانۆوگەریێ ڤە نەبون بشێوەکی وسا گیانەکێ دەڤەرێ بێخیتە دناڤ دا بو پتر نێزیك کرنا بینەری ژنا ڤەروکێ. ئەڤە ڤی کۆری نێزیکی سەعەت و نیڤا کێشا.

### «پاشگرێت کەسی د زمانێ کوردی‌دا»

بهەلکەفتنا جەژنێت ئادارو نەوروزێ رێڤەبەریا رەوشەنبیری جەماوەر ل دهوکێ ل رێکەفتی ٢ـ٣ ـ١٩٨٩ ل هولا بزاڤێت فێرگەها کۆرەك ل سەر زمانی بو سەیدا متی فیلیب البازی سازکر.

**هێژا کریم جمیل بیانی موحازر بو جەماوەری پێش کێش کر.**

**بابەتێ ڤێ ئێڤاریێ ل بن ڤی ناڤنیشانی بو:**
**«پاشگرێت کەسی «راناوی لکاو» دزمانێ کوردی‌دا»**.
ژرێڤە سەیدایێ موحازر باسێ ڤان پاشگرا کر لگەل ناڤێ تاك و ب بەرفرەهی ل سەر ئاخفت و نمونە بەرچاڤ کرن ژوان
**- کەسێ ئێکێ**: ئەز یێ نەساخم (م)
ئەز سەیدامە (مە)







- **کەسێ دووێ**: توی نە ساخی (ی)
- **کەسێ سێیێ**: ئەو نەساخە (ــە)

ئەو برسی‌یە (یە)

سەیدای دەست نیشانْ کر کو هندە برادەرێت نفیسڤان گرنگیێ نادەنە (ی)ا نمونا دوماهیێ د پەیڤا (برسی‌یە)دا، د نفیسینێت خودا، ئو ئەڤە خەلەتی‌یە.

- **د حالاتێت** نەفیێ دا (نی) لگەل بکار تێت:

ئەز نەساخ نینم (نی)

- **د هندە** حالەتادا شوین دەنگ لگەل بکار تێ «دایافون»:

ئەز نەساخ بوم «بو»

ئەز نەساخ بیم «بیـ»

- **د حالاتێت** «ثبوتیێ»دا، رستا دروست ژێ تێتە دورکرن و هاڤێتن:

(ئەزم ـ توی ـ ئەوە)

پاش ئەڤ ناڤ و پاشگرە لگەل فرمانێت تێپەرو تێنەپەر بکارهینان.

د دویڤدا باسێ ڤان پاشگرا لگەل نافێت «کو» بو نمونە:

ئەم نەساخین ی+ن

هوون نەساخن +ن

پشتی هینگێ کەکێ موحازر رهێت هژمارەکا فرمانا خویا کرن و چەنـد بیرو راو بوچونێت زمان زانێ ئنگلیز «جاردین»ی ئینان دەبارا پاشگرێت کەسی د زمانێ کوردی‌دا، ئەڤێت د پەرتوکا وی‌دا هاتین لسەر کورمانجی‌یا ژووری.

پاشی بەحسێ چاخا کرو دەرخستنا رەگێت فرمانا ئەڤێت لگەل ناڤا تێن، نافێت پاشگرێت کەسا لگەل تێن، مشە نمونە بو مە لسەر ڤێ چەندێ ئینان.

دومـاهیێ دەرگەهێ دان و ستاندنێ ڤەبو، هژمارەکا ئەدیب و رەوشەنبیرا پشکداری تێدا کرن ژوان:

بائیز عمر ـ نوزاد ـ دیار محمد سعید ـ قسیم محمد أمین ـ ابراهیم بەرواری.

ئەڤەو ڤی کۆری نێزیکی سەعەتەکێ کێشا:

**● متی فیلیب بازی ●**

- ل سالا ١٩٤٩ێ ل شێخان ژ دایك بویە.
- سالا ١٩٧٠ پشکـا زمـانێ ئنگلیزی ل زانستگەها مویسل تەڤاف کریە.
- ڤان زمانا دزانیت: کوردی ـ عەرەبی ـ ئنگلیزی ـ فرەنسی ـ سریانی.
- مشە گوتارو ڤەکولین لسەر زمانێ کوردی‌و سریانی بەلاڤکرینە.
- نها ماموستایێ زمانێ ئنگلیزی‌یە ل ئامادەیی‌یا چرا ل دهوکێ.

## «رونشتنەکا رەخنەیی لسەر چیروکێت گوڤارا بەیان»

**ژ بزاڤێت دەزگەها رەوشەنبیری‌و بەلاڤکرنا کوردی، ل روژا ئێـک شەمبێ رێکـەفتی ٥ـ٣ ـ١٩٨٩ێ ل هولا ئێکـەتیـا نڤیسـڤانێت کورد ـ تایێ دهـوکێ کورەکێ تایبەتی هاتە سازکرن سەبارا ژمارا «١٤٨»ێ یا گوڤارا بەیان یا تایبەت بکورتە چیروکا هونەری یا کوردی.**

دڤی کورێدا دوو برایێت چیروك نڤیس پشکـداری تێدا کرو بیرو راو بوچـونێت خو ل سەر هژمـارەکـا چیروکێت هاتینـە بەلاڤکـرن خویـاکـرن. ژ رێڤە سەیدا «نزار محمد سعید»ی بەحسێ ڤان چیروکێت ژێری بدرێژی کر: (خەون و خوزی)یا محمد سلیم سواری، (تەنا کرژم) یا صدیق شروی، (خەلاتێ زڤستـانەکا سار) یا «عبدالله»ێ جندی، (بالولکا شەکرێ) یا حسن سلێڤانی.

دوماهیێ وەکو ئەنجام بو تێبینی یێت خو چەند خالەك دەست نیشان کرن ژوان:

ـ سواری‌و جندی‌و حسن د چیروکێت خودا د سەرکەتی‌نە، د ئاڤاکرنا پێشەکی‌یێ و گرێکێ‌و دوماهی‌یا چیروکێ‌دا.

ـ چیروکـا سواری هونـەرەکـێ بەرزە دومرارێ‌داو خوە دڤێ چیروکێ‌دا ب نك چیروکا بزمحمەت ڤە دکێشیت. ـ

ـ تەڤ چیروکا هەتا رادەکی پویتە بزمانی کری‌یە د چارچوڤی تەشبیها تێت جوان و کینایەت و گوتنادا.

ـ بشێوەکێ گشتی رویدان د تەقلیدینە (خوکوشتنا ژنکەکێ، مرنا چەندەکا برویدانا تومبێلێ، کوشتنا ژنکەکێ)، ئەگەر چی چیروك نڤیس شیاینە تامەکا خوەش بدەنە چیروکێت خوە.

ـ ژنك پالەوانە د چیروکا «صدیق»ی‌و «حسن»ی داو هاریکارە د چیروکێت دی دا.

ـ (بـالولکا شەکرێ) ناڤنیشانەکێ پڕ ب هێزە، لگەل ناڤەروکا چیروکێ سەدا سەد د گونجیت.

ناڤینشانێت دی بڤێ هێزێ ناڤەروکێت چیروکێت خو ناگرن.

د دویڤـدا سەیـدایێ کریم جمیل بیانی پێنج چیروك گرتن و



بدرێژی بیرو رایێت خو ل سەر دیارکرن.

دوماهیێ ژی هژمارەکا برادەرا کەتنە ڤادا دان و ستاندنێ لسەر بیرو رایێت ژلایێ هەردوو برادەراڤە هاتینە دەربرین.

ژ برادەرێت پشکداری دڤێ دان و ستاندنێ‌دا کرین:

**قسیم حسن ـ ڤیران فرج ـ متی فیلیب بازی ـ شڤان علي آدم ـ صدیق شرو ـ عبدالله جندي ـ نزار محمد سعید ـ کریم جمیل بیانی.**

پشتی ئەڤ کورە بدوماهی هاتی کورەکێ دی دەست پێکر ل سەر گوڤارا بەیان بگشتی هێژا احمد عبدالله زەروی رێبەرێ ڤان کورا ل هێرە دەرفەت دا سەیدا «ئازاد شوان»ی سکرتێرێ گوڤارا بەیان یێ گوتارەك بناڤێ دەزگەها رەوشەنبیری‌و بەلاڤکرنا کوردی خانـدی. پشـتـی هیـنگێ چەنـد برادەرەکێت حازر تێبینی‌یێت خوە ل سەر گوڤارا بەیان ئاشکراکرن، ژوان برادەرا:

**حجي جعفر ـ صدیق شرو ـ حسن سلێڤانی ـ نزار محمد سعید ـ شڤان علي آدم.**

دوماهیێ سەیدا «ئازاد شوان»ی بەرسڤا پرسیارێت برادەرا داو تابەکی لسەر رێچ و رێبازا گوڤارا بەیان ئاخفت.

ئەڤەو ڤان هەردوو کورا نێزیکی دوو سەعەتا کێشا.



# كاروان

مجلة ثقافية شهريّة، تصدرها الامانة العامة لادارة الثقافة والشباب باللغتين الكردية والعربية

في هذا العدد




رئيس التحرير
محمد أمين محمد أحمد

نائب رئيس التحرير
حسين رشواني

٧٥
آيار/ ١٩٨٩
السنة السابعة

الثمن «٥٠٠» فلس

العنوان: اربيل الامانة العامة للثقافة والشباب - مطبعة الثقافة - مجلة كاروان هاتف «٢٢٦٥٨»



# ملحمة فاو تعيش في ضمائر كل الشرفاء

●كتابة: حميدة نعنع● باريس تقديم: ا. ئاشتى

في السابع والعشرين من شباط المنصرم، نشرت جريدة «الثورة» الغراء بعددها ذات الرقم «٦٨٤٩٠»، كلمة؛ أو بالأحرى

خاطرة لكاتبة دمشقية معروفة من باريس، بعد ان زارت بلدها العراق، فسجدت كما رفاق الرحلة على أرض الفاو. وهي تنوي أن تبني فيها بيتاً دمشقياً..

حقاً إنها خاطرة رقيقة تُعبرُ عن المشاعر الصادقة، والحس الرقيع، فهذه الرقة في التعبير دفعتنا الى أن نعيد نشرها ثانية بعد ان اكملت ذكرى تحرير الفاو عاماً كاملاً.. إذاً فلنبقي جميعاً مع الكاتبة الدمشقية «حميدة نعنع» في الفاو بيوت الحب والاعتزاز، بيت النصر والسلام. والى نص الخاطرة مرة أخرى، مع الاعتذار للزميلة نعنع سلفاً..

« النص المنشور »

## في الفاو سأبني بيتا دمشقيا

قبل ان تدخليها برفقة بعض الكتاب العرب توقفت قليلا . توضات .. تطهرت من نزف دم الغربة .. من اشيائك الحزينة .. مز صمت السنوات الطويلة التي عشتها وحيدة دون صديق او رفيق . سجدت على ترابها واستنشقت عبيرها كما يستنشق العاشق عطر حبيبته البعيدة .

يبتسم رفاق رحلتك ويقدرون ان الغربة جعلتك اكثر رومانسية وحلما واقل واقعية . هذا ما يقوله لك احدهم ، فتبتسمين بكبرياء امرأة دمشقية لا تعترف ولن تعترف بالحدود التي تفصل بين الاقطار العربية . ثم تتمين صلاتك بخشوع كسحابة ورد تعرف اين تذهب واين يسقط خيرها .

شط العرب امامك رابض كالصقر على طرف التاريخ . وعلى شاطئه ترتفع اشجار النخيل التي احترقت لكنها لم تقبل الموت

غدا سيفهم رفاق الرحلة معنى سجودك على ارض الفاو .. حين يدركون ان هذه الارض المترعة بالملح والدم صنعت تاريخك الحديث بل هي تاريخك الذي يموج بأحلامه كلها كعقود من الزنابق فوق رؤوس الابطال .

غدا سيفهم رفاق الرحلة لماذا بدت اشجار النخيل اكثر جمالا في الفاو من ليل على صدر عاشق ، والشمس اكثر استدارة منها في الايام الخوالي ، والسماء اكثر زرقة من بحر بعيد .

وحتى يتذكر كل طفل في امتك .. وحتى لا تخوننا الذاكرة اكتبي اليوم ، اكتبي اليوم وسوف تكتبين غدا .. ستكتبين عن النصر حتى لا يظل « الماء بحرا للنشيد المر » او « الحلم المستعر » ستكتبين لترمين من نافذة المستقبل رواية ملحمة الفاو التي استغرقت ثماني سنوات من القتال وليس خمسا وثلاثين ساعة فقط .. ستكتبين لتقولي بثقة المنتصر .. ايها العرب ان نصر الفاو لن يكون الراية الاخيرة في تاريخكم ولكنه بداية لنصر ونصر ونصر سيحمله لكم المستقبل . منذ زرتها بعد

رحيل الغربان عنها صفق جسدك الدامي شغفا ولهفة اليها .. الى عيون من صنع منها اسطورة .. الى عيون من سجل لحياتك سببا . وقبل ان ينتهي من مواراة شهدائه التراب ليوحد الراية العربية ، نهض ليجمع الكلمة بعد ان تركت الحرب آلامها على جلده كما يترك التبغ اثره على الاصبعين ، ثم اطل بتواضع على ارضه كما يطل الصقر على فراخه بينما كنت فرحة وتبكين لغياب دمشق التي حالوا بينها وبين ان تكون هنا ، لكنها تسللت كعادتها اليك ليلا لتمنعك عن البكاء وتقول لك ببساطة



الاطفال ومن قال انني كنت غائبة ثم تحدد لك موعدا في نهاية العام

١٩٨٩ . تدخلين الارض الحرام ارض الفاو وتطلبين الاصدقاء ان يخففوا الوطأة على اديم الارض حتى لا يقلقوا نوم الشهداء . وبينما كان بعض الضباط يشرحون تاريخ المعارك وجباههم لوحتها الشمس .. بينما كانوا يعددون الشهداء الذين سقطوا هنا لتكون هذه الجزيرة حرة ، سرقتك الذاكرة وعادت بك الى الوراء حيث بين اليوم واليوم الذي امضاه العراق باسترداد هذه الارض اربع قارات جريحة يلهث فيها الموت وتضاء نوافذها في الليلة اعترافا بان الدم العراقي لم يدافع عن مشروع امته وقيمها حسب .. بل دافع وبكل شجاعة عن قيم الحضارات الانسانية كلها .

امتثالا للاوامر المقدسة للذاكرة ها انت تعودين قليلا الى الوراء .. الى سنة ١٩٨٦ لتجدي نفسك وحيدة بين جدران بيت غريب تقلبين عبثا المحطات وتبكين بحرارة لكان احتلال الفاو حملك الى الموت الذي قذف بك كقافلة فوق البحر .

نعم مئات الالاف يقاتلون خلال ايام وايام وايام للسيطرة على شبه جزيرة الفاو . هذه البقعة الصغيرة من ارضك ذات الشعر الكستنائي كلفتهم ٢٥٠ الف قتيل فلماذا كان هذا الجنون ؟!

لا .. لا لم يكن جنونا ايتها الدمشقية فالعدو كان يعرف انه لو احتل مثلث الفاو ثم اتجه غربا الى البصرة لن يهدد العراق في عمقه فحسب ولكنه سيهدد كل دول الخليج فيفصلها عن العراق حيث بعد احتلال البصرة سيكون احتلال الكويت والامارات والبحرين وسواها . مسألة وقت فقط . وسيصبح كما اكد كل المحللين في الغرب الوصول الى قبر نبيك محمد ميسورا .

ياتي السلوك الايراني ليؤكد في ما بعد ظنونك وتحليلات عقول الغربيين الباردة التي تعودت انها لا تخطىء كثيرا . ولعلك تذكرين ويذكر العرب جيدا اليوم طالما ان لديهم الوقت للذكرى بعد ان انتهت هذه الحرب لعلهم يذكرون ان « الايات » بداوا بعد احتلال الفاو بايام بسيطة بتهديد الكويت ثم البحرين ثم بداوا قرصنتهم في الخليج ولم يعد الهدف الاساسي من مجزرة مكة خافيا على احد

وتمنيت للحظات ان تنتحر الفاو وتحرق حتى لا يسيروا على ارضها . فقد علمتك التجربة ان امتك في تاريخها الحديث تخسر كثيرا ولا تكسب وخفت ان تكوني قد خسرت الفاو والى الابد .. في ما بعد بدا لك ظنك خاطئا .. وبدت لك رؤيتك للتاريخ يشوبها بعض التشاؤم . وربما كان ذلك بسبب الانكسارات .. وربما كان بسبب الغربة ايضا .

فانت لا تعيشين على ارضك وبالتالي تبدو بوصلتك معطلة لا تدرك نبضها وعبثا تمسكت بكل معطيات الغرب وديمقراطيته وثقافته لكي تفهمي مستقبل الحرب في وطنك . لكنك لم تفلحي لسبب بسيط هو ان اطمئنان الغرب لا يشعر بقلقك وان الديمقراطية هناك لا تعنيك لانك لم تقاتلي لصنعها لذلك لن تساعدك على فهم ما يبدأ وما ينتهي في وطنك حتى وان ... ما بدأ هو تلك الحرب الصاعقة .

قلقة كنت بعد احتلال الفاو قلقة حتى الجنون اتكات الى ريشتك لكي تكتبي اليهم هناك . كتبت كتبت كثيرا حتى سال اللحم على الخشب .. كنت تكتبين للنساء في المدن . للابطال في الخنادق .. وعندما يدركك التعب تنحنين كالطيور الهاربة وتدخلين محطات القطارات او المطارات الباردة .. او السفن الراحلة بعيدا للبحث عن سر هذه الحرب . زادك عبر رحيلك كان كتبا تحدثت عن هايدغر وهيغل وماركس وموسيقى فاغنر وعندما كنت تنتهين من قراءة هذه الكتب او سماع الموسيقى وتنتقلين الى عالم اخر يبدو السؤال امامك واجبا .. وماذا يعرف هؤلاء

لون الدم .. والابيض لون التاريخ اما الاخضر فقد اغتالوه .. لقد اغتاله البرابرة .

واذا نسيت ، ايتها الدمشقية غدا . كل شيء عن هذه الحرب في محاولة التجاوز نحو المستقبل فاقسمي انك لن تنسي ابد منظر جثث الشهداء من ابناء امتك . من ابناء دمك . الجثث المتروكة تحت الشمس للطيور خلال عامين وعيونها متجهة الى الله بينما تنهش الغربان لحمها .

للاسطورة هذه وجه اخر يعجبك ان ترويه للكتاب العرب الذين جاء بعضهم للمرة الاولى كي يرى اثار الحرب في الفاو . ففي زيارة لك الى معسكر الاسرى الايرانيين رصدت بحياد مطلق كيف يعاملون . كانوا شبابا صغارا لم يبلغ بعضهم سن الرشد يعيشون حياتهم بكرامة تليق بشهامة آسريهم .

وعبر اجهزة التلفزة التي يشاهدونها كل يوم تعلموا لغتك فحدثوك بها .. ثم حكوا لك والدموع تطوف في ماقيهم معنى الخديعة الكبرى التي جعلتهم « ايات الله » يعيشون اطفالا .. ورووا لك كيف قذف بهم الى الخطوط الاولى لتكون اجسادهم وعروقهم البشرية وعواطفهم مجرد آلات انذار بوجود حقول الغلم .. بعضهم طلب اليك ان لا تكتبي اسمه حتى يعد في عداد الموتى لانه يرفض العودة الى وطن طالما يعيش فيه نظام يجرؤ على خديعة طفولته .

نعم جاءوا صغارا اولئك الاسرى بعد ان اوهموهم ان الجنة خلف خطوط النار .. وقضى بعضهم اما من عاش منهم فقد اعطاه وطنك الحق في ان يعيش الاسر بكرامة محافظا على كبريائه الانساني كما تفعل كل الامم العظيمة

لم تكتبي شيئا عن زيارتك للمعسكر في زمن الحرب .. كان ما رايته لا يلخص بالكلمات . كل ما فعلته انك عدت مسرعة لتلقي ساعات امام

نصب الشهيد الذي صممه ، اسماعيل فتاح الترك ، فاودعه كل قدرته على الحياة امام النصب والسماء البغدادية الزرقاء . تذكرت الصورة التي رايتها على شاشات التلفزيون في الغرب .. مشهد الاسرى العراقيين يمرقون في شوارع المدن الايرانية وسط الهتافات والجنون الجماعي .

وكم حز في قلبك حتى الجرح محاولة ، الايات ، جعل هذه الحرب لا حرب سجال او مصالح ، او نصر او هزيمة ، بل شهادة نعي لكل ما يسمونه بالتعايش الحضاري بين البشر تماما كما فعل سلفهم ، الطيب الذكر ، هتلر . لقد حاول شعب العراق وقيادته ان يقاوموا ذلك بوعي ، وهم يعرفون جيدا ان التاريخ عندما سيؤرخ لهذه الحرب سوف يسجل ان البصرة ، والفاو ، والمدن الشمالية كانت مسرحا للبربرية الايرانية ، وسياتي ذكرها مثل ذكر عمورية ، وهيروشيما ، لكن التاريخ سيخط ايضا بسطور واضحة تصميم العراقيين على ان يعيشوا من اجل كرامتهم ، وارضهم ، وتاريخهم وتصميمهم على ان يعيشوا عملية مقاومة جماعية ليست ، ماسادا ، او انتحارا عبثيا فالمعادلة غاية في الوضوح تقول : ، اما حياة كريمة او موت مشرف ، .

لم يفكر شعب العراق بـ ، ماسادا ، لانه لا يعشق الانتحار .. لا .. لان على ارضه عاشت اعرق الحضارات التي ابدعت للاجيال في ما بعد معنى الحياة ، ومن حمورابي حتى هارون الرشيد .. حتى اليوم ما تزال

ارض الرافدين تبدع افضل القوانين التي تنظم حياة الانسان .. بل تكتب اجمل قصائد الحب للعيون البعيدة والقلوب التي ادماها الحنين . وفي ظل كل نخلة من نخيل العراق انشد شاعر .. وفي كل بيت من بيوته عاش الجاحظ والفارابي وابو حيان التوحيدي . فكيف اذاً نخطيء الارض او الانسان ما ابدعته هذه الارض وهي على ذلك القدر الهائل من الحضارة والتسامح والعطاء ووعي ابعاد الحياة لنظن بان العراق يفكر يوما ما بانتحار جماعي ، لا لم تكن مقاومة العراق انتحارا جماعيا بل كانت التصميم على الحياة والقول اما حياة كريمة او موت

عن ذلك الوطن البعيد ؟ ماذا يعرفون عن الذين يموتون كل يوم ؟

تركضين الى خرائط الوطن مع بداية كل ليلة لكانك خائفة ان يضبطك احد متلبسة بجريمة حب الوطن والقلق على مصيره والبحث في خرائطه .. تتاملين الخرائط ترين شبه الجزيرة اخر نقطة مضيئة في تاريخك العربي اخر نقطة في تخومك العربية ولكنها بالتاكيد النقطة التي ستقرر لا مصير العراق ، كما اعتقد البعض او كما اعتقد بعض السذج ، حسب ولكن مصير مستقبل هذه الامة .. عندما فكرت بتسجيل ملاحظاتك اليومية حتى لا تنسي شرع رجال الامن في المطارات قانونا يقضي بمنع المسافرين من حمل المذكرات او الخرائط ، ولكن الفاو كانت تزورك وتزورينها عبر الحلم ولم تستاذن لا رجال المطارات ولا الامن ولا حواجز المسافرين . كانت تاتيك وقد وجدتما الوسيلة كي تسجلا معا مذكراتها اليومية . ولعل اكثر ما ادماك في صفحات تلك المذكرات هو اليوم الذي اضطر فيه الجنود العراقيون الى التراجع قبل ان ينتهوا من دفن بعض شهدائهم فظلت اجساد اولئك الشهداء تحت شمس الفاو الحارقة بينما ظل الغزاة عامين ياكلون ويشربون وينامون وهم يَتشفون بمنظرها من دون ان يفكروا بدفنها .. نعم تقول الفاو ذلك في مذكراتها وتؤكد لك بان عيون الشهداء ظلت مفتوحة بحدة على السماء تطلب ان يعيد الله الامور الى نصابها وان تعود الفاو الى اهلها .

تتساءلين بدهشة والم : كيف يتعايش الانسان مهما بلغت درجة حقده مع جثة .. كيف ؟ لكان اولئك لم يقراوا ولم يعيشوا شيئاً من الدين الذي يقاتلوننا باسمه ؟ وبعيدا عن الدين وقيم البشرية الا يعرفون ان الارض تتسع لكل شيء .. لكل شيء حتى للحقد وللجريمة .. فلماذا لم يحاولوا اخفاء جريمتهم او حقدهم ؟

والسؤال يصير اسئلة ، واسئلة لديك .. والمشهد الفاجع على تلال الفاو وفوق ترابها الحار دفعا بالذي رد لك الثقة بنفسك وصالحك مع تاريخك من غير ان تتعارفا الى التساؤل بصوت حزين واثق من نفسه بعد ان حقق النصر .

•

- نعم كيف قبلوا ان يتعايشوا مع جثة ؟

ولماذا هذا الحقد كله ؟

ومنذ متى كان الايرانيون يكرهوننا الى هذه الدرجة ويحقدون

علينا ؟

اثار اسئلته ولم يتركها في الهواء بل اكد انه لا بد من معرفة افضل بالعدو بدءا من هذا اليوم .

ان حالة الفاو تطرح اسئلة كثيرة تتعلق بالتاريخ المشترك بين امتك واعدائها على الطرف الاخر . ولكان الدين الذي حمله اليهم اجدادك بكل عظمته وقيمه لم يخترق قلوبهم .. بل استبدلوه عبر التاريخ بنار الحقد والسنة اللهب .

تروين ذلك للصديق الذي استغرب سجودك فوق رمال الفاو وتقولين له ببديهية علمتك اياها سنوات هذه الحرب بجنونها ولا معقوليتها ، من لم يعرف الفاو فهو لم يطا الكوكب الارضي ، فمن ذلك الطين .. من ذلك السكون الذي يشملكم خرج التاريخ بدروسه التي لا تنسى .. دروس تدفع بك اليوم الى الغضب والتامل لا الى الحقد ، فلاجدادك الاوائل عندما وصلوا السند شرقا ، والاندلس غربا لم يقطعوا شجرة ولم يقتلوا طفلا .. لم يهينوا امراة .. وكانوا اشد رافة بالشيوخ من اعدائهم اكثر مما هم رافة بانفسهم . نعم .. هذا هو تاريخك الذي



استحقوا بسببه ان يقال عنهم في ما بعد لم يعرف التاريخ امة فاتحة ارحم من العرب .

تروين ذلك لصديقك بينما رائحة الفاو تعبر انفك .. تتغلغل في

جسدك حتى مسارب الروح . وبينما بدا النخيل المحروق امامك ينبثق كما انبثاق الفجر .. كل شجرة منه انتحت مكانا قصيا مبتعدة عن نظيراتها .. كل شجرة منه تميس فوق الارض المترعه بالذكريات . تظلل حشائش وزهورا برية تتراقص بين الماء والنور بالوانها حيث الاحمر مشرف .

هذه شبه جزيرة الفاو تهز روحك من اجل جذورها فتوقفك في راسك الاسئلة بعد ان سمعت قبل مجيئك اليها شهادات الكتاب المقاتلين في ندوة ادب الحرب . كان كل كاتب رواية كما هي كل امراة عراقية منحمة وكل رجل عاش هذه الحرب قصة .

كانت الشهادات التي سمعتها وتفاصيل الحرب تطاردك باسئلة كثيرة .. اسئلة كثيرة لعل اهمها السؤال الذي ظل يتردد في راسك طويلا وهو : كيف استطاع العراق ان يوازن بين معركتين .. معركة قتال العدو والدفاع عن الارض في اقسى حرب عرفها التاريخ ، وبين معركة استمرار الحياة والبناء والعطاء ؟

بعد سبع سنوات من الحرب لم تصدقي يوم جئت بغداد للمرة الاولى يوم عدت اليها من غيابك الذي طال اكثر مما يجب لم تصدقي انك تسيرين في شوارع مدينة حرب .. فحداثة رائعة غيرت معالم المدينة لتبقي على ما هو اصيل فيها وعندما وقفت برفقة ذلك الصديق الشاعر تحت نوافذ بغداد العتيقة كان فرح عظيم يسكنك لرؤية الحياة تتابع مجراها .. فنخيل بغداد كان يزداد في ظل الحرب كل يوم نخلة .. ومطابعها ودور نشرها كانت تزودك كل يوم بعشرات الكتب والاسماء بينما الحرب تتابع مجراها ، وفي كل عام كان مئات الشعراء العرب ياتون الى بغداد لينشدوا في قاعة الرشيد وخارجها على شواطىء دجلة اغاني حب لاجل العراق ولاجل الحياة الاقوى من الحرب .

وفي مهرجان بابل مشيت بتؤدة تبحثين عن اثر رجل اضعته منذ حمورابي ولم يعد اليك .. انت كلكامش الراحل ابدا نحو حقول الياسمين . كلكامش الراحل باستمرار نحو حقول الياسمين منذ بداية التاريخ .. اما في مهرجانات الفن التشكيلي فقد بدت لك الالوان العراقية وكانها تقاوم الموت وتبشر بالحياة لقد بشر الرسامون العراقيون بالحياة خلال ثماني سنوات عبر لوحاتهم .. نعم اثناء الحرب نجح العراقيون في ان يحولوا مدينتهم الى عاصمة الثقافة العربية .

وفي زحمة الكلمات العابرة انتظرت قليلا لكي ياتي الوقت الذي تحيي فيه اولئك الذين قادوا العراق الى نصره عسكريا وتحني راسك امامهم . اعترافا بالجميل ولكنك بعد ذلك تلتفتين لتحني راسك اجلالا للرجال وللنساء الذين صمموا ان يقودوا في الداخل مسيرة العراق الحضارية حتى يظل الداخل عمقا حقيقيا للجبهة وللتاريخ .

نعم هؤلاء وبعضهم اخوة لك على مدى السنين ظلوا يدفنون شهداءهم بصمت .. ببكاء حزين . ثم يرتدون ثياب المعركة ويمضون لمتابعة مسيرة حياتهم . وفي زمن الحرب كما كان عليه الحال في زمن السلم ظل العراق وطن الشعر والرسم ، في الوقت الذي اعطى به المسؤولون عن الثقافة لتاريخهم ابعاده الحقيقية فصالحوا بين من كان يظنه البعض متعارضا . من حمورابي حتى اي مقاتل على الجبهة رايت حضارة القطر العراقي نهرا هادرا يصب في قلب حضارة هذه الامة .

لقد اخذ بعض الذين لايعرفون كيف يعيشون اللحظات الحاسمة في تاريخ الامم على بغداد اجمل مقاتلات التاريخ جمالها . وتساءلوا : كيف يحق لها ان تسير هكذا على شواطىء دجلة بحللها زينتها في زمن الحرب ؟

اما الاغبياء فذهبوا ابعد ليقولوا : كيف يحق لها ان تطعم الاف الشعراء والرسامين والكتاب والصحفيين ... و...و..... بينما كانت

الفاو محتلة والبصرة مهددة والجبهات مشتعلة والرجال يتزوجون في المساء ليرحلوا في الصباح الى الحرب كيف ؟ هل هذا ضرب من كبرياء زائف وعناد لامعنى له ؟

لقد نسي هؤلاء وهم يكررون الاسئلة حتى ضنق النخيل بها ان المعركة مع عدو لا ينتمي الى كل ما هو متعارف عليه في الحضارة



الانسانية ليست مجرد سجال عسكري يسجل العراق فيه نصر هنا او هزيمة هناك . لا لقد كانت الحرب العراقية الايرانية - وارجو ان تقراوا ماسجله هنا جيدا ثم تفكروا به مستقبلا - حربا حضاريا عمقها يكمن في السؤال الابدي ما معنى الحياة ؟ وما معنى الموت ؟ ولماذا الموت ؟ ...وما معنى العطاء الذي يشكل اضافة نوعية للحضارة الانسانية لاسيما على الطرف الاخر من المشهد كانت ثمة جاهلية تسود بجنونها .

نعم لقد لبست بابل في الحرب اجمل حللها بينما كان الدمع في العيون واستقبلت بغداد ضيوفها مشرقة الوجه والحرقة في القلوب .. انحرقة المرة لاميرة النهر الابدية التي حاول العدوان يسلبها اساورها وعقدها وخواتمها وتاج راسها وشرائط شعرها

اما البصرة والتي ستبقى دائما اغنية عشق في تاريخك فقد صمدت وقاتلت لكنها في كل عام وهي تنتظر زيارة الشعراء كانت تتحول الى سفينة لم ينجح ابدا القراصنة في مطاردتها بنغمة الجهل حيث ظلت قصيدة حب لايقايض عليها ... شمسا لايمكن لمخلوق ان يطال خاصرتها لانها تعرف كيف تسمو فوق ايديهم .

وعبر هذه المعادلة .. معادلة القتال والحياة والموت استطاعت مدن العراق ان تصمد وان يتحول كل عراقي في اي موقع كان الى مقاتل ، بينما يبقى دجلة رغم الاهوال يجري في بغداد صافيا كدموع المجدلية .

اذاً الف سلام عليكم ايها الابطال المقاتلون في الجبهات متحدين كل اسلحة الدمار .. ولكن الف تحية للرجال وللنساء الذين منعوا الشمس ان تغرق بشكل نهائي في مياه شط العرب . وظلوا من مواقعهم يسندون ظهور المقاتلين مسجلين كل يوم اضافة لتاريخهم ثم يكتبون مذكراتهم بصمت لا من موقع راحة الضمير او التكفير عن الخطأ ولكن بهدف ان يتركوا لمن ياتي بعدهم تجربة يقراونها جيدا فتساعدهم على الاستمرار .

هل كان خطأ ان يصر العراق على الاحتفاظ بجماله في زمن الحرب ؟ ان يضحك والحرقة في القلب ؟ ان يعيش ليمنع العدو من قص شريان الحياة في جسده ؟

لا ... لا والف لا .. وتعود بك الذكريات من رحلتك فتنظرين حولك لترى الفاو والكتاب العرب الذين يزورونها .. تنظرين الى شط العرب الى النخيل المحترق .. الى الشمس المائلة للمغيب ... ومن موقعك هذا تلتفتين الى الغرب فتصل عيناك حتى نواكشوط على المحيط الاطلسي وما بين الدول والدول العربية تصادفك خطوط حدود وهمية لا تليق بدم الشهداء العراقيين الذين سقطوا هنا على هذه الارض كي يحافظوا على هوية تلك الارض الشاسعة

، هنا في الفاو توحدت امتك ، وبعد غد ستبدأين انت السورية الدمشقية ببناء بيت لك هنا على ضفاف شط العرب . ثم ياتي بعدك من يبني بيتا اخر ثم ياتي من يبني بيتا اخر واخر واخر فتولد من جديد مدينة تكون رمزا لروابط الدم والمصير . ومن شرفة ذلك البيت الدمشقي الذي ستبنيه سوف تطلين على الوطن العربي كله ببحاره وانهاره بصحرائه وغاباته .. بأناشيده الوطنية واعلامه المرفوعة ... بسفاراته وتمثيله الدبلوماسي ستقولين له كفى خلافا كفى خوفا فما من سنبلة في التاريخ الا وعليها نقطة دم عربية .

دعوني اذاً ابني لي بيتا في الفاو
دعوني ازرع حديقته بالحنة
دعوني اصرخ بملء صوتي لتفهموا جميعا
لماذا عليكم ان تتطهروا وتصلوا قبل دخولكم الى الفاو .

# حينما يصلب الشعر

شعر : محمد امين پينجوينى

●

ترجمه بتصرف

رؤوف عثمان

●

يا بنيامين.. بشرتك سوداء
قاتمة
لكنّ روحك بيضاء
ناصعة
قصائدك غابة من لهيب
ماضية حد السهام
الراسية
ياذا اللون الفحميّ...
ما الذنبُ إلاّ سوادُ بشرتك
وعشق التراب والأنسان؟!
والبحث عبر دمك القانى
عن المساواة بين الأنام
هذه خاتمتُك لدىٰ
انظمة القهر والسلب
وعبّاد الدولار والمال والذهب
يا أيُها العبد المعنّىٰ الأسود
حينما صلبوك
المنصفون غاظوا
والأذاعات ذرفت دموعا
والناس ... ثاروا
والتأريخ هتف مِلءَ الحنجرة
أنىٰ لـ (بنيامين) الموت؟
فالشاعرمُلاك وزهرة
رسالةٌ وثورة
يا أيُها العبدُ الأسود....
كيفَ تُذنَبُ بدجية لونِك

وبياض قلبك؟!

انا مثلك.....

اهوى الشعر والجمال

أعشقُ الارض والانسان

أغنّي للحرية في كل زمان ومكان

لكنْ ... آه...

فحينما أُشنقُ وأُصلبُ وأُقتل

هذا العالم بأنامه وبلدانه

يصمتُ صمتَ أبي الهول

كمن في اذنه نُحاس ووقر

ورائحةُ النفط تُفقده الاحساس

بالصوت والنُواح والموت

ظلّتْ السنةُ كلُّ الانام

اصدقاءً واعداءً

محبوسةً خرساء بكماء

وجهانا حنطي واسود

لا تُقصِرُ الالوانُ ببساطة

وانا ...كي أصبح فحميًا مثلك

يلتف حول عنقي حبلك

يا بنيامين ...

لنبك بجوارحنا معاً

أنت لسواد لونك

وانا لقلبي الساذج الابيض

لنعانقَ في بُكائنا

لِنحتسي في أكؤسِ النضال

من خمرِ ادمعنا

دراسة نقدية : حول ترجمة اسطورة
مم الآلاني الى العربية

# مسكين ... مم الآلاني !!

عبدالرحمن عبدالقادر




وانا اقرا في اسطورة «مم الآلاني» المترجمة من اللغة الكردية الى اللغة العربية، كنت احاول جاهداً ان اجمع شتات افكاري كي اطبق على تلك الصورة الشفافة والرائعة التي اختزنها في مخيلتي، للصبي «مم» ولحبيبته الصغيرة «زين» ولكن جهودي كلها باءت بالفشل ازاء الاضطراب الذي كان يعصف بالنص وينسف كل محاولات الترميم!

... اقول وانا اقرا تلك الترجمة التي تدعو الى الاسى والاحباط معاً، تذكرت كتاب «هل ينبغي إحراق كافكا» للكاتبة «بديعة امين» وتساءلت ياترى هل عانى مترجم «مم الآلاني» مما عانت منه «بديعة امين» عندما خرج كتابها ذاك الى الحياة من مطابع بيروت، مشوهاً ممسوخاً.. يحفل بالاخطاء، لقد صورت «بديعة امين» معاناتها باسى في مقدمة الطبعة الجديدة من الكتاب، حيث قالت:

[كانت الغربة بيني وبين الكتاب كاملة، والصدمة عنيفة مؤلمة لشدة ما الحقته الاخطاء المطبعية وغير المطبعية من تشويه صاعق بالكتاب... لقد تجاوز التشويه حدود الاحتمال او القبول... فـ «الرمز» صار «أرمز» وشاعت «القلعة» ان تتحول من حال الى حال فإذا بها تنقلب «فلسفة» و «الأمان» حل محله «الزمان» أما «خطمهم» فغدت «خصمهم» وتحولت «الانقطاعات» الى ماليس للغويين وغير اللغويين به علم، إذ اصبحت، دون زيادة أو نقصان «انفطاط»!! وليت الامر توقف على استحالات الكلم لكن المصائب كطيور السنونو كما يقول الفرنسيون، لاتأتي فرادى «فالحق» بفضل «قفزة» مطبعية صار «باطلاً»

... وتسترسل «أمين» في مرثيتها فتقول:

وعلى غير وعي مني القيت ارضاً بالكتاب الذي كنت انتظر ان يحمل لي فرحة ميلاد جديد، وانتابني وجوم كلي كذاك الذي يلف بصمته الحزين اماً تضع وليداً مشوهاً بعد انتظار وعناء تسعة شهور... ولكن ما العمل؟ أو يسعني ان افعل شيئاً؟... التصحيح مستحيل، إضافة جدول بالخطأ

والصواب! ممكن لكن الأوان قدفات.. فقد شرع بتوزيع الكتاب! وإذن لم يبق ثمة خيار، غير وقف عملية التوزيع وإتلاف مالم يوزع.
كان النصل حاداً موجعاً، ولكن... كان لابد من ان ابتلع النصل بكل العلقم الذي فيه.. كان لابد من احراق ـ كافكا ـ
وجلست امام الرماد، ارقب العنقاء من جديد]
... لاشك ان في [هل ينبغي إحراق كافكا] كانت «بديعة امين» هي المستهدفة الاولى والمباشرة، أما في «مم الآلاني» فاظن ان بطل الاسطورة «مم» وحبيبته «زين» هما الضحيتان الوحيدتان، فلقد تشوهت صورتهما وتخدشت ملامحهما الغضة، لدى قراء العربية[1]، من خلال تلك الترجمة التجريبية، المتسرعة، المضطربة والتي يبدو ان المترجم، الدكتور عزالدين مصطفى رسول كان يتوقع لها كل هذا الهزال، بدليل انه يتكهن بذلك في مقدمته حيث يقول:
[... عرفت بعد انجازي للترجمة أن هناك ترجمة أخرى للنص، وإننا «قد» نخوض سباقاً من حيث الاسراع في إخراج احد النصين للنور[2]] ثم يضيف الدكتور عزالدين، فيقول:
[... فإن امام القارئ ترجمتين «قد» تتميز كل واحدة منها بخاصية معينة من حيث القوة والمآخذ، و«قد» يكون ذلك درساً في حقل الترجمة، وشافعي في هذا الاعتقاد، انني قد درست مادة الترجمة عدة سنوات لطلابي بكلية الآداب في جامعة بغداد]
ثم يختتم الدكتور مقدمته قائلاً [.. شكراً لاخي وصديقي الاستاذ شكور مصطفى فلقد كان دوره في اعداد هذه الترجمة اكثر من مراجع، وبذل جهوداً مضنية لاخراجها، وشكراً للاخ الودود الاستاذ محمد الملا عبدالكريم فقد تحمل أعباء الطباعة واللمسات الاخيرة من تقديم النص في ظروف اجبرتني ضرورات الحياة الى ترك مسكني في بغداد الى مسقط رأسي وموطن اهلي مدينة السليمانية، فتركت مسودة النص وابتعدت عن المطابع، فله وللاخ شكور، شكري وشكر الجميع].
إذن فالدكتور عزالدين يعترف بأنه [قد خاض سباقاً من حيث الاسراع في اخراج الكتاب] وبأن ترجمته [قد تكون درساً في حقل الترجمة] ثم يسوق اخيراً، بعض المبررات فيقول [فتركت مسودة النص وابتعدت عن المطابع] إلا أن هذا كله لايمنعنا من أن نتساءل، مادخل المسكينة «زين» في كل هذا، وماذنب المعذب «مَمْ» ان يولد في مناخات كهذه، ووسط كل هذه الملابسات، ليعيش كسيحاً، ممسوخاً بين اقرانه، ابطال كل اساطير وملاحم العالم! يقول المترجم على الغلاف الاخير للكتاب.
[ممى آلان قصة خالدة أخذت موقعها بجدارة بين التراجيديات العالمية، وماوردتا «مم وزين» إلا وردتين في بستان الحب الابدي والعشق الانساني، تصارعان الشوك مادام على الارض عذال واشواك].
إذن فإن ملحمة «مم الآلاني» تقف شامخة بين كلا سيكيات العالم، بعد ان ترجمت الى العديد من اللغات الاجنبية كالفرنسية والالمانية وغيرها من اللغات، وهاهي الآن تترجم الى العربية، ولكن يبدو ان «عذال» «مم» لازالوا له بالمرصاد حتى بعد مماته، ولكي نؤكد بأننا لسنا مبالغين في احكامنا هذه، تعالوا لنسوح معاً بين دفتي ـ الترجمة ـ علنا نفيد، أو نستفيد. وابتداءً لابد من الاشارة الى ان رحلتنا مع الكتاب ستطول، لكنها ستكون، حتماً.. شيقة ومفيدة.

لنتجاوز الغلاف الرئيسي الى الغلاف الداخلي حيث نقرأ وبحروف كبيرة [مَمى آلان] ملحمة فولكلورية كردية... قام بالترجمة الدكتور عزالدين مصطفى رسول [أستاذ] عن النص الذي اعده الدكتور «نورالدين زازا] مع مقدمة منه.... راجعها شكور مصطفى.

هذا مامكتوب على الغلاف الداخلي، ولكن ولكي اكون ـ اميناً ـ فقبل ان انتقل بكم الى الصفحة التالية، لابد من التذكير بخطأ طفيف ورد في العنوان، والخطأ هو في كلمة [ممى]... فبعد ان قرأناها على الغلاف الاول ممي] بالياء، نراها هنا تنتهي بالالف المقصورة، اي انها على وزن [ضحى، سهى، لمى] بينماكان من المفروض ان يكتب الاسم «مم» كما هو في ـ الاصل ـ بعيداً عن اشكالات الياء والالف المقصورة التي تعرض لها «مم» مراراً وتكراراً على الصفحات الداخلية للكتاب.

ثم ان اللقب «آلان» لابد وفي كل الاحوال[3] ـ عند الترجمة او بالاحرى الكتابة ـ العربية ـ لابد ان يبدأ بـ «ال» التعريف وينتهي بـ «ياء» النسب، مهما تضاربت الآراء في اصل وفصل كلمة «آلان»... بعد الغلاف، وقبل الولوج في متاهات الترجمة ومطباتها، تعترضنا كلمة المترجم، ولابأس من ان نقطتف منها بعض الفقرات التي قد تفيدنا في رحلتنا، لاحقاً!

في احدى فقرات مقدمة المترجم نقرأ [... أعود الى هذه الطبعة وقد اضطرني اختيار دار الثقافة والنشر الكردية لها، الى ترجمتها هي دون غيرها، وقد اختارت هذه الدار قصة «ممى آلان» لتترجم الى العربية، ثم اختارت من بين طبعات النص، طبعة المجمع العلمي الكردي لتكون اساساً للترجمة، ورغم التزامي عموماً بما اوجبته الدار، فقد وجدت نفسي ملزماً بالرجوع الى طبعة دمشق ـ اي طبعة زازا ـ وطبعة بيروت ـ طبعة ليسكو. ايضاً، ويظهر كل هذا في الهوامش العديدة التي نراها في مواضع على النص المترجم.] ويضيف الدكتور [اما طبعة المجمع العلمي الكردي هذه فهي اعادة لطبعة دمشق بعد نقل النص المدون من الاحرف اللاتينية الى الاحرف العربية التي تستخدم في الكتابة والطباعة في كردستان العراق]

